دوکتۆر مارف خەزنەدار

# مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

بەرگی دووەم

سەدەکانی چواردەم ـ هەژدەم



# مێژووی ئەدەبی کوردی



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی



زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان:
دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر
س. پ. ژمارە: ١
www.araspublisher.com

# مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

**بەرگی دووەم**

سەدەکانی چواردەم – هەژدەم

**دوکتۆر مارف خەزنەدار**



کتێب: مێژووی ئەدەبی کوردی – بەرگی دووەم
دانانی: د. مارف خەزنەدار
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ١٤٣
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی بەرگ: شکار شێخ عەفان نەقشبەندی
نووسینی بەرگ: خۆشنووس محەمەد زادە
پیت لێدان: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمان مەحموود
چاپی یەکەم – چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر– ٢٠٠٢
تیرێژ: ١٦٠٠ دانە

لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٢٠٧)ی ساڵی ٢٠٠٢ی دراوەتێ

# پێشەکی

بەشی هەرە زۆری ناوەرۆکی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە کە دەکاتە دە فەسڵ زانیاریی گشتییە بۆ هەموو قۆناغەکانی ئەدەبی کوردی لە سەرەتاوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، واتە پێشەکیی گشتییە بۆ هەموو بەرگەکان لە یەکەمەوە تا بەرگی دوایی.

شیعری ئایینی یارسان (ئەهلی هەق) لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا حەوت سەدەی خایاندووە. لە سەدەی دەیەمەوە تا سەدەی شازدەم، کەچی بەپێی مێژووی ئەدەبی کوردی لە ڕووی کرۆنۆلۆجییەوە تەنیا باباتاهیر (سەدەی دەیەم) لەو بەرگەدا باسی لێوە کراوە. لەبەر ئەوە شاعیرانی پاش باباتاهیر ئەوانەی کەوتوونەتە دەرەوەی یارسان لەناو ئەم بەرگی دووەمە باسیان لێوە دەکرێ. بەم پێیە ئەم بەرگە لە سەدەی چواردەمەوە دەست پێدەکا تا کۆتایی سەدەی هەژدەم.

هەر کەسێکی مێژووی ئەدەبی نەتەوەییێکی دیاریکراو بنووسێتەوە، ناوەرۆکی کتێبەکە ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕ و بۆچوون و فیکری خاوەنەکەی دەبێ. زیاد لەسەر ئەوەی ئەو ڕێباز و شێوازەی لێرەدا بەکارم هێناوە تایبەتییە بەخۆم و پێویستە هەر واش بێ. مەبەستم لە نووسینەوەی ئەم مێژووە ئەوەیە ببێتە سەرچاوەیێکی قوتابخانەیی و زانستگایی و ئەکادیمییانە و فەرهەنگییانە و ئەنسیکلوپیدیانە، بۆیە تەنیا لایەنە ڕاستییەکانی لەبارەی شیعر و شاعیرەوە گرتۆتە خۆ، هەر بیروڕاییێکی سەرچاوەی ئەم بابەتە ئەگەر بەڕاستمان نەزانیبێ پیشانمان نەداوە، چونکە مەبەستی ئێمە ڕەخنەی ئەدەبی و بەراوردکاری نییە، بەڵکو مێژووی ئەدەبە.

نموونە ئەدەبییەکانی بۆ بەڵگە لەم کتێبەدا تۆمارکراون ئەگەر گیروگرفتێکی زۆریان تێدا نەبووبێ هەوڵ نەدراوە لێک بدرێنەوە، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر هەندێ قورسییان تێدا بووبێ و خوێنەری ئاسایی لێیان تێنەگا هەوڵدراوە لەژێر ناوی «واتاکەی» دێڕ بەدێڕ لێک بدرێنەوە.

لەم کتێبەدا ڕەچاوی دوولایەنی گرنگ کراوە بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەب:

١- ئەو بەڵگانە لە تێکستی شیعر بەنموونە هێنراونەتەوە، لە ئەنجامی بەراورد لە نێوان دەسنووس و شیعری چاپ کراوەوە هەڵبژێردراون. باس لە کارەکە نەکراوە وەک کردەوەیێکی لێکۆڵینەوەی زانستی بەڵکو ئەو تێکستە هەڵبژێرراوە کە لە ئەنجامی بەراوردەکە کەوتۆتە دەستمان. جگە لەمە بەزۆری تەواوی شیعرەکە بڵاوکراوەتەوە، چونکە مەبەس لەم کتێبەدا ئەوەیە تا پلەیێک ببێتە ئەلبوومی هەڵبژاردە یا گوڵبژێری شیعری کوردی لە هەموو قۆناغەکانی ئەدەبدا، بێگومان مێژووی ئەدەب ئەم جۆرە بەرنامەیەی گەرەکە.

٢- خاوەنی ئەم کتێبە هەوڵی داوە بەزۆری خۆی قسە بکا، قسەکەش تەنیا پێوەندی بەنموونە ئەدەبییەکانەوە هەیە، لە ئەنجامدا ئەم کتێبە دەبێتە سەرچاوەی زانیارییێکی قوتابخانەیی بیروباوەڕی خاوەنەکەی ڕەنگی تێدا دەداتەوە، لەبەر ئەوەیە لە مەیدانی ڕۆشنبیری هەموو نەتەوەیێکدا زیاتر لە



یەک «مێژووی ئەدەب» دەکەوێتە ناوەوە.

ساغکردنەوەی سەردەمی لەدایکبوون و مردنی شاعیران و کەسانی تر بەکۆششێکی زانستیی زۆر گەیشتە ئەنجام. وا بەباش نەزانرا ئەم کردەوەیە بەدوور و درێژی بخرێتە بەرچاوی خوێنەر و لاپەڕەیێکی زۆری بۆ تەرخان بکرێ و باس لەوە بکرێ چۆن ئەم ساڵانە دۆزرانەوە، بەڵکو ڕاستییەکەی ئەوەبوو تەنیا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە بکەوێتە بەرچاو.

ناوی کەسان و جێگەی جوگرافی و زاراوەی زۆری زانستییە کۆمەڵایەتییەکان لەم کتێبەدا هاتووە، ڕەنگە هەندێ جار پێویستییان بەڕوونکردنەوە هەبێ، کەچی ئەمە نەکراوە، بۆ ئەوەی خوێنەر خۆی خەریکی تێگەیشتنی ئەو لایەنە قورسانە بکا، بەهۆی فەرهەنگ و ئەنسیکلۆپیدیا جیاوازەکانەوە، دیارە ئەمەش لایەنێکی دیکەیە لە بەرنامەی زانستیدا و پرۆگرامێکی بەکەڵکە بۆ ئەو کەسانەی خەریکی باسی زانستین لە هەموو گۆڕەپانەکانی زانستییە کۆمەڵایەتییەکاندا بەتایبەتی زانستیی ئەدەب، بەمە ئاسۆی بیریان فراوانتر دەکەن.

لەم کتێبەدا هەندێ وشە و زاراوەی زمانانی بێگانە لەڕووی ڕاست نووسینەوە بەچەند شێوەیێک نووسراون، بۆ بەڵگە وەکو «عیشق = عەشق = عشق»، ئەمانە هەموویان بەڕاست دەژمێردرێن، چونکە لە دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی بەم جۆرە هاتوون، بەتایبەتی لە شیعردا.

ئەم کتێبە بەرگی دووەمی «مێژووی ئەدەبی کوردی»یە، پێنج سەدە دەور دەکاتەوە، لە سەدەی چواردەمەوە تا کۆتایی سەدەی هەژدەم، هیوادارم کەڵکی هەبێ بۆ خوێنەر و ڕۆشنبیر و خوێندەواری کورد.

هەولێر: مەڵبەندی ڕووناکی

*مارف خەزنەدار*

# بەشی یەکەم

# ژیانی سیاسی کوردستان و ناوچەی جوگرافی گۆرانەکان

## ژیانی سیاسی کورد لە سەدەکانی چواردەم تا هەژدەم

تا سەدەی چواردەمی مەسیحی دەسەڵاتێکی بێگانەی ڕاستەوخۆ لە خاکی کوردەواریدا نەبوو، چونکە ناوچە جوگرافییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامەوە سەر بەکارگێڕی عەرەب بوون تا ڕووخانی دەوڵەتی عەباسی. لە دوای عەباسییەکان دەسەڵات و فەرمانڕەوایی هۆز و عەشیرەت و بنەماڵە و میللەتە تورک زمانەکان هاتنە ناوەوە.

لەو ڕۆژگارەدا دەسەڵات لەدەست ئێلخانییەکاندا بوو، بەڵام تورکمانەکانی ڕۆژئاوای ئاسیای ناوەڕاست خۆیان خۆش کردبوو وڵاتیان داگیر بکەن لەپاش کزبوونی دەسەڵاتی مەغۆڵەکان.

بنەماڵەی ئێلخانی (١٣٣٦ - ١٤١١)، لە سەدەیێک کەمتر لەم هەرێمانەدا فەرمانڕەوا بوون. قەرەقۆینلووە تورکمانەکان هەوڵیان دەدا ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان داگیر بکەن، لە ئەنجامی لەناوبردنی دەسەڵاتی ئێلخانییەکان میللەتی کورد تووشی شەڕوشۆڕ و کوشتن و بڕین و تاڵان و ئاوارەیی و ئەشکەنجەیێکی زۆر بوو.

هەر لەو سەردەمەدا بوو تەیموری لەنگ (١٣٣٥ - ١٤٠٥) لە ساڵانی ١٣٨٦ - ١٣٨٨دا هەندێ لەناوچەکانی خوارووی قەفقاس و کوردستان و لوڕستانی داگیرکرد، لە کوردستان دیاربەکر و جزیرەی گرت، گەمارووی وڵاتی میری هەکاری دا لە قەڵای وان. لە پاشانا ڕووی کردە بەغدا، ئینجا لە ڕێگەی مووسڵەوە گەڕایەوە کوردستان، سەرکردەی میرنشینەکانی هەولێر و جزیرە و حوسنکێف و ماردین و مووسڵ چوونە لای تەیموری لەنگ، سەریان بۆ دانواند لە پێناوی ئەوەی وڵاتەکانیان زیاتر وێران نەبن و زیانیان لێ نەکەوێ.

لە دوای مردنی تەیموری لەنگ، قەرەیووسفی سەرداری قەرەقۆینلوو کە لە تەیموری لەنگ ڕای کردبوو و پەنای بۆ میر شەمسەدینی بدلیسی لە کوردستان بردبوو، لای کورد داڵدەیێکی باشی دۆزیبووەوە، میری بدلیسی گەلێ ڕێزی لێنا و کچی خۆی دایە و یارمەتییێکی زۆری دا کە حکوومەتێک دروست بکا، لە دوای سەرکەوتنی لەم کۆششانەیدا قەرەیووسف لە ساڵی ١٤١٧م بەڕەسمی دانی بەمیرنشینی بدلیس نا.

لەم ماوەیەدا لە دوای نەمانی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی و کۆتایی هاتن بەفەرمانڕەوایی عەباسییەکان و پەیدابوونی دەسەڵاتی تورکمان و فارس لەسەر شانۆی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کورد هەندێ سوود و قازانجی پێگەیشت زیاتریش لەلاییێک کەڵکی لە ناخۆشی نێوان تورک و عەجەم وەرگرت، لەلاییێکی ترەوە ناخۆشی نێوان بنەماڵەکانی تورک و عەجەم هەریەکەیان بەتەنیا و لەناو خۆیاندا بووە هۆی ئەوەی



میرنشینی سەربەخۆ لە هەرێمە جیاوازەکانی کوردستان پەیدا ببێ.

ئوزون حەسەن (حەسەنی درێژ)ی دامەزرێنەری فەرمانڕەوایی ئاق قۆینلوو سیاسەتی کورد بەکورد دادانی بەکاردەهێنا لە کوردستانی سەروودا، لە ئەنجامدا وابوو لە ساڵی ١٤٧٠ هەموویان لەناوچوون، پێوەندی دەرەبەگایەتی لە کۆمەڵی کوردەواریدا هۆیێکی گرنگ بوو گیانی بنەماڵەیی و عەشیرەتگەری زاڵ بێ بەسەر گیانی نەتەوایەتی لەو ڕۆژگارە دێرینانەی مێژوودا.

پەیدابوونی دەوڵەتی سەفەوی عەجەمی شیعە کارەساتێکی تری مێژوو بوو، بەدرێژایی فەرمانڕەواییان زیانی زۆریان بۆ هەموو پارچەکانی کوردستانی ئەو سەردەمە هەبوو. شا ئیسماعیلی سەفەوی (١٤٨٦ - ١٥٢٣) لە ساڵی ١٥٠٢دا ناوچە ئەرمەنی نشینەکانی خوارووی قەفقاسی داگیرکرد. لە ساڵی ١٥٠٣ هێرشی کردە سەر هەندێ لە ناوچەکانی کوردستان، هی وەکو ورمێ و شنۆ، لە دوای ساڵێک هێرشی بردە سەر ناوچەکانی دیکەی کوردستانی وەکو دیاربەکر. سیاسەتی بەرژەوەندی ئایینزای شیعە کە سەفەوی و تورکمانەکان ڕەچاویان دەکرد گەلێ خراپەی هەبوو بۆ کورد، چونکە کورد سوننی بوون.

ئیسماعیلی سەفەوی ئۆتۆکراتێکی خوێنڕێژ بوو، سنوور بۆ کردەوە خراپەکانی نەبوو لە کوشتن و بڕیندا. جارێکیان سەردانی شاری خۆی دەکا. یازدە میری کورد پێشوازی و بەخێرهاتنی دەکەن، بەڵام ئەو هەموویانی زیندانی کرد و لەباتی ئەوان کەسانی قزلباشی کردە سەرۆکی میرنشینەکان، ئەمانە لە دوای شکانی ئیسماعیلی سەفەوی بەرامبەر سوڵتانی عوسمانی سەلیم (١٥١٢ - ١٥٢٠) لە جەنگی چالدیران (١٥١٤) لە زیندان ڕزگارییان بوو.

ئیسماعیلی سەفەوی هەموو هەوڵی بۆ ئەوەبوو میرنشینە کوردەکان لەناو ببا و قەلاچۆی ئایینزای سوننی بکا و خەڵکەکە وەرگێڕێتە سەر ئایینزای شیعە، حەکیمەدین ئیدریسی بدلیسی دەوری دیاری هەبوو لەم کێشەیەدا، بەناوی ئایینزای سوننییەوە توانی پارێزگاری هەندێ مافی نەتەوەی کورد بکا، چونکە کورد بۆی نەدەکرا بەناوی ئایینزاوە (سوننە) بەرهەڵستی ئێران بکا و بەناوی قەومییەتەوە (کوردایەتی) بەرهەڵستی عوسمانی بکا.

لەم ماوەیەدا بوو جەنگی قەڵای دمدم لە نێوان شاعەباسی سەفەوی و ئەمیرخان (خانی لەپ زێڕینی کورد) هەڵگیرسا، بەڕاستی ئەم جەنگە لەنێوان کوردی سوننە و قزلباش و ڕێگرە جەلالییە شیعەکان بوو. جەنگی قەڵای دمدم کە لە ٢٦ی شەعبانی ١٠١٧ھ/٥ی کانوونی یەکەمی ١٦٠٨ ڕووی داوە داستانێکی قارەمانیەتی نەتەوەی کورد بوو، لە دواییدا بوو بەسەرچاوەیێکی گرنگ و ڕەنگی لە ئەدەبی میللی سەرزاری کورد دایەوە لە هەموو کوردستاندا، لە سەدەی بیستەمیش بوو بەسەرچاوە بۆ نووسینەوەی ڕۆمان و چیرۆک و شانۆگەری کوردی.

لەساڵی ١٦٣٨ سوڵتان مرادی چوارەم (١٦١٢ - ١٦٤٠) پەیمانێکی لەگەڵ قوباد بەگی میری ئامێدی بەست، بۆ ئەم مەبەستە سوپاییێکیان لە خەڵکی بادینان و سەرەک عەشیرەتەکانی کوردی وڵاتی مووسڵ و هەولێر و کەرکووک و شارەزوور پێکهێنا و هێرشیان بردە سەر بەغدا و داگیرکەرانی عەجەمیان لەوێ دەرکرد. بەم شێوەیە ئەم ناوچە جوگرافیانە وەک قەوارەیێکی بەڕێوەبردنی دەوڵەت خۆیان گرت تا

سەرەتای سەدەی نۆزدەم، ئەمە بووە هۆی ئەوەی دەسەڵاتی ئێران لە ڕۆژئاوای شاخی زاگرۆس نەمێنێ.

هەرچی ناوچەکانی کوردستانی سەرووش بوون وەکو بدلیس و ئامێدی و هەکاری میرنشینی سەربەخۆ بوون و میرە کوردەکان بەڕێوەیان دەبرد و ئەمانە نەچووبوونە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی عوسمانیان تا ساڵی ١٦٦٠م.

ئەو جەنگانەی نێوان سوڵتانی عوسمانی و شاهانی سەفەوی گرنگیی ناوچەکانی کوردستان دەخەنەڕوو، لەبەر ئەوە هەمیشە خاکی کوردەواری مەیدانی جەنگ بووە بۆیە تووشی ئەشکەنجە و ماڵوێرانی بووە بەدرێژایی مێژوو. میرە کوردەکان نەیانتوانیوە ببنە هێزێک لە نێوان ئەم دوو دەوڵەتە دەسەڵات بەدەستە بۆ ئەوەی حسێبێکیان بۆ بکەن. هۆی نەبوونی یەکێتی لەناو کوردەواریدا نەخوێندەواری و هەژاری و دواکەوتوویی بوو، چاوچنۆکی و خۆپەرستی میرە دەرەبەگەکان لەسەرووی هەموو ئەو هۆیانەوە بوو.

میرنشینی بابان لە سەرەتای سەدەی هەژدەم لە شارباژێڕ لەلایەن سلێمان بەگەوە دامەزرا (بابا سلێمان)، گۆیا نەوەی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە بوو. لەگەڵ دامەزراندنی میرنشینی بابان لە ساڵی ١٧١٥ والی بەغدای عوسمانی حوسێن پاشا سوپای ناردە سەر عەشیرەتەکانی بڵباس (بڵباس یەکێتی عەشایەرە)، لەو جەنگەدا بەکر بەگی بابان کوژرا لەو کاتەی بابان کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، هەر لەو ڕۆژگارەدا بوو میرنشینی سۆرانیش کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەوە.

دەسەڵاتی نادر شا (١٦٨٨ - ١٧٤٧) لە ئێرانا ڕەنگە مێژوونووسانیان شانازی پێوە بکەن بەوەی هەموو ژیانی شەڕوشۆڕ بووە بۆ مەبەسی فراوانکردنی قەوارەی وڵاتیان و جەنگەکان هەمووی لە پێناوی لەناوبردنی ئایینزای سوننە بووە کە شیعەکان لەو سەردەمەدا بەجەنگی پیرۆز ناویان هێناوە. نادر شا ئەوەندە ڕقی لە کورد بوو تەنیا بەوە دڵی ئاوی نەدەخواردەوە وڵاتیان داگیر بکا، بەڵکو ئاوارەی دەکردن و جێی زێندەگانی هاووڵاتی کوردی دەگوێزایەوە ناوچە دوورەکانی نیشتمانی کورد، بۆ بەڵگە لە مێژوودا ئاوارەکردنی کوردی کوردستانی ئێران بۆ خۆراسان ڕووداوێکی ئاشکرایە، بەڵام ئەو کوردانە ئەگەرچی بەزۆری ئایینزایان گۆڕی و بوون بەشیعە کەچی نەتەوایەتییان نەدۆڕاند و تا ئێستاش کوردانی خۆراسان بەکوردی دەژین، ئەو بڕە کوردەی ئەوێ لەبەر هەر هۆیێک بێ کە کۆچیان کرد بۆ ناوچەکانی دەوروبەری شاری عەشقابادی تورکمانستان تا ئێستاش ئەدگاری کوردایەتی خۆیان پاراستووە.

نادر شا هێرشی زۆر بووە بۆ سەر وڵاتی کوردەواری، لەمانە لە ساڵی ١٧٢٩ سوپای عوسمانی لە هەمەدان و کرماشان و لوڕستان و کوردستان وەدەرهێنا. لە جەنگەکانیدا بەردەوام بوو، لە دوای ساڵێک لە ١٧٣٠ ئازربێجانی داگیرکرد و دەستی بەسەر تەورێزدا داگرت، ئینجا بەرەو سابڵاغ (مەهاباد) و مەراغە و ناوچەکانی دەوروبەر.

سەردەمی فەرمانڕەوایی نادر شا بێ جەنگ نەبووە، لەسەر خاکی ئێمە بووبێ یا لە وڵاتی هاوسێکانمان. لە ساڵی ١٧٤٣ نادر شا هێرشی بردە سەر بەغدا و شارەزوور و کەرکووک، لە پاشانا ڕووی کردە زەوییەکانی زێی کۆیە، ئەوجا هەولێر و مووسڵ، کوشتن و تاڵان و ئاوارەیی بەشی



دانیشتوانی ئەم خاکانە بوو.

کورد ناوی نادر شا بەخوێنڕێژ دێنێ، خۆشیان نەویستووە و ناویان بەچاکە نەهێناوە، ئەمە ڕەنگی لە ئەدەبی کوردی داوەتەوە لە هەموو هەرێمەکانی کوردستانی خوارووو و ڕۆژهەڵات و شیعری لیریکی و چیرۆکی شیعری لەم بابەتەوە بەرچاو دەکەون.

لە دوای کوشتنی نادر شا دەسەڵاتی بنەماڵەی کوردی زەند دروست بوو (١٧٥٣ - ١٧٩٤). کەریم خانی زەند لەقەبی شای لە خۆی نەنا و بە«باوەڕپێکراوی هاووڵاتییان» خۆی بەخەڵکی ناساند، ئێرانی دەڵێن لە کۆنی کۆنەوە لە مێژووی ئێراندا سەردەمێکی خۆشی وا کە ماوەکەی لە نیو سەدە کەمتر بوو هەڵنەکەوتووە، لەو ڕۆژگارەدا دەڵێن مەڕ و گورگ پێکەوە ئاویان دەخواردەوە.

لەپاش فەرمانڕەوایی بنەماڵەی زەند ئاغا محەمەدی قاجار لە تایەفەی تورکمانان لە ساڵی ١٧٩٤ دەسەڵاتی قاجاری لە ئێران دامەزراند. قاجارەکان تارانیان کرد بەپایتەخت و دەسەڵاتیان تا ساڵی ١٩٢٤ بەردەوام بوو.

## ناوچەی جوگرافی کوردانی گۆران

گۆران هۆز و تیرە و کۆمەڵێکی ئەتنۆگرافییە لە خەڵک لەگەڵ کرمانج و لوڕ نەتەوەی کورد پێکدێنن. زانیاری لەم بابەتەوە لە سەدەی شازدەمدا لەلایەن مێژوونووسی یەکەمی کورد شەرەفخانی بدلیسییەوە کەوتۆتە ناوەوە.

گۆران وەک زاراوە بۆ کۆمەڵێک عەشرەت و یەکێتی عەشرەت بەکاردەهێنرێ. ئەم خەڵکە لە دامەنەکانی شاخی زاگرۆس دەژین لەو شیوانەی لە چیاکانی لای باکووری ڕێگەی بەغدا و کرماشان دەبنەوە. هەروەها لەم ناوچانەش ژیانی کۆچەری و نیشتەجێیی دەبەنە سەر: لەسەر ڕووباری سیروان و ناوچە جیاوازەکانی هەردوو هەورامان، هەورامانی لهۆن لە ڕۆژئاوای ئەو زنجیرە شاخە و هەورامانی تەخت لە ڕۆژهەڵاتی ئەو زنجیرە شاخە.

جگە لەوە گۆرانەکان لە هەندێ ناوچەی جوگرافی دیکەدا زیندەگانی دەکەن:

١- هێڵی سنە - کرماشان بەرەو ڕۆژئاوا ئەو ناوچانەی کەوتوونەتە نزیک سنووری عێراق و ئێران.

٢- ناوچەی پاوە، کەوتۆتە شیوێک لە شیوەکانی زێی سیروان.

٣- ناوچەی کەندوولە (کەنوولە) کەوتۆتە لای سەرچاوەی زێی بانیان بەرامبەر بەخەرابە و پاشماوەی شوێنەواری شاری دینەوەری مێژوویی بەناوبانگ.

٤- لەسەر ڕووباری خازر (غازر) لە باکووری شاری مووسڵ لەو ئاقارانەی دەڕژێتە ناو زێی گەورە (زێی بادینان)، لەم ناوە عەشرەتەکە «باجەڵان»ی پێدەڵێن، بەڵام لەناو خۆیان و هاوسێکانیان بە«سارەلوو» یا «سارەلی» ناویان دەبەن.

٥- باجەڵانەکان لە ناوچەی زەهاوی باکووری لوڕستانیش دەژین.

٦- لە کوردستانی تورکیا گۆرانەکان بەزازا ناویان دەبرێ، چونکە لە ڕووی نەژادی عەشرەتی و زمانەوە گۆران و زازا یەکتر دەگرنەوە. ئەمانە لەوێ لە ناوچەی دەرسیم لە نێوان مووش و ئەرزنجاندا دەژین، هەروەها لە ویلایەتەکانی ئەرزەڕۆم و خەرپووت و بدلیس و دیاربەکر دەبینرێن.

ئەو ناوچە جوگرافیانەی کە گۆرانەکان تێیدا دەژیان لە ڕۆژگارانی مێژوودا، لەو سەردەمانەی دیالێکتی زمانیان دروست دەبوو، گەلێ فراوانتر و گەورەتر بوو لەو ناوچانەی لە سەرەوە دەستنیشانمان کردن، هیچ گومانێک لەوەدانییە ئەو ناوچانەی گۆرانەکان تیایاندا نیشتەجێ بوون یا کۆچیان دەکرد لە سەدەی هەژدەمدا گەورەتر بووە لەو زەوییەی ئێستا داگیری دەکەن، دیارە ئەم گۆڕانە لە ژیاندا تەنیا دیالێکتی زمان دەگرێتەوە، بەوەی دیالێکتی گۆرانی کز دەبێتەوە و دیالێکتێکی دیکەی زمانی کوردی جێی دەگرێتەوە.

پەیدابوونی میرنشینی سلێمانی لە دوا ساڵانی سەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەم بەشێوەییێکی نوێ (مودێرن) تا ڕادەییێک لەسەر حسێبی تەسکبوونەوەی ئەو ناوچانەبوو کە گۆرانەکان تیایاندا دەژیان. بەم ڕەنگە دیالێکتی کرمانجیی خوارووی زمانی کوردی وەکو زمانێکی ڕەسمی میرنشینی سلێمانی پەیدابوو، لە دوا ساڵانی سەدەی هەژدەمەوە بەرە بەرە جێی بەدیالێکتی گۆرانی لەق کرد و لەسەر حسێبی ئەو بڵاوبووەوە.

تۆفیق وەهبی لە ناسینی گۆرانەکان زانستییانە گەلێک زانیاری بەدەستەوە دەدا، بەڵام داخی گران زۆریان بڵاونەکراونەتەوە، من وەکو مامۆستاییێکم لێم بیستووە، ئەوەی بڵاویش کراوەتەوە پچڕ پچڕ لەم لاو ئەولای باسە زانستییەکانیدا بڵاوکراونەتەوە. لە بیروباوەڕەکانی لەم لایەنەوە دیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردی لە میرنشینی ئەردەڵاندا باو بوو، بابا ئەردەڵان لەسەدەی چواردەمی مەسیحی دایمەزراند، سەرلەنوێ شاری شارەزووری دروستکردەوە، ئەوەی مەغۆلەکان وێرانیان کردبوو و کردی بەیەکێ لە شارە سەرەکییەکانی میرنشینی خۆی. دوور نییە بڵاوبوونەوەی گۆرانەکان لە ڕۆژهەڵاتی زاگرۆسەوە بەرەو شارەزوور بەم بۆنەیەوە ڕوویدابێ.

کاکەییەکان (ئەهلی هەق، عەلی ئیلاهی، یارسان) شارەزووریان کرد بەسەرزەمینی پیرۆزیان، وە دیالێکتی گۆرانی بەزمانی ئایینییان، کەچی سوڵتان «سەهاک» کردگاری کاکەیی خۆی خەڵکی بەرزنجە بوو، دێییێکە لە شارباژێڕی کرمانجی، لەو سەردەمەدا زمانی شیعر لە شارەزووردا گۆرانی بوو، وە ئەدەبی ئایینی کاکەییانیش بەشیعر دەستی پێکردبوو و تا ئێستاش ماوەتەوە.

لێرەدا پێویستە ئەوەش بوترێ کە عەشرەت و هۆزەکانی گەرمیانی دەوروبەری کەرکووک و کفری و خانەقین و قەراغ زێی سیروان، وەکو عەشرەتەکانی زەنگنە و جەباری و شوان و بیبانی و هی دیکە لە تیرەی گۆران بوون، ئەمانە ئەدەبی کلاسیکی نووسراو و ئەدەبی میللی نەنووسراوی (فۆلکلۆری) خۆیانیان هەبوو بەدیالێکتی گۆرانی، بەڵام دیالێکتی کرمانجیی خواروو بەرە بەرە ئەو ناوچانەی داگیرکرد لە ئەنجامی پەرەسەندن و پێشکەوتنی لە سایەی میرنشینی سلێمانییەوە.



دیالێکتی گۆرانی زمانی کوردی قسەکردن و نووسینی هەموو ئەو هۆز و کۆمەڵ و خەڵقانەیە، ئەوانەی لەو ناوچە جوگرافیانەدا دەژیان. بێگومان دیالێکتی گۆرانی لە چەند دیالێکتێکی بچووکی ناوچەیی پێکهاتووە، وەکو دیالێکتەکانی تری زمانی کوردی.

ئەدەبی کلاسیکی کوردی نووسراو و ئەدەبی میللی نەنووسراو بەهەموو دیالێکتە ورد و درشتەکان پەرەی سەند و گۆڕانی بەسەر داهات بەشیعر و پەخشانەوە، ئەگەرچی شیعرەکە بەشی زۆری ئەو ئەدەبەیە و پەخشانەکە بەشی کەمیەتی. لە دیالێکتی گۆرانیدا مەسەلەی دیالێکتە بچووکەکان و ڕەنگدانەوەیان لە ئەدەبدا ڕوونتر و ئاشکراتر دەکەوێتە بەرچاو، واتە ئێمە شیعری کوردی بەدیالێکتە بچووکەکانی دیالێکتی گۆرانی دەبینین.

تۆفیق وەهبی هەردوو دیالێکتی گۆرانی و زازایی بەیەک دیالێکت دەزانێ، بەم جۆرە دیالێکتی گۆرانی بەلای ئەوەوە لەم دیالێکتە بچووکانە پێکهاتووە: هەورامانی، زەنگنەیی، کاکەیی (ماچۆ) و باجەڵانی.

سەرەتای ئەدەبی کوردی نووسراو واتە شیعری کلاسیکی بەدیالێکتی گۆرانی بوو. بێگومان هۆی هەرە گەورەی پێشکەوتنی ئەم دیالێکتە لە ڕۆژگارانی مێژوودا ئەوەبوو کە بابا ئەردەڵان میرنشینی لە سەدەی چواردەمی مەسیحیدا دروست کرد بایەخێکی زۆری بەلایەنی زانستی و ئەدەب و هونەر دەدا، زمانی ئەو میرنشینە دیالێکتی گۆرانی بوو، جگە لەمە دیالێکتی گۆرانی زمانی ڕەسمی ئایین و ئایینزا و عەقیدە شارراوەکان بوو لەو ناوچانەی هۆزەکانی گۆران کردبوویان بەمەڵبەندی ژیانیان.

ئەستێرەی بەختی دیالێکتی گۆرانی بەرەو کزبوون و ڕژان دەڕۆیشت لەوکاتەی کە بزووتنەوەی شیعری نوێ لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم لەسەر دەستی نالی لە ناوچەی سلێمانی سەری هەڵدا. لەو سەردەمەدا عەبدولڕەحیمی مەولەوی (١٨٠٦ - ١٨٨٢) لووتکەی شیعری کلاسیکی دیالێکتی گۆرانی بوو، ئیتر بەرەو کزبوون کەوتە ڕێ و شاعیرێکی وەکو مەولەوی لە دواڕۆژدا پێشکێش نەکرد، لەگەڵ ئەوەی تا ئێستاش دیالێکتی گۆرانی هەر ماوە و کۆتایی نەهاتووە.

## بەشی دووەم

# مەلا پەرێشان

**١٤٢١ - ١٣٥٦**

### ژیانی

ناوی محەممەد ئەبولقاسم لە ساڵی ١٣٥٦م لە شاری دینەوەری ناوچەی کرماشان لەدایک بووە، نازناوی شیعری مەلا پەرێشانە. بەمەلا پەرێشانی دینەوەری و مەلا پەرێشانی کورد و مەلا پەرێشانی لوڕیش ناوبانگی دەرکردووە.

لە کتێب و نووسراوی سەردەمی ژیانی ناوی هاتووە، هەروەها خۆشی باسی شێخ ڕەجەب بورسی کردووە، لە دێڕە شیعرێکیدا دەڵێ:

شێخ ڕەجەب بورسی وە ئەو گشت قورسی
لە وەحدەت حەرفی ئەو ژ من پرسی
پەنجا ساڵ تەریق خدمەتم گوزاشت
جوز وە یەک ڕشتە جوربزە نەیاشت

واتاکەی:

شێخ ڕەجەب بورسی بەم هەموو قورسییەیەوە (گەورەییەوە)
لە بابەت وەحدانییەتی حەرف (خودا) لە منی پرسی
پەنجا ساڵ خزمەتی تەریقم کردووە (ئایینم کردووە)
جگە لە ڕشتەیێک هیچی دیکەی نەدەزانی

مەلا پەرێشان هاوڕێ و نزیکی شێخ ڕەجەبی بورسی بوو، ئەم شێخە خاوەنی کتێبی «مشارق الانوار – ڕۆژهەڵاتانی ڕووناکی» بووە کتێبەکەی لە ساڵی ٨٠١ھ/١٣٩٨م نووسیوەتەوە، بەم پێیە مەلا پەرێشان لە نێوان نیوەی دووەمی سەدەی چواردەم و نیوەی یەکەمی سەدەی پازدەمی مەسیحی لەگەڵ هاوڕێکەی شێخ ڕەجەبی بورسی لە ژیانا بووە.

گەلێ دیوی ژیانی مەلا پەرێشان ئاشکرا نییە، سەرچاوەی هەرە گرنگ ناوەڕۆکی شیعرەکانیەتی کە لە دیوانەکەیدا تۆمارکراون. ئەمە تینوەتی مێژوونووسی ئەدەب تا ڕادەیێک دەشکێنی و دەتوانێ هەندێ لایەنی ژیانی ڕۆشنبیری شاعیر ڕووناک بکاتەوە لەمانە دەکارین بڵێین مەلا پەرێشان کۆنترین شاعیری کوردە بەدیالێکتی گۆرانی زمانی کوردی شیعری دانابێ و لە چوارچێوەی شیعری ئایینی یارسان چووبێتە دەرەوە.



مەلا پەرێشان ژیانی لە ناوچە کوردییەکانی کرماشان و دینەوەر بردۆتە سەر، پێوەندی بەهێزی بووە لەگەڵ لوڕستان لە هەموو ڕوویێکەوە زۆرتریش لە بابەت زمان و ئەدەبیاتەوە تا لە ساڵی ١٤٢١م کۆچی دوایی کردووە.

### خوێندەواری و بیروباوەڕی

مەلا پەرێشان لەسەر ئایینزای شیعی ئایینی ئیسلام بووە، قۆناغەکانی مەلایەتی لە خوێندندا تەواو کردووە، لەبەر ئەوە وەکو لە شیعرەکانیشی دەردەکەوێ شارەزاییێکی تەواوی لە زمانی عەرەبیدا بووە، جگە لە زمانی دایک کە کوردی بووە، فارسیشی زانیوە، لە هەندێ سەرچاوەدا ئەوە هاتووە کە تورکیشی زانیوە، جا نازانین لە کۆمەڵی ئێرانی سەدەی چواردەم زمانی تورکی عوسمانی بەشێوەییێک باوبووە خوێندەوارانی ئەو سەردەمە گرنگی پێ بدەن!

مەلا پەرێشان لە بیروباوەڕی ئایینزای شیعە تا پلەییێک زیادڕۆ بووە، بەلای ئەوەوە کارێکی ئاسایی بووە ناوی سێ خەلیفە بەراییەکانی ڕاشیدین بەخراپە بهێنی، لە نووسینەکانیدا خۆی وەکو شیعەییێکی دوازدە ئیمامی موتەتەریف پیشان دەدا.

بیروڕا و عەقیدەی شاعیر نموونەی ئایینزای شیعی ڕەسمی ئیسلامی بووە بەهەموو لایەنەکانی تیۆری و پراکتیکییەوە، مەلا پەرێشان لەسەر ئەو باوەڕە بووە کە دوازدە ئیمام و چواردە مەعسوومەکان دروشمی پێوەندین لە نێوان ئادەمزاد و کردگار، ئەمانە هەموویان لە پێغەمبەر و نەوەی ئەون، خودا دروستی کردوون بۆ ئەوەی ڕەمز و پێوەندی بن بۆ ڕێ پیشاندانی ئادەمزاد لە پێناوی دۆزینەوەی ئایینی ڕاست.

شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە کە خودا لە سەرەتادا گەردوونی بەم جۆرە دروست کردووە:

چون حەق ژ ئیجاد ماسیوا پەرداخت
ژ نووری ئەحمەد لەوح و قەلەم ساخت
عەرش و کورسی هەم ژ نوور مورتەزا
ئاسمان و زەمین ژ نوور موجتەبا
ژ نووری حوسەین بەهەشت کرد بینا
جیلوەگەری نوور بەتوولی عەزرا
نووری بەتوول کەرد مەشاتە هەر هەفت
ئەتلەس و ئەفلاک گەردش و زەربەفت
چون کە ڕەوشەن کەرد کوللی ماسیوا
مولەققەب بی وو زوهرەیی زەهرا

واتاکەی:

خودا لەبنجدا هەموو شتی بێجگە لە خۆی دروست کرد

له نووری محەمەد لەوح و قەڵەمی دروست کرد
عەرش و کورسیش له نووری عەلی (مورتەزا)
ئاسمان و زەوی له نووری حەسەن (موجتەبا)
له نوری حوسێن بەهەشتی بیناکرد
بەتوولی کیژ (فاتیمه) بووه ڕەمزی نوور
بەنووری بەتوول هەر حەوتی ڕووناک کردەوه
گەردوون و چەرخ و فەلەک کەوتنه بزووتنەوه

که هەموو شتی بێجگه له خۆی ڕووناک کردەوه نازناوی زوهرەی زەهرای درایه (واته فاتیمه) له پاشانا ئادەمزاد بەسەر سێ چین دابەش دەکا:

سێ نەوع بەشەر خەلق کەر خوای عالەم
ناس و شوبه ناس، یەک ناسی ئەفهەم
ناس چارده مەعسووم شوبه ناس بزان
بووزەر و میقداد، عەممار و سەڵمان
ما بەقا مەردم موتلەق نەسناسەن
وه ئەحەدییەت خودا نەشناسەن

واتاکەی:

خودای عالەم سێ جۆره خەڵکی خولقاند
ناس و شوبه ناس، یەکێکی تێگەیشتوو
ناس چوارده مەعسوومەکەن، شوبه ناسیش
ئەبوو زەر و میقداد و عەممار و سەلمان
ئەوەی دەمێنێتەوه هەموویان نەسناسن

(نەسناس: جۆره جانەوەرێکه بێ هۆشه بەلەش کەمێک له ئادەمزاد دەکا)

مەبەسی مەلا له (ناسی ئەفهەم) هەموو ئەو خەڵکەیه که له پاش چوارده مەعسووم و ئەو چوارەی باسی لێوه دەکەن دێن (ئەبوو زەری غەففاری، میقدادی کوڕی ئەسوەد، عەمماری کوڕی یاسر، سەلمانی فارسی) ئەوەی پاش ئەمانه بەلای ئەوەوه ئاژاڵ و دڕندەن.

### شاعیر سۆفیی تەریقەتی «حورووفیه» بوو

له سەردەمی ژیانی مەلا پەرێشان بزووتنەوەی (حورووفییه) وەک ڕێبازێکی سۆفیزم کەوته ناوەوه. زاراوەی ئەم ڕێبازه سۆفیزمییه له وشەی (الحرف)ی عەرەبییەوه دروست کراوه، ئەمه فیرقەییێکه له (أهل



الحقیقة - کەسانی ڕاستی) دامەزرێنەری فەزلولڵلای نەعیمی ئەسترابادییه (١٣٤٠ - ١٤٠٢). خاوەنی ئەم ڕێبازه کەسێکی بەتوانا و پڕ زانست بوو، داوای ئەوەی کرد که خەلیفەی خودایه لەسەر ئەرز وەکو عیسا و محەمەد، لەدەست خەڵکی خۆی شاردەوه، بەڵام ئەنجامی کوشتن بوو، سێ کتێبی هەیه لای حورووفییەکان بەکتێبی پیرۆز دەژمێردرێن، یەکێکیان (جاویدنامه) پەخشانه، دوانەکەی دیکەی (محبت نامه) و (عرش نامه) بەشیعر دانراون.

بیروباوەڕی حورووفییه بەتەواوی له شیعری مەلا پەرێشاندا ڕەنگی داوەتەوه، بۆ خوێندەوار هەیه هەندێ لایەنی نهێنیی ئەم ڕێبازه له شیعری ئەم شاعیرەماندا بۆی ڕوون ببێتەوه. ڕێبازەکه لەسەر ئەوه دامەزراوه که بنج و بنیادی ناسینی خودا له وشه (کلمة) دایه. حەرف (تیپ) مانای نهێنیی هەیه، لێکدانەوه فەلسەفییەکه لەسەر بنجی نرخی ژمارەیی حەرف وەستاوه. بەم پێیه هەموو تیپەکانی نووسین لەکن لایەنگرانی ئەم ڕێبازەدا پیرۆزن. لەناو هەر تیپێکدا نهێنییێک هەیه. بەلایانەوه ئەگەر ئادەمزاد بگاته پلەی (کاملی) له پلەی خوایەتی نزیک دەبێتەوه.

بۆ مەبەستی نهێنییەکانی تیپی نووسین ئەمانەش وەکو زۆربەی فیرقەکانی سۆفیزمی ئیسلامی دەگەڕێنەوه قورئان دەڵێن ئایەتەکانی هەمووی نهێنییه، مانا دیار و ڕووکەشەکانی جەوهەری قورئان نانوێنن.

بزووتنەوەی حورووفییه لەناو ئایینزای شیعه سەری هەڵدا. پەیدابوونی (حەق) له سێ پلەی (نبّوت، ولایەت، ألوهیەت) دەبینن. بەلای ئەوانەوه (نبّوت) بەپێغەمبەری ئیسلام دوایی هاتووه، «ولایەت» لەوەوه دەست پێدەکا، بەڵام لەپاش ئەو عەلی و یازده منداڵەکانی جێنشینی پێغەمبەرن، دوازدەمیان خاوەنی ویلایەت و مەزهەری خوایەتییه، وەکو چۆن له دوای پێغەمبەری ئیسلام پێغەمبەری دیکه نییه، له پاش ئیمامی دوازدەمینیش وەلیی تر نایه. هەروەها ئیمامی دوازدەم بەدوا پێغەمبەر دادەنێن، جێنشینانی ئەمانه مەزهەری خوایەتییان هەیه.

له شیعرێکیدا مەلا پەرێشان بیروڕای ڕاستی حورووفییەتی خۆی دەخاتەڕوو:

ئەوەڵین حەرفی نوبووەت نوونەن
مەلفووزەش سێ حەرف واوەش مەکنوونەن
واو خود کینایه ژ ویلایەتەن
نەمن یه واتەم نەسسی ئایەتەن
ئەووەڵین حەرف ویلایەت واوەن
ئەونیز مەلفووزەش سێ حەرف واوەن
ئەوسەت ئەلفەن ژ ئولووهییەت
مونکیر ئینکار کەرد ژ بولووهییەت

واتاکەی:

یەکەمین حەرفی نوبووەت نوونە
لە سێ حەرف پێکهاتووە واوی شارراوەیە
واو کینایەتە بۆ ویلایەت
ئەمە لە ئایەتی قورئاندا هاتووە
یەکەمین حەرفی ویلایەت واوە
ئەویش بەلەفز سێ حەرفی واوە
ناوەڕاست ئەلفە لە ئولووهییەتە
مونکیر ئینکاری دەکا چونکە گەمژە و گێلە

لە شیعرێکی تریدا دەڵێ:

وەســـفی بەندەگی بزان سێ حـــەرفـــەن
حـەرفێ سێ کـەلام وەنەحـوی سـەرفـەن
ژ (واو) «وەدوود» ، «وەفـــا» بکـەرزەبت
ژ (صـاد) «صـبـر» ، «صـەفـا» بکەرزەبت
(ف)ێ «فەقـر» و «فـاقـه» «فنا ء»دا مـحـەل
(خـــــیـــــر الـکـلام مـــــاقّـل ودلّ)

واتاکەی:

(وصف)ی عەبدایەتی بزانە سێ حەرفە
بەنەحوو و سەرف حەرفی هەر سێ وشەکان
لە (واو) «وەدوود» ، «وەفا» ببینە
لە (صاد) «صەبر» ، «صەفا» ببینە
(ف)ێی «فەقر» و «فاقە» «فەنا ء» لەجێی خۆیانن
(خیر الکلام ماقلّ ودلّ)

مەلا پەرێشان ئەدەبی کلاسیکی کورد بەم بابەتە ناوەرۆکانە دەوڵەمەندکردووە. لەوانەیە خوێندەوار بیری بۆ ئەوە بچێ ئەم جۆرە شیعرانە دوورن لە خەیاڵ و دۆزینەوەی مانا، بەڵام دۆزینەوەی نهێنیی هەندێ لایەنی سۆفیزمیان تێدایە، لەبەر ئەوە دەچنە ناو ئەو جۆرە شیعرانەی کە ناونراون شیعری فێرکردن (دیداکتی)، ئەم بابەتە شیعرە لەناو هەموو کۆمەڵانی پێشکەوتوو لەناوەوە بووە لەسەردەمی گریکەکانەوە تا ئێستا.



## مەلا پەرێشان دژی «دەروێشیزم» بوو

بێگومان مەلا پەرێشان بەئایین موسڵمان و پێڕەوی ئاییـنزای شیعەی کردووە. باوەڕی بەشەریعەت بووە، کە لایەنگری حورووفییە بووە، ئەم بیروباوەڕە سۆفیزمییەی لە چوارچێوەی ئاییـنزای شیعەدا بینیوە. تەریقەتی ڕاست بەلای ئەوەوە حورووفییە بووە، ئەگەرنا ئەو تەریقەتانەی لەناو ئاییـنزای سوننی دابوون، بەتایبەتی ئەوانەی خەریکی لایەنی پراکتیکی تەریقەت بوون کە ئێمە «دەروێشیزم»ی پێ دەڵێین، مەلا پەرێشان ئەمانە بەکوفر و خودانەناسی لە قەڵەم دەدا، لەم لایەنەوە دەڵێ:

وە مـەزهەب حـەقـیـر دوو هۆزن کـافـر
یەکی سـۆفـیـیـە، یەکی مـوتەکـەبر
لێکن وەمـەعنا سـووف پەشم پووشـا
کـیـلاب و سـیـبـاع دەواب و حـووشـا
تـاریکوسـسـەلات مـالی مـەردم خـوەر
یەمـەعنای سـۆفـیـە، وێنە سـەگ و خـەر

واتاکەی:

ئەوەی بەمەزهەبی حەقیر دەژمێردرێ دوو هۆزی کافرن
یەکێکیان سۆفی ئەوی دیکەیان لووت بەرز (موتەکەبیر)
بەڵام لە جەوهەردا پۆشینی خورییان درۆیە
ئەمانە سەگ و گورگ و وڵاغ و دڕندەن
نوێژ ناکەن ماڵی خەڵکی دەخۆن
ئەم جۆرە سۆفییانە سەگ و کەرن

وەکو لەم شیعرە و لە سەرانسەری شیعری مەلا پەرێشان دەردەکەوێ دژی سۆفیزمی سەر بەئاییـنزای سوننی بووە، جگە لەوە لە دژی لایەنی پراکتیکی دەروێشیزمی سەردەمی خۆی بووە، ئەم دیاردەیە لەناو زۆربەی شاعیرانی کورد ئاشکرا و دیارە، هەندێ لەو شاعیرانە خۆیان شێخی تەریقەت بوون لە کوردستاندا شیعریان ڕەنگدانەوەی فەلسەفەی سۆفیزم بوو کەچی لە دژی لایەنی پراکتیکی دەروێشیزم بوون.

## دیوانی مەلا پەرێشان

شاعیری ئەم ماوەیەمان دیوانێکی بچووکی لەپاش بەجێ ماوە، لە خوێندنەوەی دیوانە چاپکراوەکە و دەسنووسەکاندا ئەوە دەردەکەوێ ئەوانەی ڕوونووسیان کردووە شیعرەکانیان شێواندووە، تا ئێستاش لە دیوانەکە نەکۆڵراوەتەوە و چاپێکی کریتیکی لەبەر ڕۆشنایی چەند دەسنووسێک نەکەوتۆتە ناوەوە.

دیوانی شیعری مەلا پەرێشان بەدەسنووس و چاپەوە بەم ناوانە دەکەونە بەرچاو: «هذا کتاب المرحوم

الملا پریشان الکردی» ، «دیوانی مەلا پەرێشانی کورد» .

دیوانی دەسنووسی مەلا پەرێشان یا ڕاستتر «پەرێشان نامە» بریتییە لە پێشەکی و حەوت فەسڵ و پاشەکی بەپێی ئەو دەسنووسەی کە لە زانستگای ماربورگی ئەڵمانیا پارێزراوە.

پێشەکی لەبابەت نوکاتی مەعنەوی و ڕەموززاتی موحتەوی حەقیقی و ئیشارات و کینایات لە بارەی تەریقەتی ڕەززییەی ڕەزەوییە.

فەسڵی یەکەم: ئامۆژگاری و پەند لە بابەت ئەهلی عیرفان و مەعریفەتەوە.

فەسڵی دووەم: داواکردنی یارمەتی لە ساقیی حەقیقی.

فەسڵی سێیەم: لەبابەت «واجب الوجود»ەوەیە لەژێر تیشکی دەستوورەکانی شەریعەت و تەریقەت و حەقیقەت.

فەسڵی چوارەم: لە سیفاتی باری تەعالا .

فەسڵی پێنجەم: ئیعتیراف کردن بەگوناه و داوای عەفوو کردن.

فەسڵی شەشەم: پاڕانەوە لە دەرگای قازییەلحاجات حەزرەتی خەتمی ڕیسالەت (محەمەد) و جەنابی شاهی ویلایەت (عەلی) .

فەسڵی حەوتەم: لەبارەی خراپەی سێ خەلیفە و مونکیرین و موناfیقین و عاسییانی حەققی حەزرەتی ئەمیر و مەعسوومین عەلەیهوموسسەلام.

پاشەکی حاڵی موسەننیف و وەسفی ڕۆژی حەشر و عەدل و خالیقی ئەکبەر.

بەڵام وەکو دەردەکەوێ لەکاتی چاپکردنی دیوانی مەلا پەرێشان بڵاوکەرەوە لەلای خۆیەوە هەندێ ناوی بۆ بەشەکان داناوە، دیارە ئەم ناوانە لەگەڵ ناوەڕۆکی بەشەکان دەگونجێن.

شیعرەکان بەناوی «دیوانی مەلا پەرێشانی کورد» لە کرماشان لەسەر بنج و بناوانی دەسنووسێک چاپکراوە لە ساڵی ١٩١٥ ڕوونووس کراوە. ناوەڕۆکی دیوانەکە لەسەر بنچینەی بەند دەڕوا ، هەر بەندی لەژێر ناوێک دایە وەکو ئەمانە: بسمیللا ، پێداهەڵدانی پێغەمبەر و عەلی، لەبارەی یەزدانی پاکەوە، عەلی و دوازدە ئیمام و چواردە مەعسووم، چینەکانی ئادەمزاد ، سیفەتەکانی ئادەمزاد ، میعراج، ئامۆژگاری، کینایات، وەسفی خودا ، وەسیەتی پێغەمبەر بۆ عەلی، عەلی و غەدیری خوم، زولفەقار، وەسفی پێغەمبەر، ڕیایی و بێ ڕیایی، گفتوگۆی عەقڵ و هۆش، پێغەمبەر و جبریل و عەلی، لە دژی شەراب، ویلایەتی عەلی، شاعیر دەبێ چۆن بێ، لە دژی سۆفیزم، شا و ڕەعیە ، گفتوگۆ لەگەڵ مەلای ئەشعەری، موناجات.

جگە لەم بەشە شیعرەی مەلا پەرێشان دوو بەرهەمی ئەدەبی دیکەی هەیە بەناوی «پەرێشان نامە» و «ساقی نامە» هێشتا بەچاپ نەگەیەنراون.



**شیعری مەلا پەرێشان**

غەزەل و شیعری لیریکی بەمانا ئەدەبییە ڕۆژهەڵاتییەکەی لە ناوەوە نەماوە، ئەوەی ماوەتەوە تەنیا پەرێشان نامەیە ئەویش خەریکی وەسفی حورووفییەیە و ناوی نابا و ناوی دەنێ تەریقەتی «ڕەزییەی ڕەزەوی – رضیەی رضوی» . مەبەسی سەرەکیش لای مەلا پەرێشان پارێزگاری کردنی عەقیدەی ئایینزای شیعەیە بەهەموو لایەنەکانی تیۆری و پراکتیکییەوە.

ئەوەی گومانی تێدانییە ئەوەیە لە بنەڕەتدا مەلا پەرێشان لەبەر ئەوە چۆتە سەر تەریقەتی حورووفییە چونکە ئەم تەریقەتە لەگەڵ شیعەی ئیسلام دەگونجێ. شاعیر زۆر سوودی لەم تەریقەتە وەرگرتووە، وەک ئاشکرایە لە وەسفی میعراجی پێغەمبەردا شەقلی ئەسکەندەرنامەی حورووفییەی پێوەدیارە.

شیعری مەلا پەرێشان نموونەی وەسفی تەریقەتی حورووفییەی تێدایە زیاتر لەوەی داهێنانی ئەدەبی بێ لەناو گێتیی فراوان و بێ پایانی سۆفیزمدا ، لەبەر ئەوەیە شیعرەکانی لە نەزم نزیکترن و بەزۆریش وەعز و ئیرشاد بەڕێوەیان دەبا ، لەگەڵ ئەوەشدا لەناو پەند و ئامۆژگارییەکاندا ئاوڕدانەوەی هونەری وا بەهێز دەبینین شاعیرە گەورەکانی ڕۆژهەڵاتی پاش سەردەمی ژیانی مەلا پەرێشان هەندێکی لەم بابەتەیان بۆ بەجێ هێشتووین.

مەلا پەریشان لە شیعرێکیدا دەڵێ:

دونیا و ئاخیرەت هەردوو ئیحسانەن
هەر خوردەبینی درشت زیانەن

واتاکەی:

دونیا و ئاخیرەت هەردووکیان هەقن
وردبینی گەرەکە، درشتی زیان بەخشە

لە وەعزیشدا هەندێ جار مەلا پەرێشان لە قالبی دیاریکراو و چارەنووس (قَدَر) دەچێتە دەرەوە بۆ گێتییێکی داهێنراوی ئیستێتیکی و بۆچوونەکانی ئەوە دەخەنەڕوو کە شاعیر شارەزای مێژووی فەلسەفە بووە و دەمی لە زانستی مەنتیقیش داوە، لەم لایەنەوە دەڵێ:

غەم مەخور فەردا شەفیع تو منم
مالیکی ڕووحم نەمەملووک تەنم
حوکەمای فەلسەفە و ئیشراقی یونان
وی ئیستیدلالە و دەم ماچان جان
عامی بێچارە عارییەن ژ هوش
مەعلوومەن عەقلەش ها لە پشت گوش

واتاکەی:

غەم مەخۆ سبەینێ من شەفیعی تۆم
من خاوەنی ڕووحم کۆیلەی تەن نیم
حەکیمانی فەلسەفە و ئیشراقی یۆنان
دەلیلی ڕاستی حەقیقەتی گیانن
خەڵکی عامی بێچارە لە بیر و هۆش خاڵین
دیارە عەقڵیان لە پشتی گوێیانەوەیە

## ساقی نامەی پەرێشان

ساقی نامە بابەتێکی باوە لە ئەدەبی کوردیدا، ئەم ساقی نامەیە یەکێکە لە بەرهەمە کۆنەکانی ئەدەبی کوردی لەم ڕووەوە. ناوەرۆکی ئەم جۆرە شیعرە دەچێتەوە سەر ئەدەبی سۆفیزم، ئەوەی ئێمە ئاگادارین ئەوەیە مەلا پەرێشان دژی سۆفیزمە، بەڵام وەک ئاشکرایە ئەو لە دژی لایەنی پراکتیکی سۆفیزمە، ئەوەی ئێمە «دەرویێشیزم»ی پێ دەڵێین و لەلایەن هەندێ تەریقەتی سۆفیزمی ئیسلامییەوە کراوە بەداردەست و برێ لە شێخانی تەریقەت بۆ چاکە و بەرژەوەندی خۆیان بەکاری دێنن.

لەم لایەنەوە دەبینین مەلا پەرێشان خۆی وەکو سۆفییێک دەخاتە بەرچاو لەوانەی لەژێر ڕۆشنایی ئایینزای شیعە شیعری سۆفیزمی بەرهەم دێنن بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن. ئەم ساقی نامەیەی مەلا پەرێشان نموونەی ئەو ئەدەبە بەرزەیە ئادەمزاد لە ڕێکخراوێک کۆدەکاتەوە مەستی خودایی ناسنامەیان پێ دەبەخشێ و هەموویان بۆ یەک هیوا و ئامانج دەژین.

ساقییا وەرە جامێ پەی مەستی
سوودم مەستییەن زیان ژ هەستی
جامێ کە مەغزم باوەرۆ وەجۆش
دونیا و مافیها بکەم فەرامۆش
نە ژەو بادەی بەزم حەریفان ڕەد
مەنهی مینەڵڵا موزەلیل خیرەد
مەستان مەجاز دێوەن مەس نیەن
هەوا پەرستان حەق پەرەس نیەن
ژەو بادەی بێ غەش خومخانەی دێرین
شێر مەرد ئەفکەن تەڵخ لەب شیرین
بدەر تا یەکجار پاک ژ گۆنا بووم
مەستی باوەڕۆ فەنا فیللا بووم



موسڵمانی کەر من تەشنەکامم
کافری زوهدم موریدی جامم
فیدات بام ساقی تەڕ زووانم کەی
من دەردەدارم دەوای گیانم کەی
ژ جام تەوحید یەکجار مەستم کەی
زەڕێ نابوودم بەڵکم هەستم کەی
بدەر بنۆشم وە یاد مەستان
پەنجەی ئیبلیس پێچ هەوا پەرەستان
ساقی پڕ بکە جام یەک مەنی
بەڵکە بگزەرم ژ ماو مەنی
تاکە بنۆشم وە یاد کەسێ
کە هەستی مەرگەن بێ ئەو نەفەسێ
یەک نەفەس وە ئەو گەر ڕووەڕووبووم
کافرم ئەگەر جۆیای مینوو بووم
چ حاجەت وە خولد حوور و قوسوورەن
من خود پەرەس نیم دۆسم مەنزوورەن
زاهید تۆ و حوور و بەهەشت بەرین
من و خاک کۆی دڵروبای دێرین
من وە ئاو عەشق خاکم سرشتەن
یەک جەفاش وەڵام چون هەشت بەهەشتەن
هەر تیرێ ژ شەست ساف دڵبەرەن
زەهر ژ میوەی تووبا خوەشتەرەن
بێ زەخم خەدەنگ موژەی دڵارام
نەنگەن پانیان وە سەحرای قیام
دەرعەین مەستیم بەڵکم یاریم کەین
نەوا بلەغزم نگەهداریم کەین

واتاکەی:

ئەی ساقی وەرە جامی مەستی و سەرخۆشیم بۆ بێنە

قازانج و سوودم لە مەستییە، هۆشیاری زیانم پێ دەگەیەنێ
جامێک مێشکم بهێنێتە جۆش
دونیا و ئەوەی تێیدایە لەبیرم بچنەوە
نە لەو بادەیەی بەزمی حەریفان (یاران) دەڕووخێنێ
خوا نەهی لێ کردووە و عەقڵ و هۆش تێک دەدا
مەستانی ناڕاست دێو و درنجن مەست نین
هەوا پەرستان حەق پەرست (خوا پەرست) نین
لەو بادەی بێ غەشی خومخانەی دێرینە
کە پیاو شکێن و زمان شیرینە
جامێکم بدەیە تا بەجارێ لە گوناە پاک ببمەوە
مەستی باوەڕۆ و لەناو خوادا بتوێمەوە
موسڵمانی بکە من تینووم
کافری زوهد و موریدی جامم
فیدات بم ئەی ساقی زمانم تەڕ بکە
من دەردەدارم تیماری گیانم بکە
لە جامی تەوحید بەجارێ مەستم بکە
بەڵکو بەوە زیندووم بکەیتەوە
پێم بیدە با بیخۆمەوە بەیادی مەستان
پەنجەی ئیبلیس پێچان و هەوا پەرستان
ئەی ساقی جامی شانازیم بۆ پڕ بکە
بەڵکو لە ئارەزووی شانازی لابدەم
بۆ ئەوەی بەیادی کەسێک بیخۆمەوە
کە ژیان بێ ئەو مەرگەساتە
جارێک ئەگەر لەگەڵ ئەو ڕووبەڕوو ببمەوە
کافرم ئەگەر لە دوای بەهەشت بگەڕێم
هیچ پێویستییێکم بەبەهەشتی خولد و حۆری و کوشک باڵەخانە نییە.
من خۆپەرست نیم، دۆستم دیارە
ئەی زاهید بۆ تۆ حۆری بەهەشتی بەرین



بۆ منیش خاکی مەنزڵی دڵبەری دێرین
من بەئاوی عەشق خاکم شێلڕاوە
خراپەی ئەو لەلای من وەک هەشت بەهەشتە
هەر تیرێک لە دەست و پەنجەی دڵبەر بهاوێژرێ
ژەهر لە میوەی داری تووبای بەهەشت خۆشترە
بێ برینی تیری (خەدەنگی) یاری دڵارام
مخابنە پێ بخرێتە بان دەشتی ڕۆژی قیامەت
لە سەردەمی مەستیمدا بەڵکو یارمەتیم بدەی
نەوەکو بخلیسکێم، چاوت لێم بێ!

مەلا پەرێشان هەندێ لە نەریتی ئایینی ئیسلام (ئایینزای شیعە) و وەسفی سۆفیزم و دژی دەروێشیزم و حیکمەتی ڕۆژهەڵاتی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە، بەکارهێنانی وشەی عەرەبی و زاراوەی ئیسلامی لە ڕووی ناوەرۆکی شیعری کوردییەوە بۆ یەکەمین جار لە شیعری ئەم کەڵە شاعیرەدا دەبینرێ. ئەگەر شیعری ئایینی یارسان کارێکی گەورەی کردبێتە سەر ئەدەبی کوردی لە بابەت پارێزگاری جەوهەرە خۆماڵییەکان لە ئەدەبی کوردیدا، مەلا پەرێشان زاراوەی عەرەبی ئیسلامی هێناوەتە ناو شیعری کوردییەوە، دیارە لە ڕووی کێش و قافیەشەوە (عەرووز) هێشتا ئەم جۆرە شیعرە لە کوردستان پەیدا نەبوو بوو، لە دواییدا یەکەم جار لە باکووری کوردستان لە سەدەی شازدەم و لە باشووری کوردستان لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم هاتە ناوەوە.

***

گرنگی بەرهەمی شیعری مەلا پەرێشان لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تێبینییانەی لامان پەیدا بوون لە ئەنجامی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لە شیعرەکانیدا، ئەو ڕاستیانە لامان دروست بوون لە بارەی ئەم شاعیرەوە لە کەم لە شاعیرانی هەموو نەتەوەیێک دەدۆزرێنەوە. بەرهەمی لەم بابەتەی مەلا پەرێشان لە لای شاعیرە گەورە و هەڵکەوتووەکان دەبینرێ کە وێنە و مانای داهێنراوی ئەوتۆیان دروست کردووە بوون بە دروشم و بۆ هەموو ڕۆژگار و سەردەمێک دەست دەدەن.

ئەگەر مەلا پەرێشان لە سەدەی چوارەمدا نەژیایە و بکەوتایە سەدەی نۆزدەم و بەرهەمەکەشی هەر ئەوە بوایە ئەوەی ئێستا لەبەر دەستمان دایە پێم وایە ڕۆژی ئەمڕۆ بەجۆرێکی دیکە هەڵمان دەسەنگاند، چونکە گەلێ لەو داهێنانە جوانکارییانەی لە سەدەی چواردەم بەزمانی کوردی وتوویەتی نەدەکەوتە بەر ئەو، ئەگەر لە سەدەی نۆزدەمدا بژیایە، لەبەر ئەوە پێویستە لەم لایەنەوە بایەخێکی تایبەتی بدرێتە بەرهەمەکانی، چونکە مەلا پەرێشان هەندێ وێنەی شیعری هەیە پێش شاعیرانی دیکەی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وتوویەتی، جا ئەگەر بە ڕێگەی ئیلهامی لە یەکچوونەوە بێ ( توارد الخواطر) ئەم وێنە و مانا داهێنراوانە بەر شاعیری دیکەی پاش ڕۆژگاری ئەو دەکەوتن.

بۆ دیاریکردنی جێگەی ڕاستەقینەی مەلا پەرێشان لە ئەدەبی کوردیدا پێویستە بە وردی لەم لایەنانەی بەرهەمی شیعری بکۆڵرێتەوە:

١- یەکەمین شاعیر بووە شیعری بۆ ئایینزای شیعەی ئیسلام بەکار هێناوە.

٢- دوور بووە لە لایەنی پراکتیکی سۆفیزم، واتە دەروێشیزمی ئیسلامی.

٣- پارێزگاری نەریتی دانانی شیعری کوردی کردووە وەک ڕەنگدانەوەیێکی شیعری میللی سەرزار (فۆلکلۆر).

٤- لە شیعرە پەروەردەییەکانیدا دەردەکەوێ شارەزای شەریعەت و ئایینی ئیسلام بووە، ئاگاداری مێژووی گێتیی پێش ئیسلام بووە.

٥- لە شیعرە هونەرییەکانیدا داهێنانی وێنە و مانای دیار و ئاشکرایە، ئەگەر بە چاوی سەدەی چواردەم تەماشای بکەین.

٦- زمانی کوردی دەوڵەمەند کردووە بەو وشە بێگانانەی ( بەتایبەتی عەرەبی) کە لە شیعرەکانیدا بەکاری هێناون.

٧- هەناسەی زیندووی هەمیشەیی بەشیعرەکانیەوە دیارن لەو حاڵەتەی ئەگەر وەربگێڕدرێنە سەر زمانێک لە نرخی هونەرییان کەم نابێتەوە.

کارێکی بەجێیە کۆتایی بەباسی شاعیر بهێنرێ بەهەندێ لەم قسە جوانانەی.

حەکیمانی فەلسەفە و ئیشراقی یۆنان
دەلیلی ڕاستی حەقیقەتی گیانن

***

ئەی ساقی وەرە جامی مەی و سەرخۆشیم بۆ بێنە
قازانج و سوودم لە مەستییە
هوشیاری زیانم پێ دەگەیەنێ
جامێک مێشکم بهێنێتە جۆش
دنیا و ئەوەی تێیدایە لە بیرم بچێتەوە

***

جامێکم بدەیە تا بەجارێ لە گوناه پاک ببمەوە
مەستی باوەڕ و لە ناو خوادا بتوێمەوە

***

فیدات بم ئەی ساقی زمانم تەڕ بکە
من دەردەدارم تیماری گیانم بکە

***



ئەی ساقی جامی شانازیم بۆ پڕ بکە
بەڵکو لە ئارەزووی شانازی لا بدەم
بۆ ئەوەی بەیادی کەسێک بخۆمەوە
کە ژیان بێ ئەو مەرگەساتە

***

ئەی زاهید بۆ تۆ حۆری و بەهەشتی بەرین
بۆ منیش خاکی مەنزڵی دلبەری دێرین
من بە ئاوی عەشق خاکم شێلراوە
خراپەی ئەو لای من وەک هەشت بەهەشتە

***

لە سەردەمی مەستیمدا بەڵکو یارمەتیم بدەی
نەوەکو بخلیسکێم، چاوت لێم بێ

***

دونیا و ئاخیرەت هەر دووکیان هەقن
ورد بینی گەرەکە، درشتی زیان بەخشە

***

## بەشی سێیەم

# ئێل بەگی جاف

**١٤٩٢م - ١٥٥٣م**

### ژیانی

ئێل بەگی جاف یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی بەرهەمی شیعرییان بووە هۆی ئەوەی بخرێنە گێتیی ئەفسانە و بەخاوەن موعجیزە و کەرامات و خوێندنەوەی دوارۆژ ناویان دەربچێ. بەم دیاردەیە ئێل بەگی جاف زیاتر چووە ناو دڵی میللەتەوە و بەیتەکانی ڕەنگدانەوەی هەست و نەستی خەڵکی بوون، لەبەر ئەوە بەدرێژایی مێژوو لە بزربوون ڕزگارییان بوو، بەڵام دەسکاریش کران و بەندی بێگانە و هەڵبەستراویش خرانە سەر ئەو بەیتانەی کە شاعیر خۆی هۆنیبووینەوە.

ئێل بەگی جاف لە ساڵی ١٤٩٢م لە شارەزوور لە بنەماڵەیێکی عەشرەتی جاف لەدایک بووە. وا باوە لە پێڕەوانی ئایینی یارسان بووە، ئەگەرچی شیعری ئایینیشی لەبەردەستدا نییە وەکو هەموو شاعیر و خوێندەوارانی ئایینی یارسان کە شاعیریەتییەکەیان بەشیعری ئایینییەوە بەستراوە. ڕێی تێدەچێ ئێل بەگی لەسەر باوەڕی ئایینی یارسان بووبێ، چونکە لە دەوروبەری ئەودا دەسەڵاتی بنەماڵەی سەفەوی فەرمانڕەوایی بەدەستەوەبوو، ئەو ڕۆژگارە ماوەی نەشونەمای ئایینی یارسان بوو. ئەوەی ئاشکراشە ئەوەیە کە بەشێکی زۆر لە ناوچە شاخاوییەکانی هەورامان و هەرد و پانایییەکانی شارەزوور تا پەیدابوونی شێخ سمایلی ولیانی (١٦٩٢ کۆچی دوایی کردووە) لەسەر ئایینی یارسان بووە.

شاعیری میللی ئێل بەگی سەرەتای خوێندنی لە شارەزوور بووە، ئینجا ماوەیێک گۆشەگیر بووە، لە پاشانا بۆ ڕێبەری ئایینی یارسان گەشتی بەغدا و ئێرانی کردووە. مشتومڕ و زۆرانبازی لە نێوان ئایینی یارسان و ئایینەکانی تر لە شارەزوور لە ناوەوە بووە، دوژمنانی یارسان ویستوویانە ئێل بەگی بکوژن، لەبەر ئەوە ڕای کردووە بۆ هەورامان و لەگەڵ یارسانان تێکەڵ بووە و لەوێ ژیاوە.

شاعیری ئەم ماوەیەمان ئێل بەگی لە ساڵی ١٥٥٣م کۆچی دوایی کردووە.

### بەرهەمی شیعری

ئەوەی لە ئێل بەگی مابێتەوە و لە گێتیی ئەدەبدا ئاشکرابێ و ناوی پێ دەرکردبێ، ئەو بەیتەیەتی کە بەناوی «کێ وەقەولی کێ دەکا»یە. ئەم بەیتە لە بابەتی شیعری میللییە، زمانی ساکار و ئاسانە، هەر ئەو زمانەیە کە خەڵکی لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بەکاری دەهێنن، بەڵام بەهێز و خوێندەوارانەیە، ئاوازی سووک و ڕەوانە. زمانی شیعری ئێل بەگی لە بنجدا دیالێکتی کرمانجیی خواروە، بەڵام هەوای



دیالێکتی گۆرانیی پێوە دیارە.

بەیتی ئێل بەگی لەسەر شێوەی بەند ڕێکخراوە، هەر بەندی بریتییە لە پێنج دێڕ، بەم جۆرە دەتوانین ئەم بابەتە شیعرە بە«پێنجین»ش ناوی ببەین. کێشی هەشت سیلابی خۆماڵییە، یەکێتیی قافیەی تێدایە. هەموو چوار دێڕی یەکەمی بەندەکان لەسەر یەک قافیەن، دێڕی پێنجەم نەبێ «هەر وا بووە و هەر وا دەبێ» لە هەموو بەندێکدا دووبارە دەبێتەوە. لە هەندێ لە دەسنووسەکاندا ئەو دێڕە شیعرە بەم شێوەیە دووبارە و سێ بارە بۆتەوە «هەر وا بییە و هەر وا دەوێ»، لێرەدا وەکو دەردەکەوێ دیالێکتی گۆرانی بەسەریدا زاڵە.

دەسنووسێکی زۆری بەرهەمی ئێل بەگی لە ناوەوەیە، لە ڕۆژگارانی جیاجیا نووسراونەتەوە، باوەڕ پێکراوترین دەسنووس ئەوەیە کە لە ساڵی ١٢٧١ھ/١٨٥٤م ڕوونووس کراوە، ئەمە ئەوە دەگەیێنێ کە ماوەی سێ سەد ساڵێک شیعرەکانی ئێل بەگی لەسەر زار پارێزراون، ئەگەر دەسنووسیشیان بووبێ ئەوا لەناوچوون.

کە بەیتی «کێ وەقەولی کێ دەکا» دەخوێنینەوە، بەگشتی بەرامبەر بەرهەمێک ناوەستین کە لە سەدەی شازدەم داهێنرابێ، بەڵکو بەرامبەر بەرهەمێک دەبین ئەدگاری نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمی پێوەیە. هۆی ئەمە بەلای ئێمەوە ئەوەیە کە ئێل بەگی ئەم بەیتەی لە سەردەمی ژیانی خۆی لە سەدەی شازدەمدا داناوە، ڕەنگە لەوەش درێژتر بووبێ ئەوەی ئێستا لەبەر دەستمان دایە، ئیتر لەبەر ئەوەی شیعرەکانی خۆش و ڕەوان بوون و ڕەنگدانەوەی هیوا و ئامانجی خەڵکی ساکاربوون، چوونە ناو دڵی میللەتەوە. بەدرێژایی مێژوو شتی دەرەوەی بێگانەی خراوەتە سەر و شتی ناوەوەی ڕەسەنی خۆی لێ کەوتووە، ئەگینا باوەڕ ناکرێ باس لە کەسان و ڕووداوی سەدەکانی داهاتوو بکا وەکو ڕۆژگارانی فەرمانڕەوایی نادر شا و کەریم خانی زەند و قاجار و پەهلەوی.

بەگشتی لەم بەیتەدا هەست بەبیروڕاییێکی داناییانەی کلاسیکیی کۆنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکرێ. هەروەها دووربینی و هەندێ لە خوێندنەوەی دوارۆژیشی تێدایە. هەر لەبەر ئەوەشە لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژووی گۆڕانی کۆمەڵ بەندی تازە لەلایەن خەڵکەوە هەڵبەستراوە و خراوەتە سەر بەیتەکە، ئەمە لەلاییێک، لەلاییێکی ترەوە جگە لەمە لە سەرانسەری بەیتەکە، جیاوازیی نێوان ئەو دەسنووسانەی لەبەردەستدان هەست دەکرێ دەسکاری زمانە ئەسڵییەکەی ئێل بەگی کرابێ، چونکە تا ڕادەیێک شەقڵی وشە و لێکسیکۆنی سێ سەد ساڵەی گۆڕانی زمانی کوردی پێوە دیارە، نەک تەنیا هی سەدەی شازدەم، بەتایبەتی لە ناوچەی شارەزوور. لەپاش بەراورد و وردکردنەوە و لێکدانی هەموو تێکستە دەسنووس و چاپکراوەکانی ئەم بەرهەمە بەنرخ و نایابەی ئێل بەگی گەیشتینە ئەو وێنەیەی لێرەدا بڵاوی دەکەینەوە:

دایکە دەڕۆم بۆ داڵەهۆ
کوێری دەکەم باوانی تۆ
ڕەفاقەتی گۆران بجۆ
کە بابی مەیلی من مە بۆ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ

کێ وەقەوڵی کێ دەکا
من بەقەوڵی گۆڕان دەکەم
قسە لەژێر هەوران دەکەم
هەمووی لە بۆ سۆران دەکەم
ئیتاعەتی دەوران دەکەم
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
ئەوسا ئەدای وەفا دەکەم
سەرم پڕ شۆڕ، سەودا دەکەم
تەماشایی دونیا دەکەم
ڕوو بەتووری سینا دەکەم
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
ئێران پڕ لە ئاگر دەبێ
حوکمی سوڵتان قاهیر دەبێ
ستەم لە خەڵق سادیر دەبێ
دەورە دەوری نادر دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
بەعەدەز نادر دەعوا دەبێ
ئێران پڕ لە غەوغا دەبێ
هەر کەس بۆ خۆی بە شا دەبێ
تا یەک لەکی پەیدا دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
ئاخر لکیچ فەنا دەبێ
لە دوای ئەویچ غەوغا دەبێ
قەجەر لە خۆی شەیدا دەبێ
ڕەفیقی بۆ پەیدا دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
دەوران بەدەست قەجەر دەبێ
تەیموور لەخەو خەبەر دەبێ
گەلێ سەران بێ سەر دەبێ



ئاشووب و شۆڕ و شەڕ دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
جیهان پڕ لە غەوغا دەبێ
ئەدا کەرێ پەیدا دەبێ
مونکیر گەلێ ڕیسوا دەبێ
فیتنە و شەڕێ پەیدا دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
چاپوک سوارێ دەنگ دەکا
سەیری شێر و پڵنگ دەکا
عالەم لە زاڵم تەنگ دەکا
هەر ساعەتێ سەد ڕەنگ دەکا
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
خاسان وەبێ وەتەن دەبێ
مورغان دوور لە چەمەن دەبێ
شاهان وەبێ کەفەن دەبێ
دەوران وەکامی زەن دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
تەیرێ وەک ڕەعد و بەرق دەبێ
گوێچکەی لەدووکەڵ غەرق دەبێ
دەشت و دەری پێ لەق دەبێ
بەڕووی هەوا مۆڵەق دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
ڕەخشی ڕۆستەم ئیزهار دەبێ
ئەسپی ئاسن ڕەهوار دەبێ
دوڵدوڵ شەودێز بەکار دەبێ
گەلێ شت ئاشکار دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
هەمووی شاهان بێ ڕا دەبێ

لە پڕ شەڕ و هەرا دەبێ
کەم خەڵق وە حوکمی شا دەبێ
چەرخ و چرا وە پا دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
ئێل بەگی دی دڵگیر دەبێ
فەرەنگستان زنجیر دەبێ
ئێران و ڕۆم نەخچیر دەبێ
ئەوسا فەزا تەسخیر دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
دەورەی قەجەر قڕان دەبێ
سەر لە مەیدان فڕان دەبێ
ئەساسی هەق قورئان دەبێ
قاتی بەشی شاران دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
دەور دەوری پالەوی دەبێ
دەستی فرە قەوی دەبێ
با دەستی ئەجنەوی دەبێ
بیدعەت لەگەڵ نەوی دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
بەعەدەز ڕەزا غەزا دەبێ
بەعەدەز غەزا فەزا دەبێ
ڕەزا بەناو ڕەزا دەبێ
وەک ماری نارەزا دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
شۆڕشی ئێرانی دەبێ
سەر جۆشی گرانی دەبێ
خەیلی مەردان فانی دەبێ
ڕەفی دوو سێ گیانی دەبێ



هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
ماه ڕوویانی دەوڵەتی
بادە خۆرانی خەڵوەتی
کۆتا لیباس و سەرپەتی
جامە سپی و خەت خەتی
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
مەرد و زەنی سفید پۆش
مایل بەبەزم و عەیش و نۆش
سەما بۆ مەستیی و خرۆش
بێ شەرەف و نامووس فرۆش
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
دەوران دەوری ئیجبار دەبێ
ژن لە شووی خۆی بێزار دەبێ
کوڕ لە بابی فیرار دەبێ
دەورە پیاوی بێ عار دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
مەردان مەردی گەزاف دەکەن
هەم وەڕاستی خەلاف دەکەن
قسان بەتیر قەلاف دەکەن
بەڕێگەی دوور مەساف دەکەن
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
مەردم بێ نام و نەنگ دەبێ
کوڕ وەکو کچ قەشەنگ دەبێ
شەریکی شورب و بەنگ دەبێ
مەردی قەدیم دڵتەنگ دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
ئاتەش شکەم و ئاهنی پا
هەر ساعەتی سەد فەرسەخ ڕا

دوود بەرگووش و بەرمەلا
چاپوک سوار و بێ سەدا
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
خانەدانان ناقیس دەبێ
عەهدیان نا دروس دەبێ
سککەی زەڕیان وەمس دەبێ
نیوەی ئێران ئوروس دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
ئێران وەکو فەرەنگ دەبێ
میلیان بەشۆخ و شەنگ دەبێ
مەردی عالەم دڵتەنگ دەبێ
ڕێگەی نەجات تفەنگ دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
سەر نەقشی سەر نیگار دەبێ
پیاوی باشیان پیوار دەبێ
هەر ساعەتێ گوزار دەبێ
بانگی چاپوک سوار دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
کاری باتیل خەیلی دەبێ
دەوری ناقە لەیلی دەبێ
هەر قەترە وەسەیلی دەبێ
ژیان بەکەم مەیلی دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
گولبانگی جمهووری دەبێ
تاعەت بەمەجبووری دەبێ
بازاڕی پڕ نووری دەبێ
مەخلووق نوو زهووری دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ



خەڵقی زمان هۆشیار دەبێ
نا هەموواری هەموار دەبێ
جەبری حاکم موختار دەبێ
ماوای زاڵم مەزار دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
تیغی شەهان گشت کول دەکەن
سالاری ئەو پل پل دەکەن
شێخان شەهان بسمل دەکەم
تەرمەی وەزیران جل دەکەن
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
مەخلووق لە شین و وەی دەبێ
نالە و نەوایی نەی دەبێ
هەر کەس بکوژرێ حەی دەبێ
قەبیلەی جوانان ڕەی دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
خەیلی دڵم و تەنگ دەبێ
سەدای تۆپ و تفەنگ دەبێ
مەردی ماقووڵ بێ دەنگ دەبێ
بەمیسلی چووب و سەنگ دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
زوڵم و ستەم پامال دەبێ
بانگی بیلال زوڵاڵ دەبێ
حیلە و فریب بەتاڵ دەبێ
زوڵم و زاڵم زەواڵ دەبێ
هەر وا بووە و هەر وا دەبێ
مایەی ژیان سەختی دەبێ
سەر جۆشی بەدبەختی دەبێ
ماتەم لەبەر نەختی دەبێ

تەبدیل بەخۆشبەختی دەبێ

هەر وا بووە و هەر وا دەبێ

لە خۆت مەزانە ئەم قسە

بەڵکوم قسەی فەریاد ڕەسە

ئەسراری پڕ مولابەسە

سەدایی سووڕ و جەرەسە

هەر وا بووە و هەر وا دەبێ

ئێل بەگی جاف وەک مرۆڤێکی شاعیر و خاوەنی ئەم بەرهەمە شیعرییە ڕەنگینە کەلێنێکی گەورەی لە ئەدەبی کوردیدا پڕ کردۆتەوە. هەرچەندە ژیانی خۆی و ئەم بەیتەی لە ئەفسانە بەدوورنین، بەڵام مایەی دەوڵەمەندکردنی ڕۆشنبیری نەتەوەن، خۆی وەک کەسایەتییێکی میللی و شیعرەکانی وەک نموونەییێکی شیعری فێرکردن و پەروەردەیی جێگەی دیاریان هەیە لەناو دڵی میللەت و لە مەیدانی خوێندەواری و ڕۆشنبیریی نەتەوەدا.

## بەشی چوارەم

# بێسارانی

**١٦٤٣ - ١٧٠١**

### هەندێ لایەنی ژیانی شاعیر

ناوی شاعیری ئەم ماوەیەمان مستەفا کوڕی قوتبەددین کوڕی شەمسەددین، خۆی و باب و باپیرانی مەلازادەن. باوکی بە مەلا قوتبەددینی عەرەب ناوبانگی دەرکردووە چونکە مەلایێکی بەدیمەن و عەرەبی زانێکی باش بووە بۆیە خەڵکی بەناوی قوتبەددینی عەرەب ناسیویانە.

مستەفا لە ساڵی ١٦٤٣ لە گوندی بێساران لە دایک بووە. بێساران ئاواییێکە لە ناوچەی ژاوەڕۆ لە نێوان هەورامانی تەخت و گاوەڕۆ دایە. بەپێی نەخشەی جوگرافی ئەمڕۆ بێساران کەوتۆتە ناوچەی ژاوەڕۆی ناحیەی سەڵۆئاوای شارستانی مەریوانی سەر بەئوستانی کوردستان (سنە)یە.

بەپێی نەریتی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەی کوردەواری مستەفا وا ئامادە دەکرێ ببێ بەمەلا. بۆ ئەم ئامانجە چۆتە حوجرە و بەرنامەی خوێندنی بەرایی تەواو کردووە، لە ڕۆژگارانی فەقێیەتی و سوختەیی خوێندنی لە ئاواییەکانی نۆدشە و پایگەلان و بێساران بووە، قۆناغی تەواوکردنی خوێندنی حوجرەی لە سنە بووە، هەر لەوێش ئیجازەی دوازدە زانستییەکەی مەلایەتی وەرگرتووە و بە مەلا مستەفای بێسارانی لە کۆمەڵی کوردیدا ناسراوە، وەک شاعیریش «بێسارانی» بووە بەنازناوی شیعری.

بێسارانی زۆربەی ژیانی فەقێیەتی لە پایگەلان بردۆتەسەر، بەڵام لە دوای تەواوکردنی خوێندن بەیەکجاری لە بێساران نیشتۆتەوە و خەریکی مەلایەتی بووە. لە نێوەندی ئەدەبیدا هەواڵی وا لە ناوەوە هەیە بێسارانی سۆفیی تەریقەتی خەڵوەتی بووبێ، هەروەها گۆیا ئەم تەریقەتە لە سەدەی حەڤدەمدا لە ناوچە کوردییەکانی ئێران باو بووە، بەتایبەتی ناوچەی سنە کە لە دێرزەمانەوە ناوی جوگرافی «کوردستان» بووە و فەرمانڕەوایی سەربەخۆ و نیوە سەربەخۆی بووە.

لەو سەردەمەی شاعیر لە گوندی پایگەلان ژیاوە حەزی لە کچێک کردووە ناوی ئامینە بووە، ئەم کەنیشکە هەورامانییە کیژی شێر محەمەدی پایگەلانی بووە و هیچ بەڵگەیێکیش بەدەستەوە نییە ئامینەی خواستبێ و بووبێتە هاوسەری، بەڵام بێگومان ئیلهامی شیعری داوەتێ.

ڕۆژگارانی دوایی ژیانی شاعیر و پێش مردنی لە مەڵبەندی خۆی بێساران بووە تا لە ساڵی ١٧٠١ هەر لەجێی لە دایکبوونی کۆچی دوایی دەکا و لە گۆڕستانی پیرەهەژارەدا دەنێژرێ، ئەم گۆڕستانە دەکەوێتە ڕۆژئاوای مەحموودئاوای دووڕۆ، واتە نێوان تەرخان ئاوا و مەحموودئاوا. ئێستا ئەم گۆڕستانە کەوتۆتە لای باشووری ئەو ڕێگەیەی لە سنەوە بۆ مەریوان دەچێ.



### خاسیەتی شیعری بێسارانی

بێسارانی ڕۆشنبیر و مامۆستاییێکی دیاربووە لە کۆمەڵدا، لە نێوەندی ئەدەبی و ڕۆشنبیری پایەیێکی بەرزی بووە، شاعیرانی پاش خۆی ڕێزیان لێ ناوە و بەشاعیری هەڵکەوتوو ناویان بردووە، لەوانە شاعیری ناودار مەولەوی (١٨٠٦ - ١٨٨٢) بەشاعیری پلە بەرز حسێبی کردووە.

شیعری بێسارانی بەگشتی لە ڕووی ڕوخسارەوە لەسەر کێشی دەکەرتی (سیلابی) دانراوە، بەزۆریش وەستان لە ناوەڕاست دەبێ (-ب--ب/-ب ب -ب)، لە ڕووی قافیەشەوە جووت قافیەیە (مەسنەوی) (اا، ب ب، ج ج...).

هەروەها بەزۆری نیوەدێڕی یەکەمی هەموو پارچە شیعرێک، تەنیا لە پێنج کەرت پێکدێ. هەندێ جار وەکو خۆی دەمێنێتەوە هەندێ جاری دیکەش هەر ئەو پێنج کەرتە دووبارە دەکرێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە نیوەدێڕی تەواو وەکو:

چـراغ نـە دڵـەن ..................

هەر کـەس غـەریبـەن هەر داغ نە دڵەن

یا:

چـراغ نـە دڵـەن چـراغ نـە دڵـەن

هەر کـەس غـەریبـەن هەر داغ نە دڵەن

یەکێ لە خاسیەتە تایبەتییەکانی شیعری بێسارانی بەڕاستی نموونەی ئەو جۆرە شیعرەیە کە لیریکی پێ دەڵێین، واتە شیعرەکانی کورتن ژمارەی دێڕەکانیا کەمە، لەناو پارچە غەزەلەکانیدا لە سێ دێڕە شیعرییەوە (هەر دێڕی دوو نیوە دێڕە) تا دە دێڕە شیعری دەبینرێن.

ناوەڕۆکی شیعری بێسارانی بەگشتی خەریکی قەشەنگی دلبەر و جوانی سروشتە، بەجۆرێک تێکەڵی یەکتری کردوون کارێکی قورسە پیاو بزانی مەبەسی سەرەکی ئەو شیعرە چییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ مەبەسی لێکۆڵینەوە و ناسینی پسپۆڕییەتی شاعیر دەتوانین شوێنەواری دڵداری و هەندێ سۆفیزم (عیرفانی) و بڕێکیش کۆمەڵایەتی بدۆزینەوە، دیارە لەناو ئەمانەدا شیعری بەشە دڵدارییەکە لە هەموویان زیاترن.

بێسارانی وشە و تەعبیری شیعرەکانی لە ناسکی سروشتی هەورامان وەرگرتووە، وشە ناسکەکانی زمانی کوردی ڕەنگدانەوەی سروشتی دڵڕفێنی هەورامانە، شیعرەکانی لە خوێندنەوەدا سەمادەکەن، پێویستییان بەدەنگ خۆش نییە چونکە لە خوێندنەوەدا دەبن بەچڕین و گۆرانی. جۆرێکن لەو شیعرە گەردوونییانەی هەزاران هەزار ساڵ مرۆڤی کۆنی ئەشکەوت بەگۆرانی وتوویانە تا ئێستاش زیندوون.

### چەپکە گوڵی دیوانی بێسارانی

ئەوی ڕاستی بێ گوڵبژێرکردنی دیوانی بێسارانی کارێکی ئاسان نییە، ئەگەر بمانەوێ شیعری دڵگیر

١٣- خوسرەو ئامۆژگاری لە کچی قەیسەر دەخوازێ لە بارەی خوازبێنیی شیرینەوە.
١٤- خوسرەو شاپوور دەنێرێ بۆ لای شیرین.
١٥- شاپوور حیکایەتی فەرهادی بەردتاش بۆ شیرین دەگێڕێتەوە.
١٦- دروستکردنی جۆگای بەردین لەلایەن فەرهادەوە بۆ شیرین.
١٧- لە باسی دڵداری فەرهادی کێوهەڵکەن بەرامبەر بەشیرینی ئەرمەن.
١٨- خوسرەو هەواڵی دڵداریی فەرهاد دەبیستێ.
١٩- دیالۆگی خوسرەو لەگەڵ فەرهادی کێوهەڵکەن.
٢٠- لەبابەت تێکۆشینی فەرهاد لە هەڵکەندنی کێوی بێستوون و تەلاشکردنی لە خۆشەویستیی شیریندا.
٢١- چوونی شیرین بۆ کێوی بێستوون و بینینی فەرهاد.
٢٢- چوونی شیرین بۆ کێوی بێستوون بۆ ئایینی ناشتنی فەرهاد.
٢٣- نامە نووسینی خوسرەو بۆ شیرین لە بارەی مەرگی فەرهادی کێوهەڵکەنەوە و پەشیمان بوونەوەی لە کردەوەی خۆی.
٢٤- کۆچی دوایی مریەمی ژنی خوسرەو و کچی قەیسەر.
٢٥- بەزمی شایی گواستنەوەی شەکەری ئەسفەهانی بۆ خوسرەو.
٢٦- ڕاووشکاری خوسرەو و گەیشتنی بەقەسری شیرین.
٢٧- مارەکردنی شیرین لە خوسرەو.
٢٨- گواستنەوەی شیرین بۆ خوسرەو.
٢٩- خەونی خوسرەو بەپێغەمبەرەوە و گێڕانەوەی خەونەکە بۆ شیرین.
٣٠- حەزکردنی شێرۆ لە شیرین و سەرەتای پیلان دانان بۆ کوشتنی باوکی.
٣١- چوونی شێرۆ بۆ سەر جێگەی خوسرەو لە خەودا و کوشتنی بەخەنجەر.
٣٢- شوشتن و پاککردنەوەی لەشی خوسرەو لە خوێن لەلایەن شیرینەوە.
٣٣- دانیشتنی شێرۆ لەسەر تەختی شاهی لە دوای لەناوچوونی خوسرەو.
٣٤- شێرۆ ویستی شیرین بێنێتە مەجلیسی خۆی، نەهاتنی شیرین وای کرد بەزۆر بیهێنن.
٣٥- گفتوگۆکردنی شێرۆ لە مەجلیسدا لەگەڵ شیرین.
٣٦- هەڵخەڵەتاندنی شێرۆ و هێنانەدی وەسیەت و ڕاسپاردەکانی شیرین.
٣٧- چوونی شیرین بۆ گەرماو بەناوی خۆڕازاندنەوە بۆ شێرۆی نامەرد، بەڵام لە بنجدا بۆ خۆکوشتن بوو بێ ئەوەی شێرۆ ئاگای لەم کارەبێ.
٣٨- هاتنی کەنیزەکان بۆ لای شیرین، شیرین دڵتەنگی خۆی بۆیان دەربڕی.
٣٩- خۆکوشتنی شیرین لەسەر گۆڕی خوسرەو.
٤٠- گەیشتنی هەواڵی مەرگی شیرین بۆ شێرۆ، شێرۆش لە داخانا خۆی کوشت.



**نویشکی ناوەرۆکی «شیرین و خوسرەو»**

نەوشیروانی شاهی شاهان کوڕێکی هەبوو ناوی پەروێز بوو، لە پاش کۆچی دوایی نەوشیروان، پەروێز لەسەر تەخت دانیشت. ئەم شاهە تازەیە هیچ جۆرە کەموکوڕی و گیروگرفتێک لە ژیانیدا نەبوو تەنیا کوڕێک نەبێ لە بارەگایدا ببێتە میری وڵات و لەدواییدا لەسەر تەخت لە جێی دانیشێ. ئەم ئاواتەی هاتە دی و کوڕی بوو و ناوی نا خوسرەو.

بۆ پەروەردەکردن و فێرکردنی خوێندەواری و فەرمانڕەوایی و بەڕێوەبردنی دەوڵەت زانایێکی وەکو بوزورگ ئومێد بۆی دەسنیشان کرا، بەم جۆرە کەسێکی زیرەک و زانا و زۆرزانی لێ کەوتەوە.

ڕۆژێ لە ڕۆژان خوسرەو لەگەڵ هەندێ لە یاوەرانی دەچێتە ڕاووشکار. ئێوارە لادەدەنە گوندێک شەو بەبەزم و ڕەزم و ئاهەنگ دەبەنە سەر. لەو سەیرانەدا یەکێک لە یاوەرەکانی ڕوودەکاتە ناو ڕەزی کابرایێک و هەندێ بەرسیلە دەڕنێ. لە دوای کۆتایی ڕاو و سەیرانەکە هەواڵی ئەم ڕووداوە بەر گوێی پەروێزی باوکی خوسرەو دەکەوێ. پەروێز زۆر لێی تووڕە دەبێ و فەرمان دەردەکا دوو پێی ئەسپەکەی ببڕنەوە و زین و لغاوەکەشی بدەنە خاوەن باخەکە و نینۆکی یاوەرەکەی خوسرەویش بکێشن. خوسرەو ئەم کارەی پێ ناخۆش دەبێ و دەست دەکا بەگریان و داوای لێبوردن لە باوکی دەکا، گەورە پیاوان دەکەونە ناوبژی و تکا لە پەروێز دەکەن لە خوسرەو خۆش بێ.

شەوێکیان خوسرەو خەون بەنەوشیروانی باپیریەوە دەبینێ، لە خەونەکەدا دڵی دەداتەوە و لەباتی ئەسپە پێ بڕاوەکە ئەسپێکی چاکتری پێشکێش دەکا، هەروەها کچێکی جوانی دەداتێ و مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژیشی بۆ دەڕەخسێنێ.

ئەم خەونە خوسرەو دڵشاد و گوشاد دەکا. لە بارەگای خوسرەودا شاپوور ناوێک دەژی، وێنەکێشێکی (هونەروەری شێوەکار) زیرەک دەبێ. ڕۆژێکیان بۆی دەگێڕنەوە لە ناوچەی مەهستان، لای زەریاچەی دەربەند (زەریای خەزەر یا قەزوین) شاژنێک هەیە ناوی بەزمانی ئەرمەنییە شەمیرا، لای ئێمە مەهین بانووی بێ دەڵێن، ژنێکی پایەبڵندە، ژیانی بەبێ هاوسەر دەباتە سەر، برازایێکی هەیە، کچێکی شۆخ و شەنگە، ناوی شیرینە، ئەوەندە بەسەر جوانی ئەودا هەڵدەڵێن بەبێ ئەوەی خوسرەو چاوی پێی بکەوێ حەزی لێ دەکا و بەکوڵ گیرۆدەی دەبێ.

خوسرەو داوا لە شاپووری هونەروەر دەکا بۆ ئەوەی بچێ بۆ وڵاتی مەهستان و شیرین بدۆزێتەوە و مەسەلەی خوازبێنی بۆ بڕەخسێنێ. شاپوور لە دوای گەڕانێکی زۆر و بە پرس شوێنی شیرین دەدۆزێتەوە. وێنەیێکی خوسرەو دەکێشێ بەدارێکدا لەسەر ڕێگەی شیرین هەڵی دەواسێ. شیرین لە ڕێگەی ڕاووشکاریدا چاوی بەوێنەکە دەکەوێ، یەکسەر داوا دەکا بۆی بێنن. بەبینینی وێنەکە حەزی لێ دەکا. کەنیزەک و دەستە خوشکان لەوە دەترسن مەسەلە کاری دێو و درنج و جنۆکە بێ، بۆیە وێنەکە لەناودەبەن و دەگەڕێنەوە.

شاپوور کە ئەمە دەبیستێ بۆ جاری دووەم وێنەی خوسرەو دەکێشێتەوە و ئەمجارەیان لە نزیکی

هەوارگەی شیرین هەڵی دەواسێتەوە. شیرین کە ئەمەیان دەبینێ زیاتر هۆگری دەبێ. یاوەرەکانی ئەمجارەش وێنەکە ون دەکەنەوە و ئەو شوێنەش چۆل دەکەنەوە، شاپوور کۆڵ نادا بۆ جاری سێیەم وێنەی خوسرەو دەکێشێتەوە و بەدارا هەڵی دەواسێتەوە. دیسانەوە کە شیرین چاوی پێی دەکەوێ بەجارێ پەرێشان دەبێ و کەم دەمێنێ لە هۆش خۆی بچێ. یاوەرەکانی لەوە دەترسن ئەنجامی ئەم کارە خراپ بکەوێتەوە، لەبەر ئەوە هیچیان بۆ نامێنێ ئەوە نەبێ دەست بەبەزم و ڕەزم و ئاهەنگ بکەنەوە. کەچی ئەم کارە وێنەی خوسرەو لە خەیاڵی شیرین ناسڕێتەوە. لەم دیمەنەدا شاپوور خۆی لە پەنایێکدا دەشارێتەوە، لەگەڵ یەکێ لە کەنیزەکانی شیرین قسە دەکا، هەواڵی وێنە و خاوەن وێنەکەیان تێ دەگەیەنێ. لە پێشانا قسەکانی شاپوور بۆ شیرین دەگێڕنەوە، شیرین ناچار دەبێ بچێ بۆ لای شاپوور بۆ ئەوەی هەموو شتێک لەم بابەتەوە بزانی. باس لە دڵداری خوسرەوی بۆ دەکا.

شیرین بیر لەوە دەکاتەوە چۆن بگاتە خوسرەو. بۆ ئەمە مۆڵەت لە پووری وەردەگرێ. ئیتر سواری شەودێز دەبێ بۆ ئەوەی بچێ بۆ دەرەوە لە پڕ ئاوزەنگ لە وڵاغی دەدا و لە کەنیزەکان جیا دەبێتەوە، هەرچەندە هەوڵ دەدەن بیگەنێ بۆیان ناکرێ، ناچار بەنائومێدی، دەگەڕێنەوە لای مەهین بانووی پووری و بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕنەوە.

شیرین کە لە کەنیزەکان جیادەبێتەوە لادەداتە سەروچاوەی کانیاوێک بۆ مەلەکردن. خوسرەویش بەکوڵ چاوەنۆڕی ئەوە دەبێ شاپوور هەواڵی تازەی شیرینی بۆ بێنێ. لەوکاتەدا بەهۆی پیاو خراپانەوە ناخۆشی دەکەوێتە نێوان کوڕ و باوک. باوک فەرمانی بەندکردنی کوڕی دەردەکا. بزورگ ئومێدی مامۆستای پێشنیاز دەکا خۆی بشارێتەوە، بۆیە بڕیار دەدا ڕوو لە ئەرمەنستانی مەڵبەندی شیرین بکا. پێش ئەوەی بکەوێتە ڕێ پیاوەکانی تێ دەگەیەنێ ئەگەر کچێکی وا هات جێگە و ڕێگەی باشی بۆ ئامادە بکەن. مل دەنێتە ڕێگە، لە پڕ دەگاتە سەروچاوەی ئەو کانیاوەی شیرین تێیدا خەریکی مەلە دەبێ. لەجێیێکی نادیارەوە سەیری دەکا، لە جوانییەکەی بێ هۆش دەبێ. کە شیرین هەست بەبوونی ئەو دەکا لەوێ لە ئاو دێتە دەرێ و جلەکانی لەبەر دەکاتەوە و سوار دەبێ و پشتی تێ دەکا. کەسیان لەوە دڵنیا نابێ ئەوەی چاوی پێ کەوتووە، ئەو کەسەیە کە خۆشی دەوێ. هەر یەکەیان بەمەزەندە بۆ مەسەلەکە دەچێ. ئیتر شیرین دەگاتە مەدائین و خوسرەویش دەگاتە ئەرمەنستان. پیاوانی خوسرەو شیرین دەناسنەوە، هەموو کاروبارێکی ژیانی ئەوێی بەچاکی بۆ جێبەجێ دەکەن. بەم جۆرە ئەو ڕۆژانە بەچاوەنۆڕی خوسرەو دەباتە سەر.

لەولاشەوە کە خوسرەو دەگاتە «بەردەع»ی قشلاقی مەهین بانووی پووری شیرین، بەگەرمی پێشوازی لێدەکەن لەو ماوەی کە لەوێ دەمێنێتەوە.

لە دوای چاوەنۆڕییێکی زۆر شیرین لە مەدائین بێ هەوەس دەبێ و ئارەزووی ئەوە دەکا بگوێزرێتەوە جێگەییێکی دیکە. بۆ ئەم مەبەسە لە شوێنێک خانووی بۆ دروست دەکەن. ئێستا ئەو جێیە ناوی «قەسری شیرین»ە. هەرچەندە شوێنەکەی پێ خۆش نابێ، بەڵام بۆ مەبەسی چاوەنۆڕی ناچار دەبێ تێیدا بژی.

لە بابەت هەواڵی خوسرەوەوە شەوێکیان لە دیوەخانی خۆیدا لەگەڵ یارانی کۆڕی خۆشی و ڕابواردن



دەبەستن. شاپوور هەواڵی بینینی شیرینی بۆ باس دەکا و تێی دەگەیەنی ڕەنگە شیرین لە مەدائین بێ. خوسرەو ئەمەی پێ خۆش دەبێ، دەستبەجێ بڕیار دەدا شاپوور بچێتەوە مەدائین بەدوای شیرین، ئەم هەواڵەش بەمەهین بانوو دەگەیەنێ. شاپوور سواری «گوڵ گوون» دەبێ بەرەو مەدائین دەکەوێتە ڕێ و خۆی دەگەیەنتە کۆشکەکەی شیرین، لە دواییدا هەردووکیان پێکەوە دەگەڕێنەوە ئەرمەنستان.

لەو ماوەیەدا پەروێزی باوکی خوسرەو کۆچی دوایی دەکا، کە هەواڵ دەگاتە خوسرەو بۆ مەدائین دەگەڕێتەوە. ئەو کاتە دەزانێ شیرین لەگەڵ شاپوور گەڕاوەتەوە ئەرمەنستان، ئەمەی زۆر پێ ناخۆش دەبێ. شیرین لە ئەرمەنستان پێشوازییێکی پڕ لە شکۆی بۆ دەکرێ و لەگەڵ پووری بەیەکتری شاد دەبنەوە.

خوسرەو لەسەر تەختی شاهانە دادەنیشێ، لە دوای ماوەییێک بارام چۆبین کە یەکێ بووە لە سەرکردەکانی لەشکری لێی یاغی دەبێ، پیلانێک دادەنێ بۆ گرتنی، ئیتر بۆ ئەم مەبەسە لەگەڵ هەندێ لە سەرکردەکانی سوپادا دەدوێ. خوسرەو ئەوەی بۆ ئاشکرا دەبێ کە دەسەڵاتی کزبووە، کەسی وا نەماون یاریدەی بدەن، لەبەر ئەوە ناچار دەبێ خۆی دەرباز دەکا و بەرەو ئەرمەنستان دەکەوێتە ڕێ.

لە ڕێگەی سەفەری ئەرمەنستان خوسرەو تووشی شیرین دەبێ لەکاتی سەیران و ڕاووشکاردا، بۆ یەکەم جار چاویان بەیەکتری دەکەوێ و بەشادی دەگەڕێنەوە بۆ دیوەخانی مەهین بانووی پووری شیرین. مەهین بانوو پێشوازییێکی گەرمیان لێ دەکا و خوسرەو لەوێ نیشتەجێ دەبێ، بەڵام مەهین بانوو لەوە دەترسێ خوسرەو پێش ئەوەی خوازبێنی شیرین بکا هەڵی بخەڵەتێنی، لەبەر ئەوە ئامۆژگاری دەکا وریای خۆی بێ. ژیانی پێکەوەییان بەدڵی خوسرەو نابێ چونکە شیرین لە هەموو شتێکدا بەقسەی ناکا و لە ڕووی دەوەستێ.

لەم ماوەیەدا شیرین و خوسرەو لە نزیکەوە لەگەڵ یەکتریدا دەژیان و سەیران و ڕاووشکاریان پێکەوە دەکرد. جارێکیان لەڕاوێکدا شێرێک هێرشیان بۆ دەبا. خوسرەو بەمستەکۆڵە دەیکوژێ و فەرمان دەردەکا پێستەکەی بگوروون. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی زیاتر بەدڵی شیریندا دابچێ، بۆ یەکەم جار ماچێکیشی دەداتێ.

وا ڕێک دەکەوێ شیرین لەگەڵ کەنیزەکانی دەچنە دیوەخانی خوسرەو. پێش ئەوە ئامۆژگارییان دەکا بەدەم ئاواز و مۆسیقاوە ئەو شیعرانە بچڕن کە لە عەشقی شیرین و خوسرەو دەدوێن بۆ ئەوەی خوسرەو زیاتر گیرۆدەی شیرین ببێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شیرین بەڕەقی گفتوگۆی لەگەڵدا دەکا و هیچ جۆرە بایەخێکی پێ نادا، چەندوچوون دەکەوێتە نێوانیانەوە، دیالۆگیان بێ ئەنجام دەبێ، تا مەسەلەکەیان دەگاتە ئەوەی شیرین تانەی لێ دەدا و پێی دەڵێ تەخت و تاراجی داگیرکراوە، ئەگەر پیاو بوایە پێش هەموو شتێک تەخت و تانجەکەی دەست دەخستەوە پێش ئەوەی خۆی بەدڵدارییەوە خەریک بکا. خوسرەو ئەمەی پێ ناخۆش دەبێ، بەزیزبوون ئەوێ بەجێ دێڵێ بەرەو وڵاتی ڕۆم دەکەوێتە ڕێ و یارمەتی لە قەیسەر داوا دەکا بۆ ئەوەی لەشکری بداتێ و بڕوا فەرمانڕەوایی بارامی چۆبین بڕووخێنی و تەخت و تانجی خۆی دەست بخاتەوە، قەیسەری ڕۆم بەپیریەوە دەچێ و لەشکری دەداتێ بۆ ڕووخاندنی دەسەڵاتی بارام و هەروەها مریەمی کچیشی لێ مارە دەکا. جەنگێکی قورس دەکەوێتەوە لە ئەنجامدا خوسرەو

سەردەکەوێ و دەگەڕێتەوە سەر تەخت و تانجی خۆی و دەست دەکاتەوە بەفەرمانڕەوایی.

لەگەڵ ئەوەی خوسرەو خاوەن ژن بوو و ئەو ژنە مریەمی کچی قەیسەری ڕۆم بوو بەڵام دڵی هەر بۆ شیرین لێی دەدا و حاڵی ناوەوەی سایکۆلۆجی دەروونی خراپ بوو. شیرینیش شەو و ڕۆژ لەژێر باری غەم و پەژارە دەتلایەوە و بۆ چارەڕەشی خۆی دەیلاواندەوە.

لەو ماوەیەدا مەهین بانووی پووری شیرین کۆچی دوایی دەکا، تەختی شاهی بەشیرین دەسپێرێ، بەڵام ئەم مەقامە بەرزە دەردی تیمار ناکا و خوسرەو لەناو دڵ و دەروونیدا ناسڕێتەوە. دەتوانێ بۆ ماوەی ساڵێک هێمنی خۆی بپارێزێ، ئیتر لە وزەیدا نامێنێ و ڕێی مەدائین دەداتە بەر خۆی، لەوێ هەواڵی گەیشتنی شیرین بەخوسرەو دەگەیەنن، دیارە لە ترسی مریەمی خێزانی ناتوانێ لێی نزیک ببێتەوە. شیرین لەو کۆشکەی بۆی دروست کرابوو نیشتەجێ دەبێ.

لەو ماوەیەدا بارامی چۆبین کۆچی دوایی دەکا. خوسرەو ڕاوێژکارانی کۆ دەکاتەوە، بەدەم وا دەردەبڕێ مردنی بارامی پێ ناخۆش بووە، بەڵام ئەوی ڕاستی بێ ئەم هەواڵەی پێ خۆش دەبێ و ئاهەنگی شادی دەگێڕێ و لەو کۆڕی گوشادییەدا باربودی گۆرانیبێژی ناودار گۆرانییان بۆ دەچڕێ.

ئەڤینی شیرین وا لە دڵی خوسرەودا دەچەسپێ ڕاستەوخۆ داوا لە مریەم بکا بەوە ڕازی بێ شیرین بخوازی بۆ خۆی، بەڵام مریەم سوور دەبێ لەسەر ئەوەی نابێ بەهیچ جۆرێ بیر لەوە بکاتەوە. خوسرەو ناتوانێ دەسەڵاتی دەوڵەتی بەقوربانی خۆشەویستی بکا، لەبەر ئەوە جار ناجار هەواڵی شیرین دەپرسێ. بێگومان دەوری شاپووریش هەر لەناوەوە بووە. هەرچەندە چاوی بەشیرین بکەوتایە ئەوەی بۆ ڕوون دەکردەوە کە خوسرەو شیرینی خۆش دەوێ. شیرین هەڵوێستی خوسرەوی پێ ناخۆش دەبێ، لەبەر ئەوە گازاندەی لێ دەکا.

لەوکاتەدا ڕووداوێکی تازە لە مەسەلەی دڵداری خوسرەو و شیرین پەیدا دەبێ ئەویش دڵداریی فەرهادی کێوهەڵکەن یا پەیکەرتەراشە.

ڕۆژێکیان شیرین لە کۆشکەکەی خۆیدا داوای شیر دەکا، بەڵام ڕانەمەڕ دوور دەبی و شیری دەست ناکەوێ. ئەم پێویستییەی بەرەو ڕووی شاپوور دەکاتەوە. شاپوور باسی فەرهاد دەکا وەک هونەروەرێکی بلیمەت و زیرەک بۆی هەیە جۆگەلەیێک لەبەرد دروست بکا لە نێوان چایەری ڕانە مەڕەکە و کۆشکی شیریندا. بەم جۆرە دەتوانن لە چایەرەکە مەڕ بدۆشن و شیرەکە بڕێژنە ناو جۆگەلە بەردینەکەوە ئیتر بۆ خۆی دێتە خوار تا کۆشکی شیرین.

شاپوور فەرهاد دێنێتە لای شیرین، لەوێ فەرهاد گوێ لە قسەکانی دەگرێ، بەڵام هیچی لێ تێ ناگا، چونکە لە یەکەم بینیندا گرفتاری دەبێ بەجۆرێک زۆر خۆی پێ ڕاناگیرێ و لە مەجلیس دەچێتە دەرەوە و لە شاپوور دەپرسێ قسەکانی شیرینی دووبارە بۆ بگێڕێتەوە چونکە هیچی لێ تێ نەگەیشت، ئیتر فەرهاد وەکو شیرین دەیویست جۆگەلەیێک لە بەرد دەتراشێ. بەشێوەیێک خۆشەویستی شیرین دەکەوێتە ناو دڵ و دەروونییەوە هۆشی لای خۆی نامێنێ، مەسەلەی ئەم خۆشەویستییە دەکەوێتە بەر گوێی خەڵکی.



خوسرەو کە ئەمە دەبیستێ داوای فەرهاد دەکا بیهێنن بۆ لای، دیالۆگێکی درێژ لە نێوانیاندا دەکرێ. فەرهاد بەئاشکرا و بەبێ ترس قسەی خۆی دەکا. خوسرەو دەکەوێتە پیلان دانان بۆ لەناوبردنی فەرهاد. بۆ ئەم مەبەسە شاخێک دەستنیشان دەکا کونێکی تێدا بکا بۆ ئەوەی ببێتە ڕێگە و خەڵکی هاتوچۆی تێدا بکەن و پێویستییان بەوە نەبێ بەشاخ هەڵگەڕێن بۆ ئەوەی بچنە ئەودیو. فەرهاد ڕازی دەبێ، بەڵام مەرجی بۆ دادەنێ، دەڵێ ئەگەر کۆتاییم بەکارەکە هێنا پاداشم ئەوەیە شیرینم بدرێتێ. بێگومان خوسرەو ئەم قسەیەی فەرهادی پێ ناخۆش نابێ و ڕازی دەبێ، چونکە وا دەزانێ بەهیچ جۆرێ فەرهاد ناتوانێ کارەکە بگەیەنێتە ئەنجام. ئیتر فەرهاد دەست دەکا بەکار، لەگەڵ هەڵکەندنی کونەکە وێنە و نەقش و نیگاری هونەری لە شاخەکەدا دەتراشێ، لە وێنەکاندا دیمەنی خوسرەو و شیرین و ڕاووشکار و جەنگەکانی خوسرەو دەبینرێن.

شیرین سەردانی شاخەکە دەکا بۆ ئەوەی ئەنجامی کارەکەی فەرهادی چاو پێ بکەوێ، لەو سەردانەدا پێی مایینی شیرین هەڵدەخلیسکێ، فەرهاد زوو بەهانای دەگا و شیرین و مایینەکەی هەڵدەگرێ و دەیانباتەوە جێی خۆیان. هەواڵی ئەم هەڵوێستە دەگاتەوە خوسرەو، جگە لەمە خوسرەو لەوە دەترسێ کارەکەی فەرهاد تەواو ببێ، چونکە بەڵێنەکەی خۆی نایەنێتە دی و شیرینی ناداتێ.

ڕاوێژکاران کۆدەکاتەوە نەخشەی پیلانێک بکێشن بۆ ئەوەی ئەم مەسەلەیە تاوتوێ بکەن. یەکێ پێشنیاز دەکا پیرێژنێکی ناشیرینی دەعەجانی ڕاسپێرن بچێتە لای فەرهاد بەدرۆ شین و واوەیلا بکا بەهۆی مردنی شیرین، لەوانەیە فەرهادیش لە داخانا بمرێ یا خۆی بکوژێ. پیرێژن دەڕوا و ئەوەی پێی دەسپێررێ دەیکا، فەرهاد کە ئەم دیمەنە دەبینێ دەست لەکار هەڵدەگرێ و کوڵنگەکەی دەدا بەسەری پیرێژن. لە دوای ئەمە دەست دەکا بەلاواندنەوەیێکی پڕ لە سۆز بۆ شیرین. ئیتر لە هۆش خۆی دەچێ و دەکەوێتە سەر ڕوو و گیانی پاکی لە لەشیدا دەردەچێ.

ئەم هەواڵە ناخۆشە شیرین دڵگیر دەکا، دەچێ بۆ سەر تەرمەکەی و بەکوڵ بۆی دەلاوێنێتەوە. فەرمان دەردەکا بەشێوەیێکی ڕێکوپێک ئایینی کفن و دفنی جێبەجێ بکەن. خورپەی دڵی خوسرەو لەپاش مردنی فەرهاد نامێنێ، ڕووداوەکەی پێ خۆش دەبێ و نامە لەم بابەتەوە بۆ شیرین دەنووسێ و داوای لێ دەکا غەم بۆ فەرهاد نەخوا. شیرین دڵخۆشی بەنامەکە نایە، بەپەژمردەیی ڕۆژان دەباتە سەر.

لەو سەردەمەدا مریەمی کچی قەیسەر (ژنی خوسرەو) کۆچی دوایی دەکا، شیرین ماتەمنامە بۆ خوسرەو دەنێرێ و ناوی مریەم وەک ژنێکی ناشیرین دەهێنێ.

لەوکاتەدا خوسرەو وەک شاهنشاهێک گەورە و دیار دەبێ، ئارەزووی ئەوە دەکا بەبێ مارەکردن شیرین ببێتە ژنی، بەڵام خوسرەو ناتوانی هەڵی بخەڵەتێنێ. شەوێکیان لە دیوەخانی خوسرەو باس لە کچی جوان دەکرێ. لە کوێ کچی جوان دەست دەکەوێ؟ هەر کەسەو ناوی وڵاتێک دێنێ. یەکێ باس لە کچێکی جوان دەکا ناوی شەکری ئەسفەهانی دەبێ. ئیتر خوسرەو کە باس لە جوانی شەکر دەکەن، بەبێ ئەوەی چاوی پێی کەوتبێ حەزی لێ دەکا، بۆ ئەم مەبەسە ڕوو دەکاتە ئەسفەهان و دەیدۆزێتەوە، لە دوای دیالۆگێکی نێوانیان بڕیاری خوازبێنی دەدا و دەیگوازێتەوە. بەڵام بەهیچ جۆرێ شیرین لەبەر چاوی

ناکەوێ. لە پاشانا دڵداری لە دڵیدا دەبزوێتەوە، بۆ ئەمە بڕیار دەدا بچێ بۆ ڕاو لە ڕێگە دەگاتە لای کۆشکی شیرین، هەوڵ دەدا لێی بچێتە ژوورەوە، بەڵام شیرین دەرگای لێ ناکاتەوە. لە پاش پاڕانەوەیێکی زۆر شیرین بە کەنیزەکان دەڵێ لە کۆشکی دیکەدا جێی بۆ دابنێن. ئینجا شیرین خۆی دەچێتە لای و دیالۆگێکی دوور و درێژ لە نێوانیاندا دەبێ. ئەنجام قسەکانی شیرین بەدڵی خوسرەو نابن. خوسرەو لەمە تووڕە دەبێ و کۆشکی شیرین بەجێ دێڵێ و بەسەرهات بۆ شاپوور دەگێڕێتەوە. شاپوور هێمنی دەکاتەوە و ئامۆژگاری دەکا ئاگاداری خۆی بێ و هەموو شتێک لە پاشانا بەدڵی ئەو دەبێ.

شیرین لەم کارە دڵی دەڕەنجێ و زیزبوونی خوسرەوی پێ ناخۆش دەبێ، لەبەر ئەوە لەکاتی تاریک و ڕوونی بەیانی خۆی دەگەیەنێتە ئۆردووگای خوسرەو، ئەمە دەبێتە جێی شادمانی بۆ شیرین.

شیرین «نیکیسا» و «باربود»ی گۆرانیبێژ و مۆسیقاران کۆ دەکاتەوە و هەندێ بابەتیان فێردەکا گۆرانیبێژەکان بەناوی خۆی و بەناوی خوسرەوەوە بیچڕن. لەکاتی ئاهەنگەکەدا کە خوسرەو گوێی لەم دیالۆگە شیعرییە دڵدارییە دەبێ هەر بەیەکجاری لە پەلوپۆ دەکەوێ، ئەوجا پاش ئەوەی شیرینیش دەردەکەوێ خوسرەو بەتەواوی لە هۆش خۆی دەچێ و دەکەوێتە بن پێی شیرین. ئەو شەوە تا بەیانی بەڕابواردنی ماچ و مووچ و مێبازی و خواردنەوە دەبەنە سەر، بەڵام شیرین خۆی دەپارێزێ و لە خوسرەو نزیک نابێتەوە. خوسرەو ناچار دەبێ بڕیاری مارەکردنی شیرین لە خۆی بێنێتەجێ. بۆ بەیانی هەموو شتێک ساز دەبێ بۆ ئاهەنگگێڕانی مارەکردنی شیرین لە خوسرەوی پەروێز، بەم ڕەنگە بەیەکتری شاد دەبن.

ماوەیێک ژن و مێرد بەخۆشی ڕادەبوێرن، تا شەوێک خوسرەو خەونێک دەبینێ، سوارێک داوای لێ دەکا واز لە ئایینی ئاگرپەرستی بهێنێ، بەڵام خوسرەو ئەم داوایە ڕەت دەکاتەوە و بەوەی لەسەر ئایینی باب و باپیرانی لاناچێ. سوارەکە ڕمێک دەکا بەسنگیدا، لەم کاتەدا خوسرەو ڕادەچڵەکێ و لەخەو هەڵدەستێتەوە. بۆ بەیانی خەونەکەی بۆ شیرین دەگێڕێتەوە. شیرین پێشنیاز دەکا لە خەزنەکەیان هەندێ زێڕ و زیو و بەردی بەنرخ دەربێنن و بیکەن بەخێر بۆ ئەوەی لەم بەڵایە دووربکەونەوە.

لە خەزنەکەدا تۆمارێک دەدۆزنەوە لەناو قوتوییێکدا دەبێ، پیشانی خەزنەداری دەدەن بۆ ئەوەی بۆیانی بخوێنێتەوە. ئەمە وەسیەتنامەی ئەردەشێری بابەکانە بۆ نەوەکانی پاش خۆی. لەوێ ئەوە هاتووە لە شاری مەککە پێغەمبەرێک دەردەکەوێ ناوی محەممەدە، پێویستە ئیمانی پێ بێنن. شیرین باوەڕ بەنووسینی ناو تۆمارەکە دەکا، بەڵام خوسرەو دوودڵ دەبێ و نایەوێ لە ئایینی باب و باپیرانی ببێ.

لە دوای ماوەیێکی کەم نامەی پێغەمبەر دەگاتە دەستی خوسرەو، داوای لێ دەکا بێتە سەر ئایینی ئیسلام. خوسرەو بەشێوەیێکی ناشیرین وەرامی دەداتەوە. لەبەرئەوە پێغەمبەر دوعای خراپی لێ دەکا، زۆری پێ ناچێ بەختی خوسرەو دەکەویتە لێژییەوە. شێرۆیەی کوڕی حەز لە شیرینی باوەژنی دەکا، لە پێناوی هێنانە دی ئەم مەبەسە پیلان بۆ کوشتنی باوکی دادەنێ. هەموو نزیکەکانی دەربار ڕازی دەکا ڕێگەی لێ نەگرن. شەوێک دەچێتە سەر پێخەفی باوکی و دەیداتە بەر خەنجەر و دەیکوژێ. بێگومان شیرین بەکوشتنی مێردی دڵگیر دەبێ.



شێرۆیە لە جێی باوکی لەسەر تەختی شاهنشاهی دادەنیشێ. فەرمانڕەوایی بەسیاسەتی زەبر و زەنگ بەڕێوەدەبا، لەگەڵ شیرینی باوەژنی ڕووبەڕوو دەبێتەوە و نهێنیی ناو دڵی دەخاتە ڕوو و پێی دەڵێ حەزی لێ کردووە. شیرین زۆر لێی دەپاڕێتەوە دەستی لێ هەڵبگرێ بەڵام بێ سوود. ئیتر شیرین داوای چل ڕۆژ مۆڵەت لە شێرۆیە دەکا بەناوی ئەوەی چل ڕۆژ پرسەی خوسرەوە. شێرۆیە ڕازی دەبێ و دەچێتە ڕاووشکار و سەیران. لە دوای چل ڕۆژ داوای شیرین دەکا. ئەم جارەیان شیرین داواکاری تری دەبێ، ئەگەر شێرۆیە جێبەجێیان نەکا شووی پێ ناکا، داواکارییەکانی ئەمانە بوون:

ڕووخاندنی هەموو کۆشکەکانی باوکی، کلک و گوێکردنی وڵاغە چاکەکان، دابەشکردنی سامان، لەناوبردنی مۆسیقار و گۆرانیبێژەکان. شێرۆیە هەموو داخوازییەکانی جێبەجێ دەکا.

شیرین خۆی ئامادە دەکا بۆ گەرماو بەناوی لەش شوشتن و خۆ ئارایشکردن بۆ ئەوەی بەبووک ببرێ بۆ شێرۆیە. بەڵام مەبەسی ئەمە نەبوو و شتێکی دیکە بوو. لە دوای ئەوەی شیرین خۆی دەشوا و جل دەگۆڕێ، کەنیزەکان بانگ دەکا، ڕاستی مەبەسەکەیان پێ دەڵێ و ماڵئاواییان لێ دەکا. کەنیزەکان دەست بەگریان دەکەن و لێی دەپاڕێنەوە بەڵام بێ سوود، فەرمان دەردەکا ماینەکەی بۆ بێنن، سواری دەبێ و ڕوودەکاتە لای گۆڕی خوسرەو.

لەسەر گۆڕی خوسرەو بەکوڵ دەگری، ئینجا خەنجەرەکەی ژێر سوخمەی لە کالان هەڵدەکێشێ و دەسکی لە ئەرز گیر دەکا و نووکی خەنجەرەکە لە سنگی گیر دەکا و خۆی دەهاوێتە سەری تا گیانی دەردەچێ.

کە هەواڵ دەگاتە شێرۆیە لە حەژمەتانا شێت دەبێ و دەداتە دەشت و کێو، لە لووتکەیێکی هەزاری بەر هەزار خۆی فڕێ دەداتە خوارەوە و هەپڕوون بەهەپڕوون دەبێ.

لە پاشانا ئەو و شیرینیش لە تەک خوسرەودا دەنێژن.

## پێناسەی ڕۆمانی شیعری شیرین و خوسرەو

خانای قوبادی ڕۆمانی «شیرین و خوسرەو»ی لە ساڵی **١١٥٣**ھ دا بەئەنجام گەیاندووە، ئەم مێژووە لە دوا دێڕەکانی بەشی یەکەمی چیرۆکەکەدا هاتووە:

باجەلای شیعرت شیرین ڕەونەق بۆ
چون دوعای خاسان مەقبوول حەق بۆ
عەزیزولقەدرێ ئەو چون نیزامی
بپەرسۆ تەئریخ ئەی نامەی نامی
(غەین)و(قاف)و(نوون)، (جیم) کەرۆ حیساب
لێش مبۆ ڕەوشەن چون قورس ئافتاب

واتاکەی:

شیعرت ڕوون و شیرین و ڕەونەقدارە
وەک دوعای پیاوچاکان قوبوول دەکرێ

مەقامت بلّندە وەکو نیزامی
لە مێژووی ئەم نامە ناوداره بپرسە
(غەین) و (قاف) و (نوون) و (جیم) حسێب بکە
بۆت ڕوون دەبێتەوە وەک قورسی خۆر

بەحسێبی ئەبجەد کۆی تیپەکانی غەین و قاف و نوون و جیم دەکاتە ساڵی ١١٥٣ی هیجری، ئەمە دەکاتە ساڵی ١٧٤١م، ئەمەش ساڵی لێبوونەوەی شاعیره لە دانانی ڕۆمانی شیعری «شیرین و خوسرەو».

سەرەتای بەشی یەکەمی «شیرین و خوسرەو» کە سەرەتای ڕۆمانە شیعرییەکەیە بەم دێڕانە دەست پێدەکا:

بەنام ئەو کەس (شیرین) ئەرمەن
پەیدا کەرد (فەرهاد) پەیش بی بەکۆکەن
هەر سوب تا ئێوار نە پای (بێستوون)
تەقەقەی قوڵنگش یاوا بەگەردوون
نەڕاش چەندین جەور چەند جەفا بەردش
ئاخر بەناکام ئەڕوا سپەردش

واتاکەی:
بەناوی ئەو کەسەی شیرینی ئەرمەنە
فەرهاد پەیدا بوو بۆی بوو بە کێوهەڵکەن
هەموو بەیانییێک تا ئێوارە لە پای بێستوون
تەقەی کوڵنگی دەگاتە گەردوون
لە دوای چەشتنی چەندین جەور و جەفا
لە ئەنجامدا بەناکامی گیانی سپارد

بەشی میعراجنامە لە «شیرین و خوسرەو»دا بەم دێرانە دەست پێدەکا:

شەوێ وێنەی شەمع تەجەللای کۆی توور
عەرسەی سەر زەمین ڕەوشەن بێ جەنوور
چەتر چین چەرخ چون دێبای گوڵ دۆز
مدرەوشا جە دوڕ نەجم شەب ئەفرۆز
توراب تیرەی ئەرز عەنبەرین
مبەخشا سۆڵەی شەمس خاوەرین



واتاکەی:
شەوی ڕووناکی وەک تەجەللاکەی کێوی توورە
هەموو عەرسەی سەرزەوی بەنوور ڕووناک بۆتەوە
چەتری چەرخ وەک دیبای بەگوڵ چنراوە
لە دوورەوە ڕووناکی لە ئەستێرەی شەو دەدرەوشێتەوە
خۆڵی تاریکی ئەرزی عەنبەرین
دەرگای خۆری ڕۆژهەڵات دەکاتەوە

میعراجنامە بەم دێرانەش کۆتایی دێ:

ئومێدن بەزات دانای شیرین کار
مەزموون ئەی نەزم جەواهێر نیگار
چون ڕاز شیرین نادیرەی ئەییام
شیرین بۆ بەکام کافەی خاس و عام

واتاکەی:
هیوا بەکەسی دانای کاری جوان دەکا
ناوەرۆکی ئەم شیعرە بەگەوهەر ڕازاوەتەوە
وەک ڕاز و نیازی شیرینی دەگمەن لە ڕۆژگاردا
شیرین ئارەزووی هەموو خاس و عامێکە

خانا تێکستی بەسەرهاتی دڵداریی شیرین و فەرهاد لە بەشی سێیەم دەست پێدەکا بەناوی «لەدایکبوونی خوسرەو» ، ئەم دێڕە شیعرانە سەرەتای چیرۆکەکەیە:

شوعەرای شیرین نەزم شەکەر ڕێزەی ڕاز
شێخ نیزامی تەور شەفیعا ئەنداز
بە ڕەشح خامەی میشکین چون مانی
بەی تەور ئینشا کەرد لەوح مەعانی
چون بە حەسبولئەمر قەدیم لا مەوت
نەوشیروان نۆشا مەی جە شیشەی فەوت
بەویفق تەوفیق زات ئیلاهی
هورمز نیشت نە تەخت فەڕ بەخش شاهی
بەڕەسم و ئایین نەوشیروان پێش
مەعموور کەرد بەعەدڵ ویلایات وێش

واتاكەی:

شاعیرانی شیرین شیعر و قسەی جوان
وەک شێخی نیزامی و لە ئەندازەی ئەرستۆ
بەتەڕایی قەڵەمی مشکینی وەک مانی
بەو جۆرە لەوحی مەعانی نووسی
وەک لە قەدەری قەدیمی نەمر نووسراوە
نەوشیروان مەیی نۆشی لە جامی مردن
بەپێی تەوفیقی زاتی ئیلاهی
هورمز لەسەر تەختی موبارەکی شاهی دانیشت
بەپێی ڕێ و ڕەسمی نەوشیروانی پێشوو
هەموو ویلایەتەکان بەعەدلی ئەو مەعموور بوون

خانا هەموو ڕۆمانەکەی «شیرین و خوسرەو» بەم دێڕانە دوایی پێ دێنێ:

هەردوو هام قیران جە مەكان نەو
نیان نە پاڵووی مەزار خوسرەو
فورزەند و بابۆ و حەرەم چەنی هەم
تەكیەدان بەسەنگ سیای تار و تەم
یاران بەزاری بەدیدەی نمناک
سەرداران بەهەم سپەردن بەخاک
دەوران بێ پۆ كارش دوو ڕەنگەن
ئاخر جای گشتمان ئەو ماوای تەنگەن

واتاكەی:

هەردووكیان بەجووتە لە جێی تازە
لە تەک مەزاری خوسرەو نێژران
منداڵ و باوک و حەرەم و هەرچی هەیە
بە بەردی ڕەشی تاریک لە خۆیان دەدا
یاران بەگریان و چاوی پڕ لە فرمێسکەوە
سەردارانیان پێکەوە بەخاک سپارد
کاری دەورانی زۆڵ دوو ڕوویییە
ئەنجام جێی هەموومان ئەو ماڵە تەنگەیە



بەم ڕەنگە خانای قوبادی لە ڕۆمانە شیعرییەکەی دەبێتەوە و شەوچرایێکی دیکە دەخاتە ناو ئەدەبی ڕەنگینی کوردییەوە.

## نموونەی شیعری ڕۆمانی شیعری «شیرین و خوسرەو»

ڕۆمانی شیرین و خوسرەو نموونەیێکی بەرزە لە مەیدانی سۆز و ئەڤینی دڵداری و لێکسیکۆنی ڕەوانبێژی و داهێنانی وێنەی شیعری و باسکردنی پێوەندی کۆمەڵایەتی ئادەمزاد، بە وشەی جوان و ڕستەی پاراو و تەعبیری ڕازاوە و هەناسەیێکی کوردانە نووسراوەتەوە.

لێرەدا نموونەی ئەو بەرهەمە دەخرێتە ڕوو:

-١-

لە كاتێكدا شیرین و كەنیزەكانی لە سەیران و ڕاووشكار بوون، وێنەی خوسرەویان كێشا بوو و بەدرەختێكەوە هەڵیانواسیبوو، بۆ ئەوەی شیرین چاوی پێ بكەوێ و بەڵكو دڵی بچێتێ.

خانا بەم دێڕە شیعرانە وەسفی شیرین و كەنیزەكانی دەكا:

جەو دما شیرین شای سۆسەن خاڵان
چەنی سوپا و سان نازک نەوهاڵان
بەدەوڵەت بەو جا تەشریف ئاوەردن
گەڵا جە گوڵزار موشەررەف كەردن
دەردم نازاران ڕشتەی ئیلاهی
كەرد شان وەپا سەیوانی شاهی
وستشان جە شاخ ڕەیحانە و سونبول
جە بەرگ نەسرین شەقایق و گوڵ
فەرشێ پەی شیرین شۆخ شیرین ڕەنگ
خاستەر جە دیبای كارخانەی فەرەنگ
شەكەر لەب بەسەد لار و لەنجە و ناز
نیشت وە باڵای فەرش گوڵان بەئەنداز
فەرماش تا ساقیی سادەی سیم ئەندام
لەب ڕێز كەرد قەدەح جە بادە گوڵ فام
نۆشاشان ڕەندان زوڵف بۆ عەنبەرین
پەیا پەی پەیوەست بەشادیی شیرین

واتاکەی:

لەو کاتەی شیرینی شای خاڵ سووسنییان
لەگەڵ لەشکر و سامانی نەونەمامانی ناسک
بە تەنتەنە تەشریفیان هاتە ئەو جێیە
گەڵای گوڵزاران بەخێرهاتنیان کردن
لەو دەمەدا نازدارانی دەسکردی خودا
سەیوانی شاهییان ڕاست کردەوە
ڕەیحانە و سونبولیان لە شاخ بڵاوکردەوە
لە بەرگی نەسرین و شەقایق و گوڵ
فەرشێکی جوان بۆ شیرینی شۆخ دروست بوو
جوانتر لە قوماشی کارخانەی فەرەنگ
لێوشیرین بەسەد لارولەنجە و نازەوە
لەسەر فەرشی چنراو بەگوڵ دانیشت
فەرمووی با ساقیی سادەی ئەندام زیوین
جامی پڕ بکا لە شەرابی گوڵ ڕەنگ
جوانانی زولفیان بۆنی عەنبەرە نۆشیان کرد
یەک لە دوای یەک بەبێ برانەوە بەیادی شیرین

-٢-

بۆ یەکەمین جار لە سەیران و ڕاووشکارێکدا شیرین و خوسرەو چاویان بەیەکتری دەکەوێ. بەم دێڕە شیعرانە خانا هەست و نەستی خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر ئەم هەڵوێستە ڕۆمانتیکییەی دڵدار و دڵبەری کۆ کردبووەوە:

هەردوو چون سوورەت نەقش کەندەی سەنگ
مدیان بەهەمدا بێ سەدا و بێ دەنگ
خوسرەو چون شاباز شەش دانگ شاهی
شیرین وینەی سەوڵ ڕشتەی ئیلاهی
خوسرەو چون خورشید درەخشندەی نوور
شیرین وێنەی شەمع تەجەللای کۆی توور
خوسرەو چون یووسف شوخ کەنعانی
شیرین چون تەرسای شێخ سەنعانی



یەکێ جە یەکێ شۆخ و شەنگتەر بێن
هەردوو پادشای ساحێب ئەفسەر بێن
منمانا جە دوور ڕوخسار پەروێز
خەت چون وەنەوشەی گوڵ باغچەی نەوخێز
دەستەی زوڵف لوول سیای عەنبەرین
مبەخشا شۆخی بەشێوەی شیرین
شیرین جە شۆخی و شیرینی خوسرەو
جە دەستەی کاکۆڵ پەخش چینی ئەو

واتاکەی:

هەردووکیان وەک وێنەی نەقشکراوی سەربەرد
دەیاننواڕییە یەکتری بێ قسە و بێ دەنگ
خوسرەو وەک شای بازان و تەواوی بێ کەموکوڕی
شیرین وەک شەنگەبی دەسکردی خودا
خوسرەو وەک ڕۆژی کە ڕووناکی دەپڕژێنێ
شیرین وەک مۆمی کێوی توورە
خوسرەو وەک یووسفی شۆخی کەنعانە
شیرین وەک ئاگرپەرستی شێخی سەنعانە
یەک لە ئەویتر شۆخ و شەنگتر بوو
هەردووکیان پادشای خاوەن تانج بوون
لە دوورەوە ڕوخساری پەروێز دیار بوو
خەتی سمێڵی گوڵی وەنەوشەی باغچەی تازە پشکووتوو بوو
دەستەی زولفی لوولی ڕەشی عەنبەر بۆ
بەشێوەیێکی جوان بەخشراوتە شۆخێک
شیرین گرفتاری شۆخی و جوانی خوسرەو
و دەستەی کاکۆڵی بڵاوبووەوەی ئەو بووە

-٣-

بەم دێڕە شیعرانە خانا وەسفی یەکتری بینینی شیرین و فەرهادی کێوهەڵکەن دەکا:

وەختێ بەفەرهاد بێچارەی کۆکەن
یاوا ڕێزەی ڕاز شیرین ئەرمەن

کێشا نە دەروون ئاه ستەمناک
دەرسات چون مەسرووع خلتیا نە خاک
کەفت نە ڕووی زەمین بەوێنەی زامدار
پێچاوپێچ وەرد چون کلافەی مار
شیرین شەش دانگ زوڵف دەستە زنجیر
مەمان شەمامەی وەشبۆی بۆ عەبیر
زانا کە فەرهاد جە ڕێزەی ڕازش
بەمەحز شۆخیی نەغمەی ئاوازش
بێ خود خڵتیا نە خاک سارا
سەودای تیر عەشق جە لاش و یارا
خەیلێ خەیاڵ کەرد جە بێ قەراریش
بەڕەنگێ هەنی کەردش دڵداریش
ئیمجار وات بشنەو هەی مەرد ئوستاد
بۆ جە ڕای دۆستی خاترم کەر شاد

واتاکەی:

لە وەختێکدا فەرهادی بێچارەی کێوهەڵکەن
گەیشتە ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ شیرینی ئەرمەن بکا
ئاهێکی ستەمناکی لە ناخی دەروونیدا هەڵکێشا
یەکسەر وەک خووگرتوو لەسەر خاک گەوزی
کەوتە سەر ڕووی زەوی وەک بریندار
پێچی خواردەوە وەک کلافەی مار
شیرینی بێ کەموکوڕی زوڵفی وەک قەفی زنجیر
مەمکی شەمامەی بۆنخۆش و عەبیر
کە زانی فەرهاد لە ئەنجامی گفتوگۆ
لەبەر جوانی و ئاوازی قسەی خۆشی
بێ هۆش دەگەوزی لەسەر خاک
کوشتەی تیری عەشق بوو بەلەش و بەگیان
زۆر بیری کردەوە بەبێ ئۆقرەیی
بەشێوەیێکی قورس کەوتە ناو دڵدارییەوە



ئینجا وا ببیستە ئەی مامۆستای مەرد
بۆ لای دۆستایەتی بمگەیەنە ئەنجام

-٤-

وەک لە ناوەرۆکی چیرۆکەکە دیارە شێرۆ حەز لە شیرینی باوەژنی دەکا، لە پێناوی دڵداری باوکی دەکوژێ، بۆ ئەوەی بتوانی شیرین بکا بەژنی خۆی. شاعیری ئەم ماوەیەمان خانا بەزمانی شێرۆ بەم جۆرە لەگەڵ شیرین دەدوێ:

شێرۆ وات: شیرین دڵدار دلبەر
مەر تۆ جە دەردم نەداری خەبەر
حەققا حەققتەن تەوەن لێت وارۆ
کەس جە دەرد کەس خەبەر نەدارۆ
من عەشق شێوەت کارێ پێم کەردەن
هەر دەم موازوون ئاوات بەمەردەن
کوورەی کوزەگەر جۆش و تاومەن
زووخ دڵ نە جای خورد و خاومەن
شەوان شومارەی ستارە زانام
بێ خاوی جە تاف ئاوان ستانام
نوجووم ئەختەر ئەفلاک شمەردم
کەوکەب بەکاتیب کەیوان سپەردم
دەفتەرخانەی فەرد شەوگارم وانان
حیساب ئەنجوم ئەفلاکم زانان
دوودیم دەماوەند بوویینەوە توور
ئاهیر دام نە بەند کاوکۆی بلوور

واتاکەی:

شێرۆ وتی: ئەی شیرینی دلبەری دڵدار
مەگەر تۆ ئاگاداری دەردی من نی
بەهەق و بەهەقیقەت بەردت لێ دەبارێ
کەس ئاگای لە دەردی کەس نییە

عەشقی تۆ کارێکی وای پێم کردووە
هەموو دەم ئارەزوو و ئاواتم مردنە
کوورەی وەستای گۆزە بەجۆش تواندوومیەتەوە
زووخاوی دڵ لەجێی خەو و خۆراکمە
بەشەوان خەریکی ژماردنی ئەستێرەکانم
بێ خەویم لە دەنگی سولاوکەی ئاوانەوەیە
ئەستێرەکانی ئاسمانان دەگرمەوە
ئەستێرەی بەختم بەنووسەری زوحەل سپارد
دەرسی بەختم لە دەفتەری شەوگار دایە
لەوێ حسێبی ئەستێرەکانی ئاسمان کراوە
دەماوەندی دووکەڵاوی بووە بەشاخی توورِ
ئاگر بەربووە جومگەکانی شاخی وەک بلوور

-٥-

لە دوای کوشتنی خوسرەوی پەروێز لەلایەن شێرۆی کوڕیەوە، بەم دێڕە شیعرە پڕ لە سۆزانە شیرین لەسەر گۆڕی خوسرەو شین و شەپۆڕی بۆ دەکا و دەلاوێنێتەوە پێش ئەوەی بەخەنجەر خۆی بکوژێ:

خوسرەو خرۆشان خیشم جۆش و کۆ
سەردار سەرکەش سەرکەشانم ڕۆ
لاڵ پۆش و لاڵ بەخش خاس خەیاڵم ڕۆ
نەوەی کەیکاووس کەمەر لاڵم ڕۆ
شاه شێر شکار غازیانم ڕۆ
سالار سەرهەنگ کەی کەیانم ڕۆ
دڵدار و دڵبەر دلاوەرم ڕۆ
گەنجووری کۆی گەنج یاداوەرم ڕۆ
شاهنشای شاهان شەهرەیارم ڕۆ
دەسباز دەسگیر دەس ئەفشارم ڕۆ
سوڵتان سالار بەحر و بەڕڕم ڕۆ
سەبر سەرداران کلاو زەڕم ڕۆ
خواجە غولامان دوڕ نەگۆشم ڕۆ



کەیانی مەجلیس بادەنۆشم ڕۆ
باش باشقەی عەزیزانم ڕۆ
سەردار ساحێب کەنیزانم ڕۆ
بێدادم گەردوون کەیقوبادم ڕۆ
شێر زەبەردەست هەی فەرهادم ڕۆ
شیرین بەی دەستوور خوسرەو ملاونا
فوغان و زاریش تەوەن متاونا
دەس بەرد هۆرکێشا دەشنەی تێغ تێز
دەستەش مەحکەم کەرد نە قەبر پەروێز
نووکەش کەرد وەبان نێشش و نارا
سەرکەرد نەبالا سەرنێش خارا
واتش: دەهر دوون خودا نیگەهدار
هامشوون جە ڕەنگ ڕاگەی ڕۆزگار
با ڕۆژ ڕەوشەن کەروون بەزوڵمات
سەر بەڕوون نە سای سیاهی مەمات
سەر بنیەن نە سای سیای سەنگەوە
تەک دەم بەتەکیەی تار و تەنگەوە

واتاکەی:
گریان و فریادم بۆ خوسرەو جۆشی سەند
سەرداری سەربڵندی هەموو سەربڵندانم ڕۆ
سوور پۆش و قسە خۆش و خەیاڵ جوانم ڕۆ
نەوەی کەیکاووسی کەمەر لەعلینم ڕۆ
شای شێر بەزێن و جەنگاوەرم ڕۆ
سەردار و گەورەی کەیانییەکانم ڕۆ
دڵدار و دلبەری قارەمانم ڕۆ
خەزنەداری کۆمەڵە خەزنەی باداوەرم ڕۆ
(باداوەر ناوی خەزنەییێکە لە خەزنەکانی خوسرەو)
سەرداری شاهان و شای گەورەم ڕۆ
سەخی و چاودێری خاوەن ئەفشارم ڕۆ

(ئەفشار: خانەییێکی نەرد، ئاهەنگێکی مۆسیقا، هۆزێکی ئێرانی)

سوڵتان و سەرداری زەریا و وشکاییم ڕۆ
سەبری سەرداران کڵاو زێڕم ڕۆ
گەورەی غولامان دوڕ لە گوێم ڕۆ
شاهنشای مەجلیس بادەنۆشم ڕۆ
سەردەستەی هەموو عەزیزانم ڕۆ
سەرداری ساحێب کەنیزانم ڕۆ
بێدادی گەردوون کەیقوبادم ڕۆ
شێری زەبر بەدەستی وەک فەرهادم ڕۆ
شیرین بەم ڕەنگە خوسرەو دەلاوێنێتەوە
لەناو فوغان و ئێش و ئازاردا وەک بەرد تواوەتەوە
دەستی برد و خەنجەری تیژی هەڵکێشا
دەسکی خستە سەر گۆڕی خوسرەوی پەروێز
نووکی خستە سەر ئازاری ئاگر (یا هەنار، مەبەسی مەمکە)
سەری بڵند کرد و ڕوانییە بەرد
وتی: ڕۆژگار سفڵەیە خودا ئاگادارت بێ
وا منیش دەڕۆم بەڕێگەی ڕۆژگار (قەدەر)
با ڕۆژی ڕووناک ببێ بە تاریکستان
ڕوو بکەینە لای مردنی ڕەش
سەرمان بنێینە بان بەردی ڕەش
لەناو قووڵاییێکی تاریک و تەنگ

بێگومان ئەم بڕە شیعرەی خانا لە هەڵبژاردەی «شیرین و خوسرەو» هەندێ تینوەتی خوێندەواری کورد دەشکێنێ، بەڵام ناسینی خانا و هونەری بەرزی لە خوێندنەوەی هەموو ڕۆمانە شیعرییەکەدا هەستی پێدەکرێ. لەبەر ئەوە پێویستە ئەم بەرهەمە لاپەڕەکانی تەنیا سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی نەبێ بەڵکو شەوچەرەی کۆڕی حەسانەوەیماڵی کوردیش بێ.

***

بیستنی ڕستەی «خانای قوبادی» لەناو مێشکی ئەدەب دۆستی کورددا وێنەی کەسێکی باڵا بەرزی قارەمانی بەهێز دروست دەکا. لەناو ئەم قاڵبەدا گیانی شاعیرێک جووڵە دەکا بەمێشک زۆر شت دەزانێ، بەچێژ و خەیاڵ ئەوەندە ناسکە نابێ دەستی لێ بدرێ و هەر لە دوورەوە دەبێ تەماشا بکرێ.

ئەم شاعیرە زاگرۆسییە لەسەر لووتکەی بەرزی زاگرۆسەوە دەنوارێتە هەورامان و هەموو کوردستان. لە



هونەری داستان سەراییدا (ڕۆمانی شیعری) کەلێنێکی گەورەی پڕ کردۆتەوە. ئەو بەرهەمەی لەبەردەستمان دایە، مافی ئەوەمان دەداتێ بە یەکێ لە شاعیرە گەورەکانی بژمێرین، ئەوەی لەبەردەستیشدا نییە لە دوارۆژدا بێگومان ئەدەبی کوردی دەوڵەمەندتر دەکا.

## بەشی حەوتەم

# وەلی دێوانە

**١٧٤٥ - ١٨٠١**

### بەسەرهاتی وەلی دێوانە:

وەلی دێوانە یەکێکە لەو شاعیرانەی ناوبانگیان فراوانە بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانی و شارەزوور و هەورامان و گەرمیانی کەرکووک، ئەم ناوبانگە بێ سنوورە لەگەڵ کەمی زانیاری لەبابەت ژیانی شاعیرەوە ناگونجێن، سەرەڕای ئەمەش ئەو زانیارییە کەمە بووە بەکۆمەڵێک هەواڵی نامەنتیقی و پێچەوانەی یەکتری، ڕۆشنبیر دەخەنە گێتییێکی پڕ لە گیروگرفت و تەنگوچەڵەمە، بەهیچ جۆرێ ناتوانێ سەر لە مەسەلەکە دەربکا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێ وەلی دێوانە لە مێژووی ئەدەب دووربخرێتەوە چونکە بەرهەمی ئەو شاعیرە مێژووی ئەدەبی ڕەنگین کردووە.

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە نازناوی شاعیر «وەلی دێوانە» لەناو شیعریدا و لەلای خەڵکی بەم ناوە ناسراوە. لەبارەی ناویەوە بەڵگەییێکی باوەڕپێکراو بەدەستەوە نییە. ناوی لە سەرچاوەکاندا بە(میرزا محەمەد) و (ڕەزا کوڕی کوێخا حەمە) و (وەلید) هاتووە، گۆیا ئەم ناوەی دوایی (وەلید) سواوە و بچووک کراوەتەوە و بووە بە(وەلی).

وەلی دێوانە لە ساڵی **١٧٤٥** لە دایک بووە، شوێنی لە دایکبوونیشی دیاری نەکراوە. سەرچاوە هەیە دەڵێ لە ناوچەی بەکراوای هەڵەبجە لە دایک بووە، هی دیکە گوندی شێروانە دەستنیشان دەکا بۆ جێی لە دایکبوونی وەلی دێوانە.

سەرچاوەکان لە بابەت دەستنیشان کردنی هۆز و عەشرەتی وەلی دێوانەش یەکتری ناگرنەوە، هەندێ لە هۆزی شێخ سمایلی حسێبی دەکەن، هی دیکە دەڵێن لە کەمالەیی یا مکاییلی عێلی جافی مرادییە، ڕەنجووری شاعیر وەلی دێوانە بەکەسێکی سەر بەعەشرەتی گێژ دەزانێ.

وەلی دێوانە لە ساڵی ١٨٠١ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی سەید سادق نێژراوە، خەڵکی ئەوناوە ڕێزی لێ دەنێن و بەچاوێکی بەرز تەماشای دەکەن، چونکە بەرهەمی شیعری بووە بەگۆرانی لەسەرزاری خاوەن دڵانە، ئەو شیعرانە ڕەنگدانەوەی ناو دڵ و دەروونی هەرزەی ناو کۆمەڵی کوردەوارییە لە کوڕ و کیژ.

لە وردبوونەوە لە شیعری وەلی دێوانە ئەوە دەردەکەوێ نابێ کەسێکی بێ سەوادا و نەخوێندەوار بووبێ، حوجرەی مزگەوت لە هەموو ڕۆژگارێکدا تەنیا بۆ دەوڵەمەند نەبووە خوێندەواری لێ وەربگرێ، بەڵکو بۆ هەژارانیش بووە، لەبەر ئەوە وەلی دێوانە بەلای کەمی قۆناغێک یا زیاتر لە حوجرەی مزگەوت بووە خوێندەواری وەرگرتووە، بەڵام خوێندنی هەموو زانستییەکانی تەواو نەکردووە. لە بنەماڵەیێکی هەژار



بووە، شوانکارەیی کردووە. ئێسگەی هەرە دیار لە ژیانی وەلی دێوانە دەتوانین بڵێین دڵداری بووە، ئەمە بووە بەرەمزی ئەو ژیانە و هەموو هەست و نەستی شیعرایەتی بۆ ئەو دڵدارییە خەرج کردووە.

لە ژیانی شاعیردا ئەوە دەگێڕنەوە گۆیا حەزی لە کیژێک کردووە، ناوی «شەم» بووە، کورتکراوەی ناوی «شەمسە» ، زۆربەی گێڕانەوەکانی بەسەرهاتی ئەم دڵدارییە لە حیکایەتی نێوان مەجنوون و لەیلای عەرەبی دەکا ، وەکو ئەوەی بەمنداڵی وەلی دێوانە لەگەڵ «شەم» لە قوتابخانە خوێندوویانە و لە دواییدا لەبەر ئەوەی دوژمنایەتی کەوتۆتە نێوان بنەماڵەی هەردووکیان، شەمیان نەداوەتە وەلی دێوانە، هەروەها لە ئەنجامی دڵداری و نەگەیشتنی بەدلبەری خۆشەویستی شێت و شەیدا بووە و کەوتۆتە چۆڵ و هەرد، لەبەر ئەوە ناویان ناوە وەلی دێوانە، تا ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ئەنجامی نەگەیشتن بەئامانج سەری ناوەتەوە.

### شیعری وەلی دێوانە

وەلی دێوانە شاعیرێکی ڕەسەن بووە، ئیلهامی شیعری زیاتر لە سۆزی ناو دڵ و خەیاڵی دەروونی وەرگرتووە، نەک بیری ناو مێشکی. شاعیرە کلاسیکییەکانی هاوچەرخی خۆی و پاش ئەو سەردەمەی تیایدا ژیاوە شایەتییان بۆ داوە کە شاعیری چاک بووە. ڕەنجووری ستایشی کردووە و نامەی بۆ نووسیوە و بەهۆی کۆچی دواییەوە ماتەمنامەی بۆ داناوە. مەولەوی بەدێوانە لە قەڵەمی داوە، گۆیا لە ئەنجامی دڵداری لەگەڵ شەم شێت بووە و ڕووی کردۆتە بیابان.

شیعری وەلی دێوانە لە ڕووی ڕوخسارەوە لە شیعری میللی سەرزار نزیک دەکەوێتەوە، وشەی ئاسان و ڕستەی سفت بەکاردێنی، لە قافیە و ڕیتمی ناوەوەی شیعر وەستایە، شێوازی تێکەڵاوە لەبەر ئەوە دەتوانرێ شیعری خەڵکی دیکە یا شیعری میللی سەرزار بکەونە ناو شیعری ئەوەوە، هەروەها پێچەوانەش دەبینرێ وەکو ئەوەی شیعری وەلی دێوانە بەناوی یەکێکی دیکەوە تۆمار کرابێ.

سروشتی شیعری وەلی دێوانە و ژیانی دڵداری و گێڕانەوەکانی بەسەرهاتی ئەم دڵدارییە لەلای خەڵکی خۆشەویستیان کردووە، بۆیە هەندێ لە شیعرەکانی وەرگێڕاونەتە سەر دیالێکتی کرمانجی خوارووی (سلێمانی) و کراون بەگۆرانی و لەسەرزاری زۆربەی گۆرانی بێژانن. پیرەمێرد دەستێکی باڵای هەیە لەم وەرگێڕانەدا ، هەندێکیانی وەکو خۆی وەرگێڕاوە و هەندێکی دیکەیانی بەدەسکارییەوە. ئەم کارە لە ڕووی هونەری و پەروەردەییەوە لەوانەیە کارێکی بەجێ بێ بۆ ئەوەی خەڵکی کورد ئاگاداری سامانی نەتەوایەتی خۆیان بن، بەڵام لە ڕووی پاراستنی بەرهەمی ئەدەبییەوە پێویستە ئەم بەرهەمانە وا وەربگێڕێن وەکو شاعیر خۆی داینابوون.

### نموونەی شیعری وەلی دێوانە

سەرتاپەی شیعری وەلی دێوانە بۆ شەم وتراوە، هیچ تاقیکردنەوەییێکی هەستی لە مێشکی شاعیردا نەبووە بێ ئەوەی شەم لە خەیاڵیدا بێ، لە زۆربەی شیعریدا ناوی شەمی هێناوە، ئەگەر تووشی لیریکی وا بین ناوی دلبەرەکەی نەهێنابێ، لە ناوپێچی مانا و وێنە شیعرییەکاندا دەتوانین ئەو کیژە دڵڕفێنەی شاعیر بەدی بکەین. دەتوانین بڵێین وەلی دێوانە ژیان و هەست و هیوا و ئامانجی هەمووی لە پێناوی ئەو

کچە خەرج کردووە، ئەگەر لێمان بپرسن مەبەسەکانی شیعری شاعیر دیاری بکەین وەرامی پرسیارەکە لە ڕستەیێک پێکدێ «هەرچی شاعیر وتوویەتی بۆ شەم بووە».

١- سروشت بۆ دلبەرە و کوژراوی ئەوە

لە پارچە لیریکێکیدا وەلی دێوانە دەڵێ:

گوڵەن چەمەنەن گوڵەن چەمەنەن
وەمەیلت دیدەم گوڵەن چەمەنەن
وەهارەن سەوزەن ئاوەن پای کاوەن
هاژەی وەفراوان شاخەی شەتاوەن
تەمەن دووکەڵەن گەردەن غوبارەن
فرمێسکەن چەمەن سەیلەن فووارەن
سەنگەن کۆسارەن سەرکۆ هەن هەردەن
وەنەوشەن شەوبۆن گوڵەن یا وەردەن
سەرِعیەن شەیدان نەجدەن مەجنوونەن
فیراقەن وەسڵەن یامالەن هوونەن

شاعیر دیمەنێکی جوان و ڕەنگینی بەهاری هەورامانی کێشاوە، ئەم هەموو سروشتە تەڕ و ئاودارە شێت و شەیدای بیابانی نەجدە چونکە مەجنوون لە دووری لەیلا پەرێشان بووە و گیانی سپاردووە. وەلی دێوانە لێرەدا ناوی شەمی نەهێناوە، هەروەها ناوی لەیلاشی نەهێناوە، بەڵام مەبەسی ئەم دوو دلبەرەیە، خۆی لەگەڵ مەجنوون بەراورد دەکا. بەلای شاعیرەوە بەهاری تەڕی کوردستان هەر وەکو هاوینی وشکی نەجدە، ئەگەر دڵداری لە گۆڕێ بێ.

٢- یاران نە جەرگم

«یاران نە جەرگم» شیعرە لیریکییە بەناوبانگەکەی وەلی دێوانەیە، لە کوردستان بەتایبەتی، لە وڵاتی سلێمانی لەسەر زاری خەڵکییەوە بەئاوازی پڕ لە سۆز دەیچڕن. گۆرانیبێژ تەنیا بەشێوەی خۆی نایڵێ کە شاعیر دایناوە، بەڵکو دەسکاری دەکەن و دەیهێننە سەر دیالێکتی کرمانجیی خواروی ناوچەی سلێمانی. پیرەمێرد دەستی لەمەدا هەیە و ئەم شیعرەی وەرگێڕاوەتە سەر شێوە قسەکردنی خەڵکی سلێمانی:

یاران نە جەرگم یاران نە جەرگم
من (شەم) شێوەیێ تیر دان نە جەرگم
هەر وەخت کە مەیۆ ئاکام مەرگم
ئامانەت کەفەن نەکەن وەبەرگم



بەو شەرت نەشۆران حاشیەی ئەندامم
نەواکم پێش بۆ زوخاو نەزانم
شەهید وەبێ غەسل بێ کەفەن خاسەن
هەرکەس شەهیدەن هوون بێ قەساسەن
بەڵام وەسیەتم جە لاتان ئیدەن
ئەر سەد دوور نە خاک گۆڕخانە و زێدەن
با هەر مەزارم نە ڕای خێڵان بۆ
نە گوزەرگای (شەم) جەبەڵ گێلان بۆ
میلێ وە ئەندام بەژن و باڵای (شەم)
بکەن بەفەرقم بەبێ زیاد و کەم
تاقێ هەر نە تەرح تاق ئەبرۆی ئەو
بسازن نە فەوق مەزارم جە نەو
بنیان نە ڕووی تاق مەجمووعی فەردم
بنویسان وەدەست شەست ئەو مەردم
تا هەرکەس وینۆ میلی مەزارم
بزانۆ کوشتەی ئەو (شەم) ڕوخسارم
خوسووسەن ئەو (شەم) تاتاری چینەن
نە سەحرا بێزار جەبەڵ نشینەن
بەڵکم وێش قیسمەت جە ڕاگوزارێ
ڕاش گنۆ وە سەر گڵکۆی من جارێ
بزانۆ زەدەی دەست وێشەنان
داخ وەگڵ بەردە حەسرەتکێشەنان

گەلێ لە شاعیران وەسیەتنامە یا ماتەمنامەیان بۆ خۆیان نووسیوە، ئەوەی ئاشکرایە ئەم دوو مەبەسە لە ناوەرۆکی شیعردا دوو شتی جیاوازن بەڵام لە یەکترییەوە نزیکن و زۆر جار تێکەڵی یەکتری دەبن، بێگومان ئەو شاعیرەی لەپێش مردن بۆ خۆی دەلاوێنێتەوە مەبەسی وەسیەتە، ئەوەی دەیەوێ بەخەڵکی بگەیەنێ دەری دەبڕێ بۆ ئەوەی لە دوای مردنی داواکانی بگەیەنرێنە ئەنجام.

لەم وەسیەتەدا وەلی دێوانە کەسی لەبیر نەبووە لە شەم بەولاوە، خۆی بەشەهید داناوە، بێگومان جێی بەهەشت دەبێ، کوشتەی دلبەرەکەیەتی، بەڵام ئەو خۆشەویستە تاوانبار نییە، چونکە ئەگەر ئەو نەبوایە،

شەهید نەدەبوو، شەهیدیش نەبێ بەهەشتی مسۆگەر نییە. تا لەو بەهەشتەدا بە شەم شاد دەبێ پێویستە گۆڕی بەو شیعرانە هەڵبەسترێ کە بۆی وتوون.

**٣- «شەم»ی ناسک**

وەلی دێوانە پەردە لەسەر پەیکەری «شەم»ی خۆشەویستی لادەبا و بەم ڕەنگە وەسفی لەش و ناز و نیاز و کردەوەی دەکا:

نازک ناز (شەم) نازک ناز (شەم)
نازک لارەولەنج غەمزە و ناز (شەم)
نازک قەوس قاش مودرەت ساز (شەم)
نازک بالا سەوڵ سەر ئەفراز (شەم)
نازک لەب شەهد شەکەر ڕێز (شەم)
نازک تەبەسسوم قەند ئامێز (شەم)
نازک گەردەن مینای بەرز (شەم)
نازک سینە ساف سەدەف تەرزا (شەم)
نازک زولف دێز عەنبەرین (شەم)
نازک ڕێزەی ڕاز شەکەرین (شەم)
نازک دندانان گەوهەر دانە (شەم)
نازک نەخش خاڵ لووتەوانە (شەم)
نازک دوو بازوو پەنجە و دەست (شەم)
نازک ئەنگوستان خەنابەست (شەم)
نازک پێشانی پەرشەوبەند (شەم)
نازک شێوە شۆخ شا پەسەند (شەم)
نازک زەنج زەڕ زەنەخدان (شەم)
نازک شاماران بان شام (شەم)
نازک دوو قەندیل قودرەت بەند (شەم)
نازک نازکی کەمەربەند (شەم)
نازک دیدەمەست پەڕ خومار (شەم)
نازک بینی خاس ئەلف وار (شەم)
نازک ئەو بەیاز بناگۆش (شەم)



نازک ئەگریجان سەر نە دۆش (شەم)
نازک نان موشک عەنبەر بار (شەم)
نازک ساق و سیم میناکار (شەم)
نازک دوو گۆنای گوڵ دەستوور (شەم)
نازک چارە بەدر پەڕ جە نوور (شەم)
نازک ڕەفت و خاو خەرامان (شەم)
نازک نازکی بێ ئامان (شەم)
یاشا هەر (شەم) بۆ بەو تەور شێوەش بۆ
هەزار پەروانە چون من لێوەش بۆ
ئەسپەردەی قەندیل شای نەجەف ماڵ بۆ
بە دواز بالاش جە زوان لال بۆ

لەم شیعرەدا وەلی دێوانە ویستوویەتی وەسفی شەم بکا بە وشەیێک «نازک»، هەروەها ویستوویەتی لە هەر ڕستەیێکی کورتی وەسفیدا ناوی «شەم» بهێنێ، لەبەر ئەوە وشەی «نازک»ی کردووە بەسەرەتای هەموو نیوە دێڕی شیعرەکەی و «شەم»ی کردووە بەپاش قافیە، بێگومان ئەمە ئاواز و ریتمێکی تایبەتی داوەتە شیعرەکە و گوێی مۆسیقی بەئاسانی وەریدەگرێ.

بەراوردە ڕەوانبێژی و جوانکارییەکانی وەلی دێوانە لە دەستووری شیعری کلاسیکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نەچوونەتە دەرەوە، بەڵام ئەوە هەیە سروشتی ڕەنگینی ناوچەی هەورامان بەشیعرەکانەوە دیارە، بێجگە لەمە هەڵوێستی خوێنەری کورد بەرامبەر ئەم شیعرە بەخاوەنەکەی دەگۆڕێ کە وەلی دێوانەیە، بەو کەسە دەگۆڕێ کە بۆی وتراوە ئەویش «شەم»ە، لەبەر ئەوە شیعرەکە ئەگەر وەسفێکی حیسسی موجەڕەدیش بێ، وەک سۆزێکی بەکوڵ دەکەوێتە بەرگوێ چونکە عاشقێکی ڕاستەقینە بۆ کیژێکی نموونەی جوانی و ڕەوشتی چاک وتوویەتی.

٤- وەلی دێوانە لەگەڵ شەم دەدوێ

ئەم گفتوگۆیەی وەلی دێوانە بەرەو ڕوو نەبووە. شاعیر لە کونجی خەیاڵ دانەنیشتووە ئەم شیعرە بنووسێتەوە و لە پاشانا لەبەری بکا، ئەوجا لە شەم بگەڕێ و بیدۆزێتەوە و بەرامبەری بوەستێ و شیعرەکەی بۆ بخوێنێتەوە، ئەمە ڕووی نەداوە، ئەوەی ڕوویدابێ ئەوەیە لەگەڵ ئەوەی هەمیشە و هەرگیز شەم هەر لە خەیاڵیدا بووە، بەڵام لە دەمێکدا تارمایی دلبەری نازدار لەسەر دڵی شاعیر سێبەری کردووە، ئەمە ئیلهامی داوەتە شاعیر ئەم دێڕە شیعرانە بۆ تارمایی پەیکەری جوانی شەم بگێڕێتەوە.

هەی (شەم)ی شەوان هەی (شەم)ی شەوان
هەی (شەم)ی شەریف شەوچرای شەوان

هەی سولّتان من هەی ڕۆحی ڕەوان
هەی بینایی عەین دیدەی بێ خەوان
هەی سولّتان من کۆچ کەردی سالار
هەی زولّف جە بۆی عەتر موشک نافدار
هەی ئاهووی ڕەوێلّ نساسل کەرد
هەی تەشریف وە ملّک لەیلاخان بەرد
هەی عەنبەرین خالّ سەوسەنی کلاف
هەی خانی خانان سیامالّی جاف
هەی من دێوانە زولّف و خالّی تۆم
هەی من پەروانە پەڕ زوخالّی تۆم
تۆ جارێ نامەی وەسەر وەختمدا
هیچ نەدیای وە ئێش زام سەختمدا
نەپەرسای ئەحوالّ من پەی تۆ چۆنم
چون ڕەوانەن زۆخ زام دەروونم
بێ مروەتیت کەرد هەی (شەم) دەربارەم
هەر من پەی تۆ قەیس سیاستارەم
هەوای سەربەرزی ئێلاخان کەردی
ئەی (شەم) حەیفت کەرد من جە یاد بەردی
وادەمان ئەورۆ کە ڕۆی دیوان بۆ
مەر حەق بسانۆ حەق من تۆ
وەرنە تۆ وەشبای (شەم)ی سەولّ قامەت
وادەی من و تۆ کەوتۆ قیامەت

له نیوەی یەکەمی ئەم شیعرە لیریکییە وەلی دێوانە قسە لەگەلّ «شەم»دا دەکا، لە سەرەتای هەموو نیوەدێرێک بە«ئەی» بانگی دەکا، واتە ئاووڕی لێ بداتەوە و گوێ لە قسەکانی بگرێ، دیارە قسەکانیش هەمووی ستایش و پێداهەلّدانە بەسەر جوانی و مەزنی شەم. لە نیوەی دووەمی شیعرەکە گلەیی لێ دەکا چونکە ئاووڕی لێ ناداتەوە، لێی ناپرسێ و گوێی لێ ناگرێ. بەڕاستیش ئەڤینی شاعیر کە تووشی مەینەتی کردووە هۆی بنچینەیی «شەم»ی نازدارە، مەگەر لە ڕۆژی حەشر بگاتە ئەنجام و بەبەهەشت کۆتای بێ.



٥- خۆشەویستی جافان

«شەم» بەلای وەلی دێوانەوە تەنیا سەرپشک و خۆشەویست و دیار و جوانی ناو هۆزی جاف نییە، بەلّکو جوانی جوانانی کیژی هەموو ڕووی سەر زەوییە، لێرەدا شاعیر دەیکا بەکیژی جاف بۆ ئەوەی ببێ بەرەمزی کوردەواری خۆمالّی. لە لیریکییەکەیدا دەلّێ:

مەحبووبی جافان مەحبووبی جافان
مەحبووبی بێ عەیب تایفەی جافان
سەر قەتار پۆل عەنبەرین نافان
سەرکێش ڕوێلّ موشکین کلاّفان
ئاهووی مدبرماس مەکان نە هەردە
چووزەی سەنگەرچەی نەساسلّ کەردە
خاوێر خالّدار خەتا و ختەن مالّ
تەتار نە هەردەی شۆخ شیرین خالّ
وەتەن نەزامەن سەربەرز لەیلاخ
سەید سەکوان سەیادان بێ داخ
چەرخ و چەم سیا چوست چالاک پەڕ
شەیدای شکار جۆ چنگ وە هووناو تەڕ
لاچین شەش دانگ سەحەر جەلان خێز
شمقار تیژبالّ توند و چاپوک خێز
شەم شابەسەند گشت سیابانان
نام تۆم نە بەزم خوسرەوان وانان
بەو شەوق و جەمین (شەم) ڕوخسارەوە
کێت نەداوە دەم گەڕەی نارەوە
بەو قاش قەتران دلّ پێ ئێشاوە
ستوون یانەی کێت نەکێشاوە
بەو دیدەی سیای سورمەی سای سێوەنگ
موژانت وەهوون کێ نەکەردەن ڕەنگ
بەونیم نیگای ناز پێواری پەردە
ئاخر کێت نەکەرد وە ئازیز مەردە

بەو باڵای نەوتووڵ وە ئەو ڕستەوە
بەو کۆکۆی کڵاف دەستە دەستەوە
ئێستە دڵ جە کێت نەستانان وەزۆر
ئاخر یانەی کێت نەکەردەن خاپوور
من دێوانە بیم جە داغ تۆوە
داغ نیان وەبان دەماغ جە تۆوە

ژیانی کۆچەری بەڵگەی تێکەڵی و سەربەستییە، زۆر شت دیارە، نهێنی کەمە. وەلی دێوانە ئەگەر لە ژیانی دەشت و کۆچەری کراوەش نەبێ و هەموو کچی کۆمەڵی نەدیبێ «شەم» هەر سەرپشک دەبێ، چی جا لەو ژیانی جافەتیدا هەموو کچێک دەبینرێ، کەس لە پەنا ناژی کەچی «شەم» لەناو هەموویاندا دەدرەوشێتەوە. شاعیر گەیشتۆتە باوەڕێک تەنیا «شەم» شایانی ئەوەیە پەیمانی دڵداریی پاکی لەگەڵدا ببەسترێ.

٦- «شەم» لەیلا و زولەیخا و هەموو ئەوانی دیکەیە

وەلی دێوانە کۆمەڵێک نازەنینانی مێژووی دڵداری لە گێتی خۆشەویستیدا کۆ دەکاتەوە بۆ ئەوەی هەموویان لەناو «شەم»دا بتوێنێتەوە یا «شەم» بکا بەڕەمزی هەموویان. لە شیعرە لیریکییەکەیدا دەڵێ:

وەخاڵی تۆوەن وەخاڵی تۆوەن
نووری لیقای حەق وەخاڵی تۆوەن
شوعلەی (شەم) وەشەوق جەمالی تۆوەن
دەردینان وەداغ کەمالی تۆوەن
(لەیلا) کەنیزەک (شیرین) بەندەتەن
(زولەیخا)ی میسری وەزەڕ سەندەتەن
(هومەیلا)ی زەریف (بەلقیسا)ی باڵدار
(گوڵشاد)(گوڵەندام)(عەزرای) گوڵعوزار
یەکایەک حەیران بەژنی باڵاتەن
باڵای نەونەمام سەولی ئاڵاتەن
(دڵارام)ی دەور (سەمەن بۆ)ی پەری
پەنجەی (بیژەن) زوهرە و مشتەری
(خەرامان) حەیران حوسنی زێباتەن
گوڵ جەمینی ڕەند جان وەفیداتەن



حۆرانی جەننەت فریشتانی فەرش
سەناخوانتەن جە زەمین تا عەرش
گوڵ بەگوڵستان وەداخی تۆوەن
داغداران وەداغ دەماغی تۆوەن
هەرچەند پەروانان هەن جە ساراوکۆ
گشت ماتەن جە شەوق شەم ئەفرۆزی تۆ
من چون پەروانان هەر جان فیدای تۆم
هیجرانی جەمین بەزم ئارای تۆم
وەسەرگەردت بام شای سپی شەمان
سەرگەردانی تۆم دوڕ جەهام دەمان
بەعەشق خاڵی وێت خاتر شادم کە
یا ڕوخسەت یا مەرگ یا ئازادم کە
ئێستە بەو چینم تۆ لادی سازبە
جە گشت عەزابێ گەردەن ئازادبە

لەم شیعرەدا ئەوە دەردەکەوێ شاعیر شارەزایی لە مێژووی دڵداریدا هەیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئەو جوانانەی ناوی هێناون لە حیکایەتی ئایینی و گێڕانەوەی ناو خەڵک وەرگیراون، لە دواییدا ئەم حیکایەت و گێڕانەوانە تەنیا لەناو ئەدەبی میللی نەنووسراو (فۆلکلۆر) نەمانەوە بەڵکو ڕۆمانی شیعری بەرزیان لێ دروست کرا. جگە لەوە ئەو کچە جوانانە بوون بە «بووکی شیعر» لە ئەدەبی کوردی. لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەمینەوە «شەم»ی وەلی دێوانە بوو بەبووکی شیعر و چووە ڕێزی ئەوانی دیکەوە.

٧- گیانی وەلی دێوانە لەژێر پێی «شەم»دا

لە پارچە شیعرێکی کورتی لیریکی وەلی دێوانە موناجات لەگەڵ «شەم»دا دەکا، چونکە لەو زیاتر کەسی دیکەی نییە، ڕاز و نیازی بۆ هەڵدەڕێژێ و دەڵێ:

چراغ عەبدال کەم چراغ عەبدال کەم
شەرت بۆ جە داغت وێم وە عەودال کەم
سەرتاپای باڵام سیا زوخاڵ کەم
تەرکی ئەی دنیا و ئەهل و عیال کەم
دڵەی پڕ دەردم پارە پارەکەم
ڕیشەی جەرگ وێم وەقەنارەکەم

هەر شـەو تا سـەحـەر من شـومـارەکـەم
ڕەقـــیـــبی بەدگـــۆ پێش ئاوارەکـــەم
مـەر ئەوسـا دڵم خـاڵی جـە غـەم کـەم
جـەسـتـەم وە پا بۆس پای سـپی (شـەم) کـەم

وەلی دێوانە بێ پەروایە، بەلای ئەوەوە هەموو کردەوەیێکی بەرامبەر بەشەم نزمی تێدانییە و کارێکی کامڵ و بەرزە، لەبەر ئەوە زۆر ئاساییە ئەگەر لەشی بکا بەڕێباز و شەم بەپێیە جوانەکانی بەسەریدا تێپەڕ ببێ یا پیاسەی لەسەردا بکا، لەو کاتەدا شاعیر پێیەکانی ماچ دەکا.

٨- وەلی دێوانەی دێوانەی بیابان و هەردانە

وێنەی ڕاستەقینەی هەستی سایکۆلۆجی وەلی دێوانە بەرامبەر بەخۆی بەپێی ڕەوشتی کۆمەڵایەتی لەم پارچە شیعرە لیریکییە کورتەدا دەردەکەوێ، شاعیر دەڵێ:

چۆڵ نشـــینە خـــۆم چۆڵ نشـــینە خـــۆم
چون قـەیس مـەجنوون چۆڵ نشـینە خـۆم
ئـارەزوومـــەندی دوو بـێ دیانـە خـــۆم
ڕەفـــیـــقی وەحـــشی وێران یانە خـــۆم
دوورکـەفـتـەن وەتەن هەراسـانە خـۆم
مـەحـرووم مـەجلیس گـشت خـاسـانە خـۆم
قـامـەت غـەم زەدە ڕیسـوای عـامـە خـۆم
شـەیدای بێ هۆشی عـەقڵ و فـامـە خـۆم
بێ قـەدر و قـیـمـەت جـە لای ناسـە خـۆم
تەن لوخـتی عـوریان بێ کـراسـە خـۆم
شـەرمـەندەی عـەشـرەت سـەر ئەفگندە خـۆم
ڕووسـیـای دەرمـاڵ خـودا و بەندە خـۆم

شاعیر لەم شیعرەدا بەچاوی کۆمەڵ تەماشای خۆی دەکا، نەریت و خووڕەوشتی کۆمەڵایەتی ڕێگە بەو جۆرە دلّدارییە نادەن کە وەلی دێوانە تووشی بووە. بۆ «شەم» هیچ جۆرە تەنگوچەڵەمەیێک لە خەوش و شوورەیی لە گۆڕێ نییە، هەمووی بەسەر وەلی دێوانە دەشکێتەوە. لەو دەمەی شاعیر ئەم شیعرەی وتووە خۆی بەتاوانبار زانیوە بەرامبەر بەخۆی، بەڵام بەگشتی تاوانبار نییە، هەرچی بۆ شەم بکا ئەوپەڕی ڕاستی و دڵسۆزی و سەربڵندییە.

***

وەلی دێوانە شاعیرێکی بەدیمەنی کوردە لە سەدەی هەژدەمدا. ئاسۆی شیعری لە ڕووی ناوەرۆکی



بابەتەکانی شیعرەوە فراوان نییە، بەڵام لەو جۆرە شیعرە دلّدارییەی ئەو دەستی داوەتێ، دەتوانین بلّێین سەرپشکی هەموو شاعیرانە. مەبەس لەو شیعرە دلّدارییە ئەوەیە هەمووی بۆ تاقە دلبەرێک وتووە ناوی «شەم» بووە، تەنیا وەسفی ئەو کیژەی کردووە لە گێتی دلّداریی ئەو نەچۆتە دەرەوە.

شیعری وەلی دێوانە لە ڕستەی ئاسان و سفت و ڕەوان پێکهاتووە. ئاوازی سوارە، قافیەی بێ خەوشە، لە ئەدەبی میللیی سەرزارەوە نزیکە، مەشقی تێکەڵکردنی دیالێکتەکانی گۆرانی و کرمانجیی خوارووی تێدایە، یا هیچ نەبێ لە ماوەی دوو سەد ساڵدا شیعرەکانی لە کرمانجی خوارووی سلێمانی نزیک بوونەتەوە.

پێوەیە، ئایا لە سەردەمی ئەودا دیالێکتی کرمانجی سەروو لە ناوچەی هەریر لە ناوەوە بووە؟ ئەمە ئاشکرا نییە، لە پاشانا دەتوانین بڵێین لە تەمەنێکی دیاریکراودا لە ناوچەی هەکارییەوە هاتبێ بۆ سۆران و لە هەریر ناوبانگی دەرکردبێ و لەوێ کۆچی دوایی کردبێ.

عەلی خەڵکی هەکاری بێ یا سۆران، هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ و خۆی و شیعری سەر بەرێنیسانسی ئەدەبی کوردین لە باکووری کوردستان. یەکەمین کەس بووە لە بزووتنەوەی شیعری کوردیدا بەشداری کردووە.

**شیعری عەلی هەریری**

تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم لەناو کۆڕی ڕۆشنبیرانی کورد بەرهەمی شاعیر لە ناوەوە نەبوو. خەریک بوو گومان لە بوونی دەکرا، ئەگەر گەواهی خانی و حاجی لە ناوەوە نەبووایە ڕەنگ هەبوو بەیەکجاری لەبیر بکرایە. بەڵام لە دواییدا لە ئەنجامی کۆششی مامۆستایان و ڕۆشنبیرانی کورد و ئەدەب دۆستانەوە بایی ئەوەندە شیعری عەلی هەریری کەوتە ناوەوە کە ڕاستی قسەکانی خانی و حاجی بسەلمێنرێن. ئەو شیعرانەی دەست کەوتوون لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە وەکو لای خوارەوەن:

**١- لە ڕووی ڕوخسارەوە**

ئەو بەرهەمە شیعرییانەی عەلی هەریری ئێستا لەژێر دەستدان لە ڕووی کێشەوە هەموویان شێوەی چوارینی هەشت سیلابی و قافیە (ا ا ا ب)یان هەیە، ئەم کێشە لە کێشە سووکە خۆماڵییەکانی فۆلکلۆری کوردییە بەهەموو دیالێکتەکانیەوە. تەنیا بەرهەمێکیان نەبێ، ئەگەرچی ئەویش وێنەی ئەوانی تری هەیە بەڵام هەر دێڕێکی لە ڕووی کێشەوە حەوت کەرتی سیلابییە.

لایەنگرانی کێشی عەرووز چوارینە هەشت سیلابییەکانی عەلی هەریری دەکەنە یەک دێڕە شیعری عەرووزی، کە لە دوو نیوە دێڕێک پێکدێ (سەدر و عەجز)، ئیتر سەدر دەبێتە دوو ڕستە و عەجزیش دەبێتە دوو ڕستەی تر، بەم جۆرە سێ ڕستە لەسەر یەک قافیە دەبن و ڕستەی دواییش لەسەر قافیە گشتییەکەی شیعرە عەرووزییەکە دەبێ. ئەمە «موسەممەت»ی پێ دەڵێن. ئەم دیاردەیە لە «غەزەل و قەسیدە»ی خوارووی کوردستانیش دەکەوێتە بەرچاو کە لە ئەنجامی ڕێنیسانسی ئەدەبی کوردی لە خوارووی کوردستاندا لەسەر دەستی نالی پەیدابوو.

شیعری عەلی هەریری سووک و ڕەوانە، وشەکانی لە فەرهەنگی گشتی زمان هەڵبژێراون. ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی مانای شیعرەکان دیار و ئاشکرابێ. زۆربەی وشەکانی لە ژیانی کۆمەڵایەتیی ڕۆژانەی ئەدەبێکی میللی بەرز کە لە نێوان قوتابخانەی شیعری ئیسلامی ئەتنۆلۆجی (ئیسلامەوی)و شیعری کوردی فۆلکلۆری خۆماڵی دەوەستێ.

**٢- لە ڕووی ناوەڕۆکەوە**

دڵداری مەبەسی بنچینەیی شاعیرە، دلبەر شۆخێکی بێ هاوتایە، شیعرەکانی تەرخانکردووە بۆ پێداهەڵدانی ئەو. بەشوێن وردە وێنەی سروشت دەگەڕێ بۆ ئەوەی لەگەڵ دلبەر بەراورد و بەرامبەری بکا.



پێوەندی نێوان شاعیر و دلبەر ئەو هێزەیە کە «عەشق»ی پێدەڵێ. ئەم دڵدارییە ئەو دوو ئادەمزادە لە یەکتری نزیک دەکاتەوە. شاعیر پەنا دەباتە بەر هەندێ وشە و زاراوە و وێنەی کە سۆفییان بەکاری دەهێنن، بەڵام ئەم کۆششە شیعرەکانی نابەنە ناو گێتی نهێنیی سۆفیزمەوە، بەڵکو هەندێ وێنەی وەسفی سۆفیزم دەدەنە دەست، لەبەر ئەوەیە شیعرەکانی عەلی هەریری لە چوارچێوەی دڵداری و سروشت و بەهەوای ڕۆمانتیکییانە و دیمەنی هەست پێکراوی کلاسیکییانە ناچنە دەرەوە.

**شیعرە لیرییەکانی عەلی هەریری:**

-١-

پەریزادە توو هاتی
ل سەر چاڤێن د من شالا
مە لەوزانی توو هاتی
ژ دەنگێ تەوق و خرخالا
ژ دەنگێ بازن و زەندا
نەما عەقلێ عەقلمەندا
هندی من گۆت سی و چەندا
تو چێتر بووی ژ هەڤالا
تو چێتر بووی ژ لەیلایێ
شرینتر بووی ژ زولەیخایێ
مەم و زین هەر دوو یەک تایێ
سیا زولفێ کرم تالا
سیا زولفێ تو ناترسی
ژ ئەحوالی مە ناپرسی
موبارەک بیت تە ئەو کورسی
تو ڕوینی گۆه د عەبدالا
تو روینی گۆه بدە بەیتێ
ل پێشی تو وەکو زەیتێ
د سۆژیت مەجلیسا مەی تێ
وەکی پویشێ ل کەندالا
وەکی تە ڤنووس بێ پەروابم

دەخۆم سوندێ جودا نابم
حەزینم ئەز قەت تێر نابم
ژ دیدارا خەت و خالا
ل دیدارا تە ئەز زین کەم
حەتا کەنگی ڕوح تێ تەن کەم
کەسەر بووم جارەکی بێن کەم
خودانا بتت و دەسمالا
خودانا تیت و جەبهەت بی
خەراج و ئەرد و قیمەت بی
دیداری تە ب قیمەت بی
ل عید و جەژن و سەرسالا
ئەووەل کار و کەسێ من توی
یەقین فرنا دەرسێ من توی
کەسێ من و بەسێ من توی
ل زێڕ و مال و پر نالا
ل زێڕ و مال و پڕ ڕەنجم
کەسادم ساحیبی گەنجم
ل باژێرا گوهەر سەنجم
سەفەر دویرە هەتا مالا
سەفەر دویرە شەبی تاری
ئەی (عەلی) بۆ! تو پڕ باری
دا بکەین زیکرێ جەببـاری
بەلکی لەمە خوەش بت شالا

ئەم شیعرە نموونەی لیریکی ترادیسیۆنی ڕۆژهەڵاتییە. شاعیر لەگەڵ دلبەر قسە دەکا، هەر خۆی دەدوێ و یار نایێتە وەرام و دیالۆج (گفتوگۆ) دروست نابێ. ئاشکرایە کە دلبەر لەبەر جوانی لە نەژادی ئادەمزاد چۆتە دەرەوە و لە نەوەی پەرییانە، یا حۆری بەهەشتە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەسیما و ئەدگار ئادەمزادە، چونکە خۆی بەخشڵ ڕازاندۆتەوە، ڕەوتی خان و خەرمانی پڕ لە نازی تۆق و تەلیسم و دوگمەی سەر مەمکان و خرخاڵی پێ و بازنی دەستی دەبزوێنێ و ئاواز و مۆسیقایێکی نهێنی دروست دەکا. ئەو دەنگ



و ئاوازە لە زرەی خشڵ و چەکی ژنانی تر ناکا، شتێکی تایبەتییە، لەبەر ئەوەیە شاعیر هەر کە گوێی لە دەنگی ئاوازی خشڵی ئەو ببێ دەزانێ ئەوا پەریزادە و ناز و نازکی بەژیان دەبەخشێ.

پەریزاد لەلای شاعیر نەک تەنیا جوانە بەڵکو دروشمی دڵداریی ڕاستەقینەیە، لە نموونەکانی دڵداریی کوزمۆسیش تێپەڕی کردووە، لە زولەیخای فیرعەونی و لەیلای عەرەب و زینی کوردیش باڵاترە.

-٢-

خەلقینە وەرن ببینن
چ حوسنەک ب کەمالە
حەیران ژ دل ببینن
ژ سونعا زولجەلالە
سونعا خودێ کو دایی
سەفحە ژ نوور دانایی
عەنبەر ل سەر کێشایی
ئەبرۆ وو خەت و خالە
خالێن شویهی عەنبەری
دێم هەر وەکی قەمەری
ئەز تێرنابم ژ نەزەری
من ناچت ژ خەیالە
من قەت ناچی ژ بیرێ
زولفێت شەبێ هەریرێ
ل سەر بەدرا مونیرێ
داگرت بوون هیلالە
ئەبرۆ هیلالا عیدێ
ئەبلەق شەبێ ناهیدێ
دێم هەروەکی خورشیدێ
جەبهەت مەها کەمالە
جەبهەت مەها تەڤاقە
ڕوو سۆرگولا خوناڤە
ڕحان هاتنە هنداڤە

نەسرینان دا وو پالە

نەسرینان جوقت بەستە
من نێری پێ هەوەستە
عەقلێ من چوو ژ دەستە

حەیران کرم دەرحالە

حەیران بووم ئەز ژ دنێ
سۆهتم ژ دەست ئەڤینێ
ژ خۆ ناکم هیڤیا ژینێ

لم کێم بوون ماه و سالە

موسحەفا خەت و خالان
مەتنی ژ لام و دالان
ژ بەر زەحمەت و ئیشکالان

کەسێ ناکەت موتالا

ژ چاڤان خوون دباری
ژ بەر ئەبلەقێت خوماری
وەکی ئاڤێت تێ جاری

بێ وەقت و بێ مەجالە

گەردەن شووشە نەباتێ
لێڤ شەربەتا حەیاتێ
ژ حوسنا بت و لاتێ

ب من جاه و جەلالە

وەسفێت د نازەنینان
مەدحێت د خوون شیرینان
وەک دوڕ و یاسەمینان

ئەز هەردکم ئەمالە

باغێ کو سەد بهار لێ
سونبول و لالەزار لێ
چەند کولیلکێت ب خار لێ



بلبلی نالە نالە

مەحبووبە بێ هەمتایە
قامەت سەروی بالایە
گێسوو شەڤا یەلدایە

گەردەن ب خۆ شەمالە

گەردەن شەمعا کافوورێ
پەردە ل سەر ژ نوورێ
ڕەونەقی دا ڤە نوورێ

تەجەللا کر جەمالە

تەجەللا کر بۆ جارەک
حوسنا خۆیا موبارەک
ئەحسەنەڵڵا تەبارەک

چ شەمسە بێ زەوالە

زولفێن د شەهلەوەندان
بسکێن مەحبووب و ڕەندان
ئێخستمە قەید و بەندان

بەردانە ڤە مەحالە

چاڤێ د شۆخ و شەنگان
غەمزێت د دل فەرەنگان
دل داڤێ بەر خەدەنگان

خوون ڤەخارن حەلالە

مەحبووبا دل نەوازان
عالەم قڕکر ب نازان
بلندا سەرفرازان

قەت نابێژت وەبالە

ژ هیندێ بکن تاراجێ
ژ میسرێ بینن خەراجێ
ژ ڕۆمێ بستینن باجێ

ژ بۆ خەملەیا دەلالە
دێما خالێت د هوور لێ
ئەینا زولفێت ستوور لێ
ڕەونەقا کۆهێ توور لێ
مەحبووبە بێ میسالە
حوسنا تە یا حەبیبە
دلێ من ژێ غەریبە
عەلی تو بکی نەسیبە
دەست بدەین ویسالە
حوسنا تە یا دلخاهە
دلبەر لبسی سیاهە
ب من کەعبەتوڵلاهە
تەواف دکم هەر سالە
ژ هیندێ بینن تالانی
بکرن کلێ سوبحانی
ژ بۆ چاڤێ سوڵتانی
دەما تێتن سەرسالە
چەند بێژی (عەلی) سادیق
ژ ئەسرار و دەقایق
ژ وان وەسفێ د لایق
ژ حوسنا یا دەلالە

لەم شیعرەدا شاعیر خەڵکی بانگ دەکا بێن و ئەو جوانەی کە دۆزیویەتییەوە ببینن، دیارە جوانەکە بەلای ئەوەوە پەیکەرێکە نەوەکو تەنیا لەبەر ئەوەی پەیکەر قەت ناشیرین نابێ و هەموو ئەندامی ڕێکوپێک دەبێ، بەڵکو لە گێتیی گیان دەبیاتە دەرەوە بۆ گێتیی مەتریالی، بەتەواوی دەبێتە پەیکەرێکی جوانی هەمیشەیی. وەسفی ئەندامە هەست پێکراوەکانی دەکا. خەت و خاڵ دەم و چاوی ڕازاندۆتەوە، زولف بۆنی عەنبەر دەپژێنێ، برۆی کەوانی وەکو مانگی یەک شەوەی جەژنی ڕەمەزان، گەردنی بلوورینە، لێوی سەرچاوەی ئاوی ژیانە. ئیتر شاعیر دەبێ حەیران بێ لە دەست دڵداری چونکە بێ بەشە لەم هەموو گەنجینە جوانە، هەمیشە کار و پیشەی گریە و زارییە و لەباتی فرمێسکی ئاسایی خوێن لە چاوی دێتە



خوارێ. ئەمەش دیارە نەوەکو تەنیا بەشی شاعیرە، بەڵکو بەشی هەموو کەسێکی خاوەن هەست و جوانی پەرستە.

-٣-

دلێ مەحزوون کەفارەت بێت
کە ئیمشەب تازە میهمان تێت
ب مزگینی بەشارەت بێت
کە میهمان جانی جانان تێت
کە میهمان جانی جانانە
ل سەر چەهڤێ مە میهمانە
ب مالا جوملەیی خانە
کە شاهی جوملەیی خان تێت
وەرە ئەی شاهیدێ شیرین
ژ عەشقاتە دل ئێخسیرین
ب جان مەنزلگەهی میرین
تەلەبکارێ کە سوڵتان تێت
تەلەبکارێن دل ئارایییم
مە دیم یارێن بویی شاییم
ل بەژنا عەرعەرین داییم
سیەه مار لێ ب جەولان تێت
سیەه ماران کرە سەیران
ل جۆتێ شبهەتێ حەیران
کو خاس و عام ببوون حەیران
ل جەیران عەنبەر ئەفشان تێت
دوو زولفێن عەنبەر ئەفشانن
دوو لەعلێن شەککەرستانن
عەقیق و دوڕ و مەرجانن
ل حەوزان ئابی حەیوان تێت
عەجیب بر کە مراری تێ

ل سەددێ قەوسێ تاری تێ
سیەه پەنجین خوماری تێ
ژ مەخمووران دو ئەسلان تێت
ژ مەخمووران تو مەخمووری
بەجێ هێشت عەقرەبا ژووری
تەوافا بەیتێ مەعمووری
ل برجان خوون ب سەیران تێت
عەقاریب هات و بێ حەد هات
ل وێ برجا زەبەرجەد هات
ل بالا قەوسێ ئەسوەد هات
ل تەلبەی ماهی تابان تێت
ل هەیڤا کەوچەرین کامل
ل ئەهلان ڕا نەهشتن دل
ل جوملەدا سەفێن سونبول
ل هنداڤێ گولستان تێت
گولستانا خوەدا ڕەستە
ل چار ئەتراف دلال خوەستە
بنەفش و نێرگزا مەستە
جنسری لەعل و ڕەیحان تێت
ڕەیاحین سووسن و وەردن
ل شێخ عەلی یێ غەریب فەردن
وەرستی ئەحمەر و زەردن
هەڕۆ سەد جار د ئەفغان تێت
ژ ئەفغانان نەمایم تیر
دوعاگۆیی تە ئەزبی ڤیر
ببیتە شەر دوو ئەسلەح دیر
حەتتا ڤی قاسیدێ جان تێت
ببینە ڕەوشە مالینێ



وەرە هنداڤی بالینێ
ژ دەست ئاهان و نالینێ
چ ڕەنگ فەریاد ژ ئاسمان تێت
ب فەریاد و ب هاوارە
ژ دەست ئاهان من ئەو کارە
مە لازم بەندەیی ژارە
ژ سەییدێ چ فەرمان تێت
سەییدی حەق نەزەر ڤێرا
د ئیقلیمان عەلەم گێرا
ڤیتارا گەوهەران ڤێرا
ژ نێڤ کانا بەدەخشان تێت

عەلی هەریری مژدە دەداتە دڵی و پیرۆزبایی لێ دەکا کە لە پاش چاوەڕوانییێکی درێژی پڕ لە مەینەتی بەجانی جانان شاد بوو. هەر چەندە ئەو خۆشەویستە «گیان»ە، بەڵام شاعیر دەیخاتە ناو پەیکەرێکی هەست پێکراوی بینراو، دیارە ئەو پەیکەرە تا باڵابەرزتر بێ جوانتر و دڵگیرتر دەبێ. هەموو بزووتنەوەی ژیان لە دلبەردا دەبینێ، ئەمە هێز و توانای پێ دەبەخشێ. جووتێ مار (بسک)ی هەیە، عاشقانی پێ دەترسێنێ، لەعل و عەقیق و دوڕ و مەرجان (لێو و دەم و کولم)ی خۆشی و ژیانی هەمیشەیی بەعاشق دەبەخشن، چونکە ئاوی دەمی ئاوی حەیاتە.

ژیانی خۆشی لە بەهەشت دایە، بەهەشتیش لەو پەیکەرەدا هەستی پێدەکرێ، هەر ئەندامێکی بەدیمەن گوڵێکە، بەناوەرۆکیش بۆنی گوڵەکەیە، دیارە نەمریشە، چونکە کە دیمەن ون دەبێ بۆن هەر دەمێنێ.

-٤-

دیسان لە عیشقا دلبەرێ
سەر تا قەدەم سووتام ب نار
چاو مامزێ گەردەن زەرێ
ستاندی ل من سەبر و قەرار
ستاندی ل من سەبر و سوکوون
قەد عەرعەرێ گەردەن ب خوون
زولفێ د شۆخ وەستان ب جوون
تا تا ل سەر را هاتنە خوار

تا تا ل سەر را راخوشین
عەقل و دلم هەردووک فڕین
ئەی دلبەرا حالم ببین
ل دلم دەرین تیری ب خار
ل دلم دەرین تیری ب پەڕ
لەت لەت بوین جەرگ و جەگەر
سێ سەد حەکیمم بێنە سەر
بیللا شیفام نابێ چ جار
بیللا ل بۆم نابێ شیفا
چەندم هەنە جەور و جەفا
سووتام گەلۆ زەی قەفا
زام و برینم سەد هەزار
زام و برینم بێ حیساب
عیشقی حەبیبێ ماهتاب
دل ماهی یێ بەحری عەزاب
برین کرن ل منی هەژار
برین کرن ل منی غەریب
گەر بۆم بێتن هەزار تەبیب
بێ مەرهەما دەسلا حەبیب
چون دۆزەخە بێ وەسلی یار
بێ وەسلی یاری دل ڕوا
بێ گولهوزاری جان فیدا
جەننە و نەعیمیش بێتەجا
شوبهی سەعیرە پڕ ل نار
شوبهی سەعیر پڕ ئاگرە
دۆزەخ گەلەک لەو چاترە
ناری فیراق دژوارترە
جان و جەگەر تێک هاتنەخوار



جان و جەگەر تێک هەروەشان
فەریاد ل دەستێ مەهوەشان
دایم ب دل چون واوشان
سەر تا قەدەم خوون و جۆبار
خوون د ڕژێ جاری دکم
شەب تا سەحەر زاری دکم
بێ خاب و بێ زاری دکم
قەت ساتەکی نادا قەرار
قەت ساتەکی نابم سوکوون
عیشقی حەبیب کردم زەبوون
پری سیا چشما ب خوون
ئیرۆ ل (عەلی)یێ هەژار

لەم شیعرەدا شاعیر هێشتا بە دلبەری شاد نەبووە و چاوەڕوانیەتی، ڕۆژگاری چاوەڕوانی بریتییە لە سەردەمی نەخۆشی شاعیر، ئێش و ئازاری لە دووری یارەوەیە، دیارە یار دەبێتە پزیشک تەنیا بە سەردانێکی برینەکانی نەخۆشی تیمار دەبێ. شاعیر بەشوێن هەموو ئێش و ئازارێک دەگەڕێ، هەمووی لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، تەنیا نەخۆشییێکی نییە، بەڵکو دوچاری هەموو نەخۆشییەکانی گشت ئادەمزادی سەر ڕووی زەوی بووە. چاوەڕوانە و هێشتا یاری پزیشک نەگەیشتووە.

شاعیری کوردی ڕۆژهەڵاتمان ئەگەر نەتەوەی ئازاد بوایە، ڕەنگ بوو بەم شێوەیە بیری نەکردایەوە، ئیتر هەستی بەژێردەستی کردبێ یا نەکردبێ، هۆشیارانە یاری کردبێتە دروشمی ئازادی یا بێ ئاگایانە، ڕاستی ژیانی تایبەتی خۆی و نەتەوەکەی وای لێ کردووە لە ئەقڵی ناوەوەیدا عەودالی ئەو یارە جوانە (ئازادی)یە بێ، ئیتر هەرچی ناخۆشی هەیە لە خۆیدایە و هەرچی خۆشی هەیە لە یاردایە، گەیشتن بە یار، کە خۆشی هەمیشەییە، هەموو ناخۆشییەکە دەسڕێتەوە هەتا هەتایە.

-٥-

هەرچی شێخ و مریدن
کو بێژن قەد وەناکم ئەز
ئەگەر ڕووحم دکن غارەت
ژ یاران را بنۆشم ئەز
بلا ساقی مەیی بینت

ژ یاران را بنۆشم ئەز
ژ کەربا جوملە سالووسان
دەرێ کۆپان ڕەواکم ئەز
هەچی شەملەک لەسەر پێچا
ئولاچیک لفک ژێ بەردا
ئەگەر سینگی دنێڤ راکت
دەبێ ساحێب سیواکم ئەز
مەکن باوەڕ ژ سەرکەسکا
ئەگەر شاشک ژ نوورێ بت
دگەل کەزی یێ دبت کافر
دبێژن ئەسڵی باکم ئەز
ژ سەرکەسکا مەکن باوەڕ
د جەهلێدا دبن کافر
دبێن ئەز شێخێ سافی مە
ب جارەک قەت چاکم ئەز

لێرەدا شاعیر گەلێ ساکارانە لە هەندێ لایەنی پراکتیکی نێگانیڤی سۆفیزم (دەروێشیزم) دەدوێ. وا پیشان دەدا کە خۆی لە «وشکەسۆفی»یان نییە و سۆفی ڕاستەقینەیە و لە دەستی یاران بادەی مەی وەردەگرێ و دەینۆشێ. بەڵام دیارە ئەم جۆرە شیعرە دەچێتە ناو شیعری پەروەردەی کۆمەڵایەتییەوە، هیچ پێوەندییێکی بەداهێنانی ئەدەبی سۆفیزمی پرتەوییەوە نییە. ئەم بابەتە ناوەرۆکە لە سەدەکانی داهاتوودا شێوەی سیاسی - کۆمەڵایەتی وەردەگرێ بەتایبەتی لە سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا.

-٦-

گەر هوون ببینن نارێ عیشق
تێن ل بۆ من زاری دکەن
هەر کەس د زانێت حالێ عیشق
بەخیل و دژواری دکەن
ب حالێ عیشق بەخیل دبم
هەردەم ب دەم زەلیل دبم
بێ راه و بێ دەلیل دبم



هەر کەس ب غەم خواری دکەن
هوون بار مەکن غەمێن د زۆر
ژ حەسرەتا دەردێن د مۆر
چاڤێن د ڕەش بسک تێن ل دۆر
عەینا ژ نوور تاری دکەن
عەینا ب نوور زولف تێن ل سەر
ڕەنگین دبن شەمس و قەمەر
ڕەش مار ژ حەبسان تێنە دەر
ل عەرعەرا یاری دکەن
خۆش عەرعەر و شەمسا دوو قەد
ژ من ڕەڤان سەبر و خیرەد
داد و مەدەد، ئاه و مەدەد
چەشمان چ خەمماری دکەن
جۆتێ خوماران کرمە دەف
تەفسیر دکەن سونعێ سەدەف
ڕۆژ خەملین هەر چار تەرەف
ب مسکێ تاتاری دکەن
بسکان ل ڕووی نێ بوونە کۆم
جامێ مەیی ئینا ژ بۆم
حوکمێ دەکر لازم ڤە خۆم
مەستی ل من جاری دکەن
مەستی شەراب و قەندەڤێ
یێسیر و بەندێت ڤێ شەڤێ
گەر وەسفێ یاری ئەز بڤێ
هوون تەرکی هوشیاری دکەن
هۆشم چوو بوو مابووم د هۆش
هەردەم بەدەم لەوتێن ب جۆش
مێرا قەوی زەوق و خرۆش

ب شاهی خوندکاری دکەن

ب شاهی وان دان و کەرەم
خزمەت دکەن تورک و عەجەم
مریدێ عیشقێ دەم ب دەم

ل نەقشێ جەبباری دکەن

نەقش و نیگارێ نەقاشان
دیوان و وەسفێت شاوشان
هەی هەی ل جۆتێت پادشان

عەجەب خۆش سەرداری دکەن

سەردارا شاها ڕەونەقە
موعجیزا ڕەمزێت ئەبلەقە
(عەلی) و مەبێژە ئەحمەقە

ل بازار ئینکاری دکەن

وەسفی ڕووکەشی یار لەلای عەلی هەریری هەموو بەرهەمەکانی گرتۆتەوە. بێگومان گەلێ وێنە و ڕووداوی داهێنراوی ڕەسەنی دووبارە و سێ بارە کردۆتەوە. بەڵام لەمەشدا وەستایەتی نواندووە بەوەی شێوەی دەربڕینی وێنە و ڕووداو لە جارێک بۆ جارێکی تری گۆڕیوە. بەپێی دەستووری «دڵداری» دەبێ هەمیشە خۆی «بەندە» بی و یاریش «شا» بێ. بەڵام کە لە دێڕێکی چوارخشتەکییەکەدا دەڵێ «هەی هەی ل جۆتێت پادشان» مەبەسی جووتە شاکانی تورک و عەجەم (عوسمانی و سەفەوی)یە نەک کیژە جوانەکەی شای دڵداری. ئەم دوو دەوڵەتە لەو ڕۆژگارانەدا لە هەڕەتی زەبر و زەنگیان بوون بەتایبەتی لەناو خاکی کوردەواریدا، شاعیر پیاو دەخاتە بۆشاییێکی پڕ تەم و مژەوە، بەوەی «شا» کە «یار»ە، بەرامبەر دوو سوڵتانەکەی تورک و شاکەی عەجەم دادەنێ، یاری خۆی دەناسێ بەڵام نازانێ ئەم دوو شایە چۆن سەرداری دەکەن، ئایا دادپەروەری لەگەڵ هاووڵاتیان دەکەن یا خەریکی شتێکی ترن!؟ دیارە زەبر و زەنگی «یار» کارێکی بەجێیە، بەڵام زۆرداری سوڵتان و شا نابەجێیە.

-٧-

دیسان ژ نوو عیشقا بەری
پڕ ئەندەروونم ئاتەشە
زولفا موزەییەن عەنبەری

دەعوا د گەل خالا ڕەشە



خالا ل دێمی دل ڕەڤا
سەد ڕووح و جانم بن فیدا
سۆتم گەلۆ چوم تێ نەما

تەرکم کرن عەقل و هوەشە

عەقل و هوەشم بوونە ئەسیر
دونیا کو گەهـ گەهـ تێتە بیر
دێم شوبهەتا بەدرا مونیر

زولفان ژ وەردێ بێن خوەشە

وەردان ژ نێڤ زولفا دەرین
شوعلا بنەفشێ تێ وەرین
بالا وو قەددا عەرعەرین

هەژیان ل سەر مارێ ڕەشە

دیسانێ حەی تێت و دچێت
ئەحیایی ئەمواتان دبێت
وەجهان مودام نوو ژێ دچێت

دێم شوبهەتی شەمعا گەشە

شەمعا شەبستانێ ئەوە
وەردا گولستانێ ئەوە
سرڕێ تەبستانێ ئەوە

شۆخا حەریرێ دل گەشە

عەجیب لەتیف و جندییە
ئەزمان نەزان و ڕۆمییە
ئاگەهـ ژ عیشقبازان نییە

مەست و خومار و سەرخوەشە

سەرخوەشێ جاما شەربەتێ
حووری د باغێ جەننەتێ
دێم شوبهی شەمعا زولمەتێ

سەردارێ چەندین مەهوەشە

مـەهوەش كـو وەسـتـــان سـەف بەسـەف
ئەو هاتە دەر مــــيـــــســـرێ د كـــەف
وان گـــۆت (عـــەلی) بۆ(لاتخف!)
مـــە ب مـــردنێ قـــەوی خـــوەشـــە

بێگومـان هەمـوو شـتێكی بەهێز و پاك و جوان لە خۆشـەويسـتدا كۆ دەبێـتەوە. ئەو شـۆخەی لەناو مێشك و دڵـی عەلی هەريری دايە كـچێكی كوردە، بەڵام لە كوردايەتی بێ بەش دەكـا و دەبێ بەرۆمی (تورك)، كە بێ بەش بێ مانای ئەوەيە كوردی نازانێ، كە كوردی نەزانێ ديارە لە گفتوگۆدا ناگەنە هيچ ئەنجامێك، ئەمەش مەبەسی بنچينەيی شاعيرە، بۆ ئەوەی خۆشەويست بێ پەروا لەسەر سەركێشی خۆی بڕوا.

***

عـەلی هەريری بەم كـۆمـەڵە شيـعرەی بەڕاستی دەتوانێ خۆی بكا بەيەكێك لە شاعيـرە گەورەكـانی ڕینیسـانسی ئەدەبی كوردی لە باكووری كوردسـتـان. گومـانيش لەوەدانييە كە بەرهەمی گەلێ زياتر بووە لەوەی لەبەردەست دايە، با ئەوەش وترابێ گـۆيا «ديوانێكی بچـووكی هەيە». لە ڕووی ناوەرۆكـيـشـەوە لەگەڵ هەڵسوكەوتی كۆمەڵی كوردەواری بەتايبەتی و كۆمەڵی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە سەدەی شازدەمدا دەگونجێ.

## بەشی یازدەم

# فەقێ تەیران

**١٥٦٣ - ١٦٤١**

هەبوونە دەنگبێـژ و شـاعـیـر
ب ڕووح و دل ڤـە پر فـەقـیـر
مـیـر و بەگـارا سـتـرانە
بێ قـیـمـەت و مـەلوول مـانە

### ژیانی

ئەگەر خۆشەویستی میللەت بگاتە پلەییێکی بەرز بەرامبەر بەیەکێک لە گەورە پیاوانی خۆی لە ڕێزی ئادەمزاد دەری دێنن و دەیکەن بە دروشمێک لەودیو گێتی دەژی، بەمە دەبێتە نموونەی گێڕانەوەییێکی ئەفسانەیی. بەم جۆرە چۆن فەقێ تەیران گێتییێکی جوانی لە داهێنانی شیعری سۆفیزم دروست کردووە، هەر واش میللەتی فەقێ لە ژیانی فەقێ گێتیێکی جوانی ئەفساناوی دروست کردووە. بەڵام فەقێ تەیران شاعیرێکی داهێنەرە، ئەگەر زمانی باڵندەشی زانیبێ - بۆ ڕێز لێ گرتن ئەمەیان بۆ هەڵبەستووە - هێشتا شیعرەکانی لە زانینی زمانی چۆلەکە پڕ هونەرترن.

ناوی محەمەدە، بەفەقێ تەیران ناوبانگی دەرکردووە. خەڵکی قەزای مۆکس «مکس Miks»ی ناوچەی هەکارییە، لە دەوروبەری ساڵی ١٥٦٣ لە گوندی «تەیران» لەدایک بووە، ئەمە دەکەوێتە نێوان «مۆکس» و «هیزان» و تا ئێستاش ئاوەدانە. زۆربەی ژیانی لە مۆکس بردۆتە سەر لە گوندی «وەرەزووز»ی سەر بەمۆکس، لە ساڵی ١٦٤١ کۆچی دوایی کردووە، هەر لەوێش نێژراوە، ئارامگای بەڕێزەوە لەلایەن خەڵکییەوە زیارەت دەکرێ. «میم و حێ = م ح» نیشانەی نازناوی بووە، لە شیعردا بەکاری هێناوە، ڕەنگە ئەمە لە تیپی یەکەم و دووەمی «محەمەد» وەرگیرابێ وەکو بچووککراوەییێکی ناوی خۆی. ئەوەی پشتگیری ئەم قسەیە دەکا ئەوەیە لە دێرێکی بەیتی «هەی ئاف و ئاف...»دا سێ تیپی «میم، حێ، دال»ی ناوی خۆی کە «محەمەد»ە بەکاردێنێ «هەر میم و حێ و دال ببێژ...»

ئەحمەدی خانی کە شانازی بە سێ شاعیری کوردی پێش دەوری خۆی کردووە، شاعیرێکیان فەقێ تەیرانە، خانی دەڵێ:

کـەیفـەک وە بدا فـەقـێـهی تەیران
حـەتتـا ب ئەبەد بمایە حـەیران

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە ناو و ناوبانگی ئەم شاعیرە کەوتۆتە ناو تۆمارکراوەکانی کوردناسانی ئەوروپا. ئەلێکساندر ژابا دەڵێ: فەقێ تەیران سێیەمین شاعیری کوردە لە دوای عەلی هەریری و مەلای



جزیری لە باکووری کوردستاندا. محەمەد فەقێ تەیران لە قەزای «مۆکس»ی ناوچەی هەکاری ژیاوە، چیرۆکی «شێخ سەنعان» و «بەرسیس» و «قەولی هەسپێ ڕەش»ی بەشیعر هۆنیوەتەوە. شیعری فەقێ ڕەسەن و بەهێز و جوانە، نازناوی «میم حێ» بووە.

گەلێ هەواڵ و سەر و سەربردە لەبابەت فەقێ تەیرانەوە دەگێڕڕێتەوە، وەکو ئەوەی لە چیرۆکی شیعری «شێخ سەنعان» ئەوە نووسراوە، چیرۆکەکە لە هۆنراوەکانی میر محەمەدە کە بەفەقێ تەیران ناوی دەرکردووە. ئەگەر میر بووبێ دیارە میری مۆکس بووە، چونکە لەو ناوچەیە لە دایک بووە و هەر لەوێش ژیانی بردۆتە سەر. لەلاییێکی دیکەوە زانیاری وا لە ناوەوەیە کە وەلی خودایە و کەراماتی بووە و زمانی هەموو باڵندە و فڕندانی زانیوە.

فەقێ تەیران خوێندن و ژیانی ئاسایی لە ناوچەی هەکاری بووە، بەڵام ماوەییێک لە جزیرەشدا ژیاوە، بەتایبەتی لە ئاوەدانییەکانی «هێشت» و «فینیک». فینیک ئێستا گوندێکی بچووکە لەسەر زێی دیجلە لە باکووری جزیری بۆتان بە(٢٥کم) ناوچەییێکی گەلێ دێرینە، لە کۆنا «پیناک»یان پێ وتووە، مەڵبەندی نەتەوە هەرە کۆنەکانی باپیرانی کوردی ئێستا کاردۆخی و کورتییەکان بووە.

لەو زانیارییە کەمانەی لەبەردەستمان دایە لە بابەت ژیان و بەرهەمی فەقێ تەیرانەوە، لەگەڵ ئەو تێبینییانەی لە بەرهەمی شیعری شاعیرەوە دەست دەخرێن دەتوانین بگەینە ئەنجامێکی وا کە بڵێین فەقێ تەیران خوێندەوار و ڕۆشنبیرێکی چاکی سەردەمی خۆی بووە، شاعیر لەگەڵ ئەوەی شارەزایی تەواوی لە ئەدەبیاتی نەتەوە هاوسێکاندا بووە و بێگومان هەر بەهۆی زانستییەکانی موسڵمانییەوە کە بەزمانی عەرەبی بووە بە خوێندەوار ناسراوە، بەڵام نە ئەدەبیاتی فارسی کە لە ئەنجامی لێکدانی مەدەنیەتی نەتەوە موسڵمانەکان کاریان لێ کردووە، وە نە پێڕەوی زانستییە موسڵمانییەکانیشی کردووە کە بەزمانی عەرەبی بووە بۆ دانانی شیعرەکانی. هەروەها دەبێ ژیانی بە دەروێشی بردبێتە سەر و پێوەندییێکی زۆری لەگەڵ کۆمەڵی خەڵک بووبێ و بۆ چاکەی ئەوان کۆششی کردبێ و بەزمانی ئەوان شیعری وتبێ. هەر لەبەر ئەوەش لە میللەت نزیک بۆتەوە، بۆیە ناوبانگی فەقێ تەیران لە باکووری کوردستان لە مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی زیاترە، چونکە جزیری و خانی بەزۆری لەنێوەندی ڕۆشنبیر و خوێندەواراندا دیارن، کەچی فەقێ تەیران لەناو هەموو چینەکانی میللەتدا بەڕۆشنبیر و نیمچە خوێندەوار و خوێندەوارەوە خۆشەویستە.

### بەرهەمی

بەرهەمی فەقێ تەیران لە ڕووی ڕووخسارەوە نموونەی شیعری ڕەسەنی میللی کوردییە، لەبەر ئەوە لە بابەت وشەوە کوردی پەتییە، لە ڕووی داڕشتنی ڕستەوە ساکارە، لەمەڕ کێشەوە خۆماڵیی سووکە، لە ڕووی قافیەشەوە ڕەنگاوڕەنگە، لەبەر ئەوەیە لە ئەدەبی فۆلکلۆرییەوە نزیکە. وای لێ هاتووە هەندێ جار بەرهەمی شاعیر لەناو ئەدەبی میللی سەرزاردا ون ببێ، یا هەندێ ئەدەبی فۆلکلۆری بەناوی فەقێ تەیرانەوە تۆمار بکرێ.

جگە لەمە کۆمەڵێک لە بەرهەمی ئەدەبی میللی کەوتۆتە ناوەوە خاوەنەکانیان بەشانازییەوە خۆیان بەقوتابی فەقێ تەیران دەزانن، هەندێ لە بەرهەمەکانیان بەرەنگدانەوەی بەرهەمی فەقێ تەیران لە قەڵەم دەدەن، جگە لە بەرهەمێکی فۆلکلۆری زۆر هەمووی بەناوی فەقێی تەیرانەوە کەوتۆتە ناوەوە.

کۆمەڵێک بەرهەمی ئەدەبی کوردی نوێی سەر بەقوتابخانەی فەقێ تەیران ئێستا لە ناوەوەیە، لەمانە هەندێ لە بەرهەمەکانی عەتاری شەرۆ و ئارامی چەچان و عەگیدی ئەحمەد و شاعیری دیکەی کوردی قەفقاسی رووسیا.

بەشێکی زۆر لە بەرهەمی فەقێ تەیران گۆرانیبێژان بەگۆرانی دەیچڕن، وا باوە کە فەقێ تەیران خۆشی گۆرانیبێژێکی دەنگ خۆش بووە، شیعرەکانی خۆی بەدەنگ و ئاوازەوە بۆ خەڵکی وتووە، لەبەر ئەوە ئەم شیعرانە لەگەڵ ئەدەبی میللی سەرزار تێکەڵ بوون، چونکە لێیەوە نزیکن، بۆیە لە ئەدەبی میللی وەردەگرن و لە پاشانا هەر خۆشی دەبێ بەسەرچاوە بۆ ئەو ئەدەبە. لەبەر ئەوەی شاعیر زۆر خۆشەویست بوو لەناو خەڵکیدا بۆیە ژیانی بوو بەئەفسانە. کەسانی ساکار فەقێ تەیرانیان کرد بەشتێکی لە ئادەمزاد بەرزتر بەوەی زمانی باڵندە و دڕندە و زمانی گیاندار و بێ گیانی سروشت دەزانێ، ناوی تایبەتیی خۆی واتە «فەقێ تەیران» مانای «قوتابیی باڵندان» دەگەیێنێ. بەم جۆرە فەقێ بوو بەدروشمی ئەفسانە ئامێز لەناو گێتی ئەدەبی کوردیدا.

بەرهەمی شاعیر لە رووی هونەری شیعرییەوە دەکرێ بەدوو بەشەوە:

١- ئیپیک (ئێپۆس)، چیرۆکی شیعری، بەیت.

٢- لیریک: پارچە شیعرێ کە خەریکی دڵداری و سروشت و دانایی و فەلسەفە و ژیانی کۆمەڵایەتی و هەستی دەروونی دەبێ.

### ئیپیک

لە رووی ناوەرۆکەوە هونەرێکی یەکجار کۆنە، هەموو شاعیرانی کورد ئەوانەی کێشی خۆماڵییان بەکارهێناوە و پێڕەوی ئەدەبی میللییان کردووە ئەم هونەرەیان بۆ دارشتنی بیر و خەیاڵ و ئەندێشە و تێبینی بەرامبەر بەژیانیان بەکارهێناوە. دیارە ئەم جۆرە هونەرە لەسەر بنچینەی رووداو و گێڕانەوەی دڵداری و کۆمەڵایەتی و ئایینی و سۆفیزم و هی تر دادەمەزرێ، بێگومان کەم و زۆر گیانی ئیپیکی (مەلحەمی) تێدا دەبێ.

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە بەیتەکانی فەقێ تەیران لە رووی ڕوخسارەوە هەمووی لەسەر بەندی دوو بەیتی (چوارین)ی هەشت سیلابی قافیە (ا ا ا ب) دانراون، دێڕی چوارەم لە زۆربەی دوو بەیتی چیرۆکە شیعرییەکاندا بە «ەتێ» کۆتایی دێ.

فەقێ تەیران کۆمەڵێک چیرۆکی شیعری (بەیت)ی جوانی بۆ نەوەکانی کوردی داهاتوو بەجێ هێشتووە، هەرگیز شوێنی دیاریان لەناو گەنجینەی دەوڵەمەندی ئەدەبی کوردیدا هەیە، ئەو بەیتانە بریتین لەمانەی خوارەوە:



(١) شێخ سەنعان (٢) زەمبیل فرۆش (٣) دمدم (٤) هەسپێ ڕەش (٥) بەرسیسی عابید (٦) هەی ئاف و ئاف (٧) دلۆ رابە.

### شێخ سەنعان

بەسەرهاتی شێخ سەنعان دروشمێکە یا بابەتێکە بۆ ڕوون کردنەوەی هەندێ لایەنی فەلسەفی سۆفیزمی ئیسلامی کە بەشێکی گرنگە لە سۆفیزمی کۆزمۆسی پەیدا بووە. کورتەی رووداوی شێخ سەنعان بەم جۆرەیە:

«شێخ سەنعان موسڵمانێکی سۆفی بووە، دڵی چۆتە کچە گاورێک، بۆ مەبەستی نزیک بوونەوە لە خۆشەویست لە ئایینی موسڵمانی دەرچووە و بووە بەگاوور و زوناری لە پشتی بەستووە و لە دێری دیانان ژیاوە و بووە بە بەرازەوان. لە پاش ئەوەی کە چاوی بەکچەکە کەوتووە (یەکێتی بینین = وحدة الشهود) پشتی لە وڵاتی کچەکە کردووە و گەڕاوەتەوە مەڵبەندی خۆی، ئەمجارە کچەکە گرفتاری شێخ بووە. ئیتر سواری وڵاغ بووە و بەدوای کەوتووە، لە ڕێگە تووشی هاتووە، لە وڵاغ هاتۆتە خوارەوە و دەستی ماچ کردووە، شێخ لە خودا پاڕاوەتەوە کە گیانی بستێنێ، ئیتر عیزراییل پەیدا بووە و گیانیانی کێشاوە، بەم جۆرە لە بەهەشتدا بەیەکتری شاد دەبن».

ئەمە ناوەرۆکێکی داهێنەرانەیە بۆ ئەدەبیاتی سۆفیزم، چونکە موسڵمانێک لە ئایین وەرناگەڕێ، نوێژ بۆ چەلیپا (خاچ) ناکا، لە بەراز نزیک نابێتەوە چونکە گڵاوە. بەڵام سۆفیزم کە باوەڕی بە«یەکێتی بوون» هەیە، بۆی هەیە کردگار لە کچێکی جوانی گاوور ببینێ و هەردووکیان بکەونە سەر ئایینی ڕاست.

چیرۆکی شێخ سەنعان یەکێکە لە چیرۆکە بەراییەکانی سۆفیزم، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عەباسییەکان لە سەدەی نۆیەم (سێیەمی هیجری) پەیدابووە، لە پاشانا لە ئەدەبی نەتەوە موسڵمانەکاندا ڕەنگی داوەتەوە.

یەکەمین هەواڵ لە بابەت چیرۆکی شێخ سەنعان ڕەنگە ئەو گێڕانەوەیە بێ کە ئەبوحامیدی غەزالی (٥٠٥هـ/١١١١م کۆچی دوایی کردووە) لە کتێبی «تحفة الملوك»دا تۆماری کردووە، ئەو رووداوە لە بەسەرهاتی شێخ سەنعان دەکا. یەکەمین داستانی تۆمارکراوی بەسەرهاتی شێخ سەنعان چیرۆکە بەناوبانگەکەی فەریدەدینی عەتاری نیشابووری (٦٢٨هـ/ ١٢٣٠م کۆچی دوایی کردووە) بەناوی «شێخ سەنعان». بێگومان فەقێ تەیران ئاشنایەتی لەگەڵ ئەم بەرهەمە بووە، ڕەنگە ئاگاداری هەموو «شێخ سەنعان»ەکانی تریش بووبێ ئەوانەی بەزمانی فارسی و زمانە تورکییەکان هۆنرابوونەوە تا سەردەمی خۆی. «شێخ سەنعان»ی فەقێ تەیران تاقیکردنەوەیێکی تازەیە، جەوهەری چیرۆکەکەی لە گێڕانەوەی فۆلکلۆری ناو خەڵک وەرگرتووە، ئینجا شێخ عەتاریشی کردووە بەقارەمانێک لە قارەمانەکانی بەیتە ڕەنگینەکەی و دیمەنێکی داهێنەر و ناوەرۆکێکی پڕ مانای هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

لە سەردەمی ژیانی فەقێ تەیرانەوە تا ئێستا گەلێ دانەی دەسنووسی شێخ سەنعان کەوتۆتە بەردەستمان، لەناو ئەمانەدا دانەیێک لەو چوار دانەی کە لە نامەخانەی گشتی سانت پیترسبورگ

پارێزراون بوو بەبنج بۆ بڵاوکردنەوەی تێکستی ڕەخنەیی (کریتیکی) بەرهەمەکە و بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٦٥دا بڵاوکرایەوە. ئەم بەرهەمە بریتییە لە ٣١٣ دوو بەیت. ئەوەی پێویستە بوترێ ئەوەیە ئەلبیرت سۆسین زانیاری تر بەدەستەوە دەدا، گۆیا دەسنووسێکی شێخ سەنعانی دەست کەوتووە، هەروەها تێکستێکی تری لە گێڕانەوەی کوردێکی خەڵکی زاخۆ نووسیوەتەوە، ئەو تێکستە بەتەواوی وەکو ئەوەی دەسنووسەکەی پێشووە، تێکستی دەسنووسەکە ٣٣٤ دوو بەیتە، ئەو دانە دەسنووسانەی لە نامەخانەکاندا پارێزگاری کراون جگە لە نرخی یادگاری کەڵکێکی زۆریان هەیە بۆ ساغکردنەوەی بەراوردکاری و ڕەخنەیی لە پێناوی هێنانەدی دانەیێکی پوخت و تەواوی ئەم بەرهەمە.

ڕەنگدانەوەی بەسەرهاتی شێخ سەنعان لە ئەدەبی میللی کوردی لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا کەمتر نییە لە بەرهەمی کلاسیکی تۆمارکراو. لەوانەی بڵاوکراونەتەوە تا ئێستا بۆ نموونە ناوی هەندێکیان دەهێنین: «مەنزوومەی کوردی شێخ سەنعان» قادر فەتاحی قازی نووسیوتییەوە؛ «شێخ سەنعان» عەلی کوڕی محەمەدی ڕەوشەن لە ساڵی ١٨٠٨ تۆماری کردووە و محەمەد عەلی قەرەداغی بڵاوی کردۆتەوە، گەلێکی دیکەش.

### گەشتێک لە گێتی «شێخ سەنعان»دا

هەرچەندە ناوەرۆکی چیرۆکی شێخ سەنعان خەریکی بیروباوەڕێکی سۆفیزمی کۆزمۆسییە و لە سەرووی نەتەوە و ئایینەوەیە، بەڵام بۆ مەبەسی داهێنانی هونەری فەقێ تەیران شێوەیێکی نەتەوەیی و ئایینی داوە بەقارەمانانی چیرۆکەکەی لە ڕووی ڕوخسارەوە. شێخ سەنعان (عاشق) موسڵمان و سۆفییێکی کوردە، کچەکە (مەعشووق یا مەعشووقە) دیانێکی کچە ئەرمەنی یا کچە گورجە.

فەقێ تەیران باس لە دڵداری سۆفیزم دەکا، ئەو دڵدارییەی هیچ جۆرە سنوورێکی بۆ نییە. بەسەدان پیاوی ئایین (مفتی و شێخ و مەلا) تووشی دەبن، بەلایەوە پیاوانی ئایین کە پابەندی شەریعەتن دەبێ لە هەموو کەسێک دوورترین لە دڵداری، بەڵام بەلای ئەوەوە سۆفیزم (بزووتنەوە) لە شەریعەت (دەستوور) بەهێزترە، بۆیە ئەو پیاوە ئایینییانە تووشی ئەم دڵدارییە دەبن. بەلایەوە «یار» یەکێکە نابێ بەدوو، کردگاریش یەکێکە، واتە مەعشووق خۆیەتی، بەمە بەدیمەن دەبن بەدووان، بەڵام بەجەوهەر هەر یەکێکن:

ژ نینکا عەکس دبی
ئەڵڵا ژ جە نا قەلبی
مەحبووب یەکە نابی دوو دی
ئیللا کو شاهی حیکمەتێ

بەسەرهاتی شێخێک دەگێڕێتەوە ناوی سەنعان یا سەنعانیان بووە، لە ڕێکخراوی پراکتیکی سۆفیزمدا ڕێبەری پێنسەد سۆفی و مریدی کردووە:

شێخەک هەبوو سەنعانیان
سەرداری پانسەد سۆفیان



چووبوو مەقامێ ئەولیان
دایم د زیکر و تاعەتێ

شێخی پیری تەمەن حەفتا و حەفت ساڵ پیاوێکی پاک و بێ گەرد بوو، خاوەنی کەرامات بوو، حەکیم و دانابوو، نەخۆش و شێت و شەل و کوێری تیمار دەکرد، بیری لە زلف و خەت و خاڵی جوانان نەدەکردەوە:

مەعنا د مەجزووبان ئەڤن
مێری د باتین د خەڤن
لەو حال دبین د کەڤن
خەلقۆ ژ چە کەم تاقەتێ
جەزبە سیڕرە سیڕ خاتیمە
گرتن ب مێران لازمە
جیگە قەوی بن قایمە
ئیزار بکن ڤێ شوورەتێ

***

تاعەت دکر دایم مەدام
گەه ژ قوعوود گەه ژ قیام
حەفتێ و حەفت سالان تەمام
خالی نەبوو ژ خزمەتێ

حەلقەی زیکری شێخ نەوەکو تەنیا خەڵکی سەر ڕووی زەوی بەشدارییان تێدا دەکرد، بەڵکو مەلایەکەت و جنۆکەش دەچوونە ناویەوە:

مەلەک و جن ژ هەوایێ
د فرت شوبهەتی بایێ
تێتە نێڤ زیکر و سەمایێ
د وەقت و حینا دەعوەتێ

هەموو کەسێک شاگرد و مریدی شێخ بوون، گەورە و بچووک، هەژار و دەوڵەمەند:

ئەر غولام بوون ئەر ئەمیر بوون
ئەر گەدا بوون ئەر فەقیر بوون
تێکدا گۆهداری پیر بوون

ل عەشقێ دین و سوننەتێ

ئینجا شاعیر باس لە گۆڕڕانی دەروونی شێخ دەکا ، چۆن شیخ خەون دەبینێ، لە خەونیدا کچە جامێ مەی دەداتێ و سەرخۆشی دەکا ، لە ئەنجامدا شێت دەبێ، ئەم کرداره دەبێتە شوورەیی و ناوزڕانی وەلییێکی گەورەی وا لەناو کۆمەڵدا:

ژ دەفتەرا ساحیب جەمالان
شەرحی مەتنی زلف و خالان
شێخ تو جار ناکت خەیالان
تەبیعەتی شێخ نادەتێ
تەبعەتی حوسن و جەمالان
شێخ توجار ناکت بەبالان
یان ژ چئی یان ژ کالان
یان ژ خەوف و خەشیەتێ
خەشیەتی دل نالەنال بوو
عومرەکێ بێ حەد ل بال بوو
ری سپی بوو شوبهی کال بوو
ئەو فەنا بوو ژ قووەتێ
عومری وی بێ حەد جما بوو
یەک مووەک ڕەش تێ نەمابوو
حووریک دی وە تەما بوو
ڕۆهینا فەندێ کەتێ
ڕوهینا فەندێ گهشتی
حووریا بیکرا بهشتی
دی ل سەر بانێ کەنشتی
دی کوچ بانگ دکەتێ
باتینی کچ فە دەخوونی
پەردێ ژ بەر خوە هلتینی
شێخ د خەونیدا دبینی
جام و تاسەک مەی دەدەتێ



خەمر و شەراب پڕ دکە
شێخ د خەونێ دا فڕ دکە
نەزەر لییا دیم دڕ دکە
دین بوو دنێڤا خەلقەتێ
دنێڤا خەلفەتێ ئەو دین د بوو
تژی دەماغی خوون د بوو
شەیبا سپی ڕەنگین د بوو
ئەڤ حال و ڕەنگ قەد ژ نەتێ

یاران و مریدانی شێخ و هەموو خەڵکی شاری هێشەت بەگەوره و بچووکەوه دەکەونە پرسیار و گفتوگۆ و ناوبژی، بەڵکو دانایێکی وەکو شێخ کە خۆی ڕێی ڕاست بەخەڵکی پیشان دەدا لەو کارەی پەشیمان ببێتەوه و ڕێی ڕاست بدۆزێتەوه:

ئاه و فیغان دەربوون هەزار
هنگێ هەبوو دەروێش و یار
هەمیان ل شێخ کرن پسیار
باژار و ئەهلێ هێشەتێ
ئەهلی تەریق ئەهلی سولووک
هەرچی مەزن هەرچی بچووک
ئاغا وو خواجە وو مولووک
پرسین ل شێخ زەحمەتێ

بەڵام بێ سوود بوو ، شێخ گوێی نەدایە هیچ ئامۆژگارییێک، بەڵکو بەپێچەوانەوه، ڕەوت و کردەوەی گەیشتە ئەوەی مزگەوت بڕووخێنی و وێرانی بکا :

دێ مزگەفت وێران بکم
بەر بە دەرێ دێران بکەم
بچم گاڤەک سەیران بکم
بنی دنیا جوران لێ تێ

سۆفی و مریدان وازیان لێ نەهێنا ، بەرۆکیان بەرنەدا ، چونکە باوەڕیان بەم ڕێبەره گەورەیەی خۆیان هەبوو ، گومانیان لەوەدا نەبوو کە ئەم ڕەوشت و کردەوەیە نهێنییێکی تێدایە:

ئەو سۆفی ساحێب کەماله

بێ تەکەللوف چونە باڵە
حەمیان ژێ کرین سوئاڵە
ئەڤ چە ترسە ب سەر تەتێ

ئەڤ چە ترسە ئەڤ چە دەردە
مەوو تە نینە چو پەردە
ڤێ سڕڕێ ژ بۆ مە خەبەردە
دا ئەم بزانن هەیئەتێ

بەڵام شێخ هەر سوور بوو لەسەر بیروباوەڕ و ڕەوشتی، ئەوەی پێ ڕاگەیاندن هەتا ئەگەر عیسا و لوقمانیش تکای لێ بکەن، بەقسەیان ناکا و ئەو ڕێگەیەی گرتوویەتی بەری نادا:

شێخ گۆ حەکیم عیسا رابێن
لوقمان ژ تربان رابێن
داغا من هێدی نابێن
دەستێ حەکیمان لێ نەتێ

ئینجا شێخ باس لە حاڵی ڕاستەقینەی خۆی دەکا، بەوەی کردگاری لە جوانی ئەم کچەدا دیوە:

نارا کچێ داگرت هناڤ
دیا کۆ تێدا نوور و تاڤ
عەکسا ئیلاهی هاتە ناڤ
مەزهەر دەبە سەبر ژێ نە تێ

حوسنا کچێ بوو مەزهەرە
ئەو حۆریا دیم قەمەرە
شێخ دی بو جیهان چووبەرە
شەرم و ئەدەب قەت ژ نەتێ

سۆفی و مریدان تەماشای ڕووکەشی ئەم حەز لێکردنە سەیرە دەکەن، سەریان سوڕ دەمێنێ، پیرێکی وا تەمەن گەورە و بەساڵاچوو حەز لە کچێکی بچووکی وا تازە نەمام بکا! ئەمە بێگومان دەبێتە مایەی لۆمە و سەرزەنشتی و قسە و قسەلۆکی ناو خەڵکی:

ئەو پیرەمێرێ کاڵ بوبی
نێزیکی هەشتێ ساڵ بوبی
ژ عەشقا کچێ بەدحاڵ بوبی



دەرحەق بدین لێ لۆمەتێ

لەبەر ئەوە دەروێش و مریدان وای بەباش دەزانن لە شاری هێشەت باربکەن و بچنە دەرەوە بۆ ئەوەی مەسەلەی دڵداری شێخ لە خەڵکی بشارنەوە، ئیتر ڕوویان کردە مەڵبەندی کچی گاوور:

یا قەنج ئەوە مەستوور بکین
نابت سڕڕێ مەشهوور بکین
دایم ژ عامێ دوور بکین
ب دەرکەڤین ژ هێشەتێ

ژ هێشەتێ ب دەرکەڤین
پانسەد مرید ڤبەرکەڤین
پێشی کچا دلبەر کەڤین
زائیل بکین ڤێ حەسرەتێ

پۆلی دەروێشان بەزیکر و تەهلیلە بەڕێ دەکەون و لە شاری هێشەت دەچنە دەرەوە بەرەو مەڵبەندی کچی گاوور بۆ ئەوەی شێخ چاوی پێی بکەوێ، بەڵکو ئەمە ببێتە هۆی ئەوەی بگەڕێتەوە سەر ڕێی ڕاست:

سۆفی ژ عەشقان بوونە رەف
دەرویش د بەر شێخ بوونە سەف
چەرخان ددەن ب زیکر و دەف
ب دەشت و سەحرایێ کەتێ

لە مەڵبەندی کچی گاوور نزیک دەبنەوە، خاچ پەرستان و سەربازانیان دێنە دەرەوە و تەماشای زیکر و تەهلیلەی دەروێشان دەکەن:

کرهان و کۆ دۆلاب و ئاش
چەرخین ل بەر شێخ پێش و پاش
ما خاچ پەرست بێتە تەماش
ژ عەسکەران تەماشە تێ

کە پۆلی دەروێشان لە دێر نزیک دەبنەوە، زیکر و تەهلیلەیان گەرمتر دەکەن بۆ ئەوەی کچە گاوور لە پەنجەرەوە تەماشا بکا و ئەوجا شێخ چاوی پێی دەکەوێ:

حەمیان ژ دوورڤە ئەڤ فکر
ئەم دی ب جۆش بچینە زیکر

دا بێته پێش قیزا بیکر
دا شێخ ببینت سوورەتێ

کچە گاوور لە پەنجەرەوە خۆی پیشان دا:

دەنگی مریدان چوو فەلەک
دێرا کو راهیب تێ گەلەک
ئانینە پێش یا چاڤ بەلەک
هاتە شەباکا قیبلەتێ

هاتە شەباکا پەنجەرێ
کڤش بوو ژ سینگ حەتا سەرێ
ژ وی نەزەردا عەسکەرێ
بووکا دلی جەماعەتێ

ل زیکران کچ سەیری
مورشید وی دەمێ فکری
یارەب هەنە ئەڤ ڕەنگ پەری
نازک بەدەن ڤێ شوبهەتێ

حاشا هەبن ئەڤ ڕەنگ بەشەر
ڕۆژ بوو ژ شەرقێ هاتە دەر
بوونە قران هەردوو نەزەر
ئەحسەن ژ فەزل و نیعمەتێ

سەکنی پال دا شەباکێ
ساحیبی شەمل و سیواکێ
بروان ئانینە ز کاکێ
یوجندی ژ هەسپێ کەتێ

عاشق ل مەعشووقێ فەرجی
بەحرا ئەڤینێ حەجەجی
مورشید دخوونێ مەووجی
ژ تیرا کڤانی جەبهەتێ

نەسرانی یا زەرین گوهار



سۆفی کو شاد رەس ل بال
شێخ دەست ب دەست ئاڤێتەخوار
بێ هش کر و هش پێ نەتێ

سۆفی و مریدان کە جوانی کچە دەبینن دەڵێن شێخ ناهەقی نییە:

حەمیان کو دی ئەو ڕوو مەهە
قوچە کەتە بەر دەرگەهە
وان گۆتە هەڤ لۆمە نەهە
ئیرۆ ژ شێخ و خەلوەتێ

خەلقۆ ل شێخ لۆمان مکن
ئەڤ ڕەنگ پەری زولفان ڤکن
دەی عاشقان دێوانە کن
ژ تەبعی مەعشووقان وەتێ

لەپاش ئەوەی شێخ بەبینینی کچە گاوور شاد دەبێ، یا دەگاتە قۆناغی گەیشتن (الوصول) و یەکبوون (الاتحاد)، لە هۆش خۆی دەچێ، سێ شەو و سێ ڕۆژ بێ ئاگا دەبێ ئینجا دێتەوە سەر خۆی. زیاتر ئاگری دڵداری جەرگ و هەناوی دەبرژێنێ، تا دێتە سەر ئەوەی کە دەنگی ئەم نازەنینە بەلایەوە خۆشتر بێ لە ئاوازی بانگی نوێژ:

شێخ گۆتە وان لبسی قەبیح
دەنگێ کچا بیکرا مەلیح
نادم ب وێ بانگا سەحیح
دووزم ژ وێ سەمعیەتێ

ئەر عاقلن من تێک مەدەن
هوون شیرەتان بێ هوودە دەن
ئیرۆ کچا نازک بەدەن
نادم ب وێ جەمعیەتێ

مەجنوون کرم عاج گەردەنێ
ئەو ئەفعی یا ژ ڕەنگێ خەنێ
کوشتم ل ئەرزێ ئەرمەنێ
شەهمارە زلف و قامەتێ

ماری ملی وی گەستمە
ب زلفی نازک بەستمە
سانیعی سونعان خوەستمە
دا تێر بەبینم سنعەتێ

لە پاش ئەمە شێخ بەتەواوی بیروباوەڕی یەکێتیی بوون (وحدة الوجود) و یەکێتیی بینین (وحدة الشهود) ئاشکرا دەکا و ئەستووری فەلسەفەی سۆفیزمی کۆزمۆسی دەخاتە ڕوو، لە دێڕی یەکەمی چوارینی دووەمی داهاتوو (ناریێ فیراقا سەرتەمێ) ڕەنگە «سەرتەم» نازناوی مەعشووقەکەی بێ:

بێ ئیسم و جیسمی دلبەری
چ بکم ب ئاڤا کەوسەری
دێ ئیختیار کم سەقەری
نار خوەشترە ژ فرقەتێ

ناریێ فیراقا سەرتەمێ
واسیل دبیتە جەهەننەمێ
ئاگر دچیتە عەدەمێ
ئەسلەن برووسکەک ژێ نەتێ

خەلقۆ جەهێ ناڤ لێ جەحیم
ب بەرەکەتا شاهی ڕەحیم
دبیتە جەننەتا نەعیم
ژ بهن و بخوورا جەننەتێ

ئینجا سۆفییان دیسانەوە دەکەونە ئامۆژگاری، بەڵام بێ سوود، ئیتر دێنە سەر ئەو باوەڕەی کە شێخ واز لەم ڕەوشتە ناهێنێ:

مەجنوون سیفەت نابت ب کێر
مەجزوون بوویە ئەڤ پیرەمێر
شێخی مە وو ناقووسی دێر
بەو حوجەتا تەرکییەتێ

بەم جۆرە ناچار دەبن وازی لێ بهێنن و بەجێی بهێڵن:

سۆفی هەمو رابوون ژ بال
هشتی ل وێ ئەو پیرەکال



حەمیان ل سەر دینی بەتال
وان بێ حیساب کەرب ژ ڤەتێ

مرید و سۆفییان لە شێخیان دوور دەکەونەوە، بەڵام شێخ لە نزیک کچەکە دەمێنێتەوە، کچە بەچاوێکی بەرز تەماشای شێخ دەکا و ڕێزێکی زۆری لێ دەنێ:

ئیکرام کر دۆتا گورجییان
شێخ نەخوەش بوو رابوو پێیان
ژ بەر کچی و هەڤرییان
مەیلی کشاندە خزمەتێ

مەیلا حەبیبا دلبەرە
قامەت نەیا لەب شەککەرە
پرسی ژ شێخ چە خەبەرە
ب کۆڤە دچی ژ کۆڤەتێ

پاش ئەوەی شێخ باسی دڵداری و ئەڤینی خۆی بۆ کچەکە دەخاتە ڕوو کچە دەڵێ:

دلبەر دبێ یا میر مەزن
ئیرۆ ژ تە بێن کفن
تو محەمەدی نابی ژ بۆ من
ئەز عیسایی تو سوننەتێ

بەلای شێخەوە مەسەلە گەورە و بچووکی تەمەن نییە، پیرێکی هەشتا ساڵە و کچێکی چواردە ساڵە نییە، بەڵکو دڵدارییێکە لە پەیکەری مەتریالی لەش چۆتە دەرەوە، بەم جۆرە شێخ لە وەراما دەکەوێتە موناجاتەوە:

عەشق و مەحببەت ئیسمەکن
عاشق و مەعشووق جیسمەکن
هەر چار د هەڤدا قیسمەکن
شێخەک دڤێ مەعنی بدەتێ

شێخ گۆت تو نەجاتا منی
ئیحرام و میقاتا منی
نینک و میرئاتا منی
سەرتا پییان تێ روئیەتێ

سەر تا پییان تێک نینکی
میسباح و نوورا بێ شکی
لەب لەعلی سیما نازکی
تو میهریبا لەتافەتێ
تو ڕوهنیا میهرا شەفیفی
نینکا شێخی شەریفی
مەزهەرا شاهی لەتیفی
مەعدەنا وەحدانەتێ
یان مەعدەنی یان جەوهەری
یان سانیعی یان مەزهەری
یان عەکسا شاهی ئەکبەری
یان تێ ژ تە نەقشی روئیەتێ
کاتبی نەقشی لاڤی
شووشەیا ئاڤا گولاڤی
نوور ژ بالا تێتە ناڤی
نار ژ زەیتا حیکمەتێ
ئاگر و زەیتا فتیلی
پرتەوا ئیسمی جەمیلی
دا دلی شێخ قەبیلی
ڕوهنیا وەحدانەتێ

که لە موناجات دەبێتەوە، کچە بادەی مەی بۆ ڕادەگرێ:

ڕوهنیا دابوو وجوودی
ژ مەحبەتا شاهی وەدوودی
ناگەهان شێخ چوو سجوودی
مەی ڤەخودار د وێ ساعەتێ
ئەو مەیا گولگونە ئالە
دلبەری دایە پیالە
نۆشی جان کر پیرە کالە



با دەیا عافیەتێ

لە پاش ئەمە شێخ هەموو ئایینەکانی بوون بەدیان دەهێنێتە دی، زونار لە پشتی دەبەستی، خاچ بە ملییەوە دەکا، دەبێ بە بەرازەوان. وە بۆ ئەوەی بەتەواوی بێتە سەر ئایینی کچەکە واز لە قورئانیش دەهێنێ:

دلبەری جام دابوو دەستە
وی زونار ئانینە بەستە
زاهیری دین چوو ژ دەستە
باتینی چوو مەشیەتێ
شێخ گۆتە باتین ڤەکرم
عەشقا تە ئەز غارەت کرم
ئیرۆ دگەل تە کافرم
حەتتا کو دەورانا مە تێ
لەولەبی دەوران ب دوورن
گەه ل ژێرن گەه ل ژوورن
مەن و تە نۆبەت ب دوورن
تا زەمانی فرسەتێ
فرسەت و تالع و بەختە
هودهود و بەلقیس و تەختە
شێخ دزانی هێژ نەوەختە
وەخت د پەی سەبرێ ڤەتێ
سەبری بادە ڤەخوارە
وان ل پشتی بەست زونارە
شێخ مسحەفێ ئاڤێتە نارە
ژ مەسکری دینان ڤەتێ
حیکمەتا وان ڕەمز و ڕازان
مورشیدی ناز و نیازان
مەی ڤەخوار چوو بەر بەرازان
پێخاس د پێ وەحشان ڤەتێ

ئەو مورشیدی پێخاس و تازی
چوو ل سەر پۆستی بەرازی
سەدەفا دورِ تێ دخوازی
ژ هەر دوو لێڤان شەربەتێ

شێخ سالێکی تەواو دەبێتە دەرگاوان و بەرازەوانی دێر، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە هەمیشە کچە گاوور لە پێش چاوی بێ. لە پاشانا سۆفی و مریدان دێنەوە لای و پێی دەڵێن:

تو شێخ عەتارێ سادقی
ڕاست و دروستی خالقی
ئیرۆ وەکیلێ موتلەقی
هیممەت ژ مەر مانا تەتێ

ئەم جوملە پانسەد مێر هەین
ئیرۆ د فەرمانا تەین
وەڵڵا ل سەر عەهدا خوەین
هیممەت بکە شێخ مەتێ

گفتوگۆ دەکەوێتە نێوان سۆفیان و شێخ، لە ئەنجاما سۆفییان ڕاستییان بۆ دەردەکەوێ کە عەشقی شێخ عەشقێکی پاکە:

ئەو سۆفی بە ئەوراد و دەف
وان مەجلیسەک دانی ب شەڤ
شێخ سەحەرێ چەهڤ چوونە خەڤ
زوو دی شەفیعی ئوممەتێ

ڕووحی وی دی زاتی ڕەسوول
مزگینیا تە بوو قەبوول
ئیرۆ بدە خەلقی مەلوول
دا سەح بکن کەرامەتێ

داهوون نەبێن شێخ کافرە
زێر باتینە زیڤ زاهیرە
ژ هەردوو وجوودان تاهیرە
عەشقی برە توو هوورەتێ



حالی ل شێخ ڕەحمانییە
دا هوون نەبن نەفسانییە
وی یەک ب یەک زانییە
دین کر بیا وەحدانەتێ

کچەکەش پەری بەهەشتە، لە بابەتی شێخە، یەکتری تەواو دەکەن، یاخود گیانێکن لەناو دوو پەیکەردا:

ئەو حۆری یا شێخ بابەتە
بەیزا یەدە جەننەتە
لەب شەکەرە نەی قامەتە
تێک تەییباتا نیعمەتێ

بۆیە کچی گاوور گیرۆدە و گرفتاری شیخ دەبێ:

سەکنی گۆهـ دا خرۆشێ
سۆفییان دا نۆشە نۆشێ
باتینی کچ هاتە جۆشێ
ئەسەرا وان ڤێ کەتێ

نار ب نوور هاتە نێڤە
سۆفییان شێخ بر ب ڕێڤە
موبتەلا بوو کچ د پێڤە
بێ قەرار کر هیممەتێ

شێخ واز لە بەرازەوانی دەهێنێ و پشت لە وڵاتی گاووران دەکا، ئەمە دەبێتە هۆی گریە و زار و فیغانی کچەکە:

دلبەری بەردا گرینێ
هستری وی نازەنینێ
بوونە جۆباری د خوونێ
تێتن ژ هەورا فیرقەتێ

خەڵکی بەکچی گاووری خۆیان دەڵێن، تۆ کچی میری گورجانی، جوان و نازەنینی، مەی دەنۆشی، ئەتلەس و غارا دەپۆشی، ئەم شێخە پیرە ڕزیوەت بۆ چییە!:

چەهڤان ژ کێ را کل بکم
بسکان ژ کێ را چێ بکم

دی پوستەکی ل مل بکم
ئەزێ هەریمە جەننەتێ
جەننەتی حاسیل بکم
ئیدی ل دنیا من تەعم نەتێ

کچە داوای ئەسپێکی کەحێل دەکا بۆ ئەوەی بەدوای شێخ بکەوێ، سواری ئەسپ دەبێ و ئاوزەنگ لێ دەدا، کە دەگاتە ڕاستی شێخ لە ئەسپ دێتە خوارەوە و دەستی دەخاتە ناودەستی، شێخ لە شەرمان و لە ترسی توانەوەی مەتریالی لەناو کچەدا لە خودا دەپاڕێتەوە کە گیانی دەربێنێ:

دما کو ئەو گیهای وی
پیا بوو دەست ئاڤێتە دەستی وی
شێخ ژ شەرمان دوعاکری

عیزراییل پەیدا دەبێ و گیانیان دەکێشێ و لەسەر ئایینی ڕاست بەبەهەشت شاد دەبن:

عیزرائیل ڕووحێد وان ل وی
قەبز کر و ب جەننەتێ شا کری
ئەومان ل وێ دین و سوننەتێ

فەقێ تەیران لەم چیرۆکە شیعرییەدا وەستایانە توانیویەتی هەندێ لە ڕەمزەکانی سۆفیزمی کۆزمۆسی و ئیسلامی بەکاربێنێ لە حیکایەتە دڵدارییەکەدا، بۆ ئەوەی لە ئایین دوور نەکەوێتەوە کۆتایی بەوە دێنێ هەردووکیان «دڵدار» و «دلبەر» لە بەهەشت دەگەنەوە یەکتری و لەناو ژیانی جاویدانیدا دەمێننەوە.

### زەمبیل فرۆش

زەمبیل فرۆش تەنیا وەکو بەرهەمێکی ئەدەبی میللی سەرزار ناسرابوو، تێکستی یەکجار زۆری کەوتبووە ناوەوە بەدرێژایی ڕۆژگار. گرنگترینی تێکستە فۆلکلۆرییە جیاوازەکانی زەمبیل فرۆش کە بڵاوکراونەتەوە ئەمانەی لای خوارەوەن:

١- لە ساڵی ١٨٧٠ ئەلبێرت سوسین لە کوردستانی عوسمانی تێکستێکی تۆمارکرد، لە پاشانا لەلایەن قوتابییێکییەوە لە شاری بەرلینەوە تێکستێکی تری بۆ ڕەوانە کرابوو، ئەویش لە شامەوە لەلایەن کوردێکەوە پێی گەیشتبوو، هەردوو تێکست بڵاوکراونەتەوە و وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی ئەڵمانی.
٢- لە ساڵی ١٩٠٣ ئۆسکارمان تێکستێکی لە سابلاغ (مەهاباد) نووسیوەتەوە و گۆڕیویەتییە سەر ئەڵمانی و بڵاوی کردۆتەوە.
٣- هۆگۆ ماکاش پارچەییێکی لە زەمبیل فرۆش بڵاوکردۆتەوە لەگەڵ وەرگێڕانی ئەڵمانی، لە کوردێکی خەڵکی مێردین (ماردین)ی وەرگرتووە.



٤- ڤۆن لۆکۆک لە ساڵی ١٩٠٣ سێ تێکستی ئەدەبی میللی زەمبیل فرۆشی بڵاوکردۆتەوە.
٥- حاجیی جندی تێکستێکی لە کتێبی «فۆلکلۆرا کورمانجی» لە ساڵی ١٩٣٦ لە یەریڤان بڵاوکردۆتەوە. ئەوەی پێویستە لێرەدا بووترێ ئەوەیە تێکستی دووەم وەکو ئەو تێکستەیە کە محەمەد تۆفیق وردی بەزمانی عەرەبی لە بەغدا لە ساڵی ١٩٦٥ بڵاوی کردۆتەوە.
٦- ئەمینی عەبدال دوو تێکستی بڵاوکردۆتەوە یەکەمیان لە کتێبی «فۆلکلۆرا کورمانجی»؛ دووەمیان لەناو «کتێبا زمانێ کورمانجی بۆناکۆما چارا» لە شاری یەریڤان لە ساڵی ١٩٣٣.
٧- لە ساڵی ١٩٦٧ گیوی موکریانی لە هەولێر تێکستێکی ئەدەبی میللی زەمبیل فرۆشی بڵاوکردەوە بەدیالێکتی کرمانجی خواروو، بریتییە لە ١٦٠ دێڕە شیعر لەگەڵ پەخشاندا تێکەڵ کراوە؛ لەناو کتێبەکەی موکریانی تێکستێکی تری زەمبیل فرۆش هەیە بەدیالێکتی کرمانجی سەروو لە ساڵی ١٩٦٣ نووسراوەتەوە، گۆیا لە ساڵی ١١٩٠ه/١٧٧٧م لەلایەن مرادخانی بایەزیدییەوە نووسراوەتەوە و (٥١٢) دێڕە شیعرە.
٨- ئوردیخانی جەلیل و جەلیلی جەلیل دوو تێکستی تریان بڵاوکردۆتەوە لە مۆسکۆ لە ساڵی ١٩٧٣.
٩- لە ساڵی ١٩٦٤ ژاکلین موسەیلیان لە گورجستان و ئەرمەنستان دە تێکستی تازەی دەست خست و هەمووی لە مۆسکۆ لە ساڵی ١٩٨٣دا بڵاوکردەوە.

چیرۆکی شیعری زەمبیل فرۆش وەکو یادگارێکی ئەدەبی کلاسیکی نووسراو ئەگەرچی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە هەندێ دەسنووس کەوتبووە ناماخانەی گشتی سانت پیترسبورگ بەڵام لە دوای پەنجاکان و سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەم پێی زانرا و لە ساڵی ١٩٨٣ تەواوی تێکستی چیرۆکەکە بەزمانی کوردی و ڕووسی کەوتە دەست خوێندەوارانەوە.

هەندێ کوردناسانی ئەوروپا بەتایبەتی ژاکلین موسەیلیان بڵاوکەرەوەی چیرۆکی شیعری زەمبیل فرۆش ئەم بەرهەمە بەشتێکی تایبەتی دەزانێ، لەسەر ئەو باوەڕەیە ئەگەر لەگەڵ بەرهەمەکانی تری لەم بابەتەی کوردی وەکو مەم و زین، شێخ سەنعان و لەیلا و مەجنوون بەراورد بکرێ لە ڕووی ناوەرۆکەوە ئەمە وەکو یەکەمین بەرهەمی ئەدەبی شار (شارستانی، پێچەوانەی گوند و دێهات) لە کوردیدا خۆی دەنوێنێ.

ئەوەی پێویستە لێرەدا بوترێ ئەوەیە کە ئەدەبی شار لەناو عەرەبدا لە سەدەی دەیەم پەیدابوو لە شێوەی مەقام (مقام، مقامة)؛ لە ئەوروپا لە سەدەی سێزدەم پەیدابوو، لە ئەدەبی فارسیدا -ئەوەی سەر بە دەرباری شا نییە- لە نیوەی یەکەمی سەدەی پازدەم پەیدابوو، بەم پێیە لە ئەدەبی کوردیدا ئەدەبی شار لە سەدەی هەڤدەمدا پەیدا بووە.

بێگومان پەیدابوونی میرنشینە سەربەخۆ و نیوە سەربەخۆکانی کورد لە سەدەکانی پازدە و شازدە بووە هۆی ئەوەی شار پەیدا ببێ و پیشەسازی بکەوێتە ناوەوە. ئەم ژیانە تازەیە ڕەنگی لە ئەدەبدا دایەوە و نەوەکو تەنیا چینەکانی سەرەوە بوون بەقارەمانی داهێنانی ئەدەبی بەڵکو چینەکانی خوارەوەش بەشدارییان تێدا کرد.

نویشکی ناوەرۆکی چیرۆکی شیعری نووسراوی زەمبیل فرۆش و هەموو تێکستە فۆلکلۆرییەکان بەم جۆرەیە:

«خاتوون یا خانم ژنێکی گەنجی یەکجار جوان بوو، ژنی میرێکی کوردی دەوڵەمەند بوو، لەناو قەڵا و کۆشک و سەرا دەژیا. ڕۆژێ لە ڕۆژان کابراییێکی زەمبیل فرۆشی هەژاری زەحمەتکێش بەپێش کۆشک و باڵەخانە تێپەڕ دەبێ. خاتوون چاوی پێدەکەوێ و یەکسەر حەزی لێ دەکا. مێردی لە ماڵ نابێ، هەموو فڕ و فێڵێک بەکاردێنێ بۆ ئەوەی زەمبیل فرۆش بچێتە ناو باڵەخانەوە. خاتوون هەوڵێکی زۆری لەگەڵ دەدا و بەڵێنی دەداتێ هەموو شتێکی بۆ بکا و چی دەیەوێ بیداتێ ئەگەر دەستی لەگەڵ خاتوونا تێکەڵ بکا. زەمبیل فرۆش هەموو ئارەزووییێکی خاتوون ڕەت دەکاتەوە، بەلایەوە هەژاری باشترە لە تاوانباری. لە پاشانا ناچار دەبێ داوا لە خاتوون بکا کە ڕێی بدا بۆ ئەوەی بچێتە سەربان و دەسنوێژ بشوا و نوێژ بکا. لەوێ لە خودا دەپاڕێتەوە لەم کارە ڕزگاری بکا و بەتەما دەبێ خۆی لە سەربانەوە فڕێ بداتە خوارەوە، بەڵام خودا داوای دێنێتە دی و جبراییل دەنێرێ، زەمبیل فرۆش دەخاتە سەر باڵی و لە کۆشک دەیهێنێتە خوارەوە. زەمبیل فرۆش ئەو ڕۆژە بەدەست بەتاڵی دەگەڕێتەوە ماڵەوە. کەچی خێزانی تەندووری داخستبوو وەکو هەموو ڕۆژان بۆ ئامادەکردنی نان و خواردن، بەڵام ئەو ڕۆژە هیچیان نەبوو. ئەو ئێوارەیە ژنێکی هاوسێیان بۆ ئاگر دێ، کە ژنی زەمبیل فرۆش سەری تەندوور هەڵدەداتەوە دەبینێ تەندوورەکە پڕ لە نان و خواردەمەنی بەهەشتە».

قارەمانی بنچینەیی ئەم چیرۆکە دوو کەسن، هەردووکیا شارستانین، یەکەمیان ژنی میری کورد و دانیشتووی کۆشک و باڵەخانە، دووەمیان کابرای پیشەسازی هەژاری شارستانی بەدەست زەمبیل دەچنێ و لەسەری دەژی.

ئەوەی ڕوون و دیارە لە کۆمەڵی گوند و دێهاتیدا ژنی کورد لەوە بەدوورە دەستی خۆی لەگەڵ هیچ کەسێکی تر تێکەڵ بکا جگە لە مێردی، حەز حەزۆکەی ژنی میر کردەوەییێکی شارستانییە.

هەرچەندە ئەم چیرۆکە یەکێکە لە چیرۆکە ڕەسەنەکانی ئەدەبی کوردی، بەڵام ناوەرۆکی لەم بابەتە لە حیکایەتەکانی «هەزار و یەک شەو»دا هەیە، دەبێ ئەوەش بزانین ڕەنگە چیرۆکەکەی هەزار و یەک شەو لە چیرۆکی ئەدەبی میللی کوردی و چیرۆکی ئەدەبی میللی نەتەوە هاوسێکان وەرگیرابێ. لە بنەڕەتیشدا وەکو ئاشکرایە چیرۆکەکانی کتێبی هەزار و یەک شەو لە ئەدەبی میللی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات بەگشتی وەرگیراون.

لەلاییێکی ترەوە ناوەرۆکی بەرزی داهێنانی ئەدەبی میللی لە هەموو نەتەوەییێک دەبێتە سەرچاوە بۆ داهێنانی تێکستی تری فۆلکلۆری، لەبەر ئەوە گەلێ تێکست دەکەوێتە ناوەوە، نەوەکو تەنیا ئەمە بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی شاعیر و نووسەران ئیلهامی لێ وەربگرن و گەلێ بەرهەمی تازەی لێ دروست بکەن.

**ئەم چیرۆکە بەرهەمی کێیە؟**

لەنامەخانەی گشتیی سانت پیترسبورگ شەش تێکستی دەسنووسی زەمبیل فرۆش هەیە، کۆنترینیان



لە سەدەی هەژدەم نووسراوەتەوە لە هەموو دەسنووسەکاندا چیرۆکەکە بریتییە لە ٢٤٠ دێڕە شیعر (٦٠ چوارین).

ئەلێکساندر ژابا لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئەم بەرهەمە لە نووسینەکانی مەلای باتەیییە، بەڵام کە لە ژیانی باتەیی دەدوێ و باسی بەرهەمی دەکا ناوی زەمبیل فرۆش نابا. زانای تریش جگە لە ژابا لە هەموو ئەو کەسانەی باسی مەلای باتەیییان کردووە «زەمبیل فرۆش»یان بەبەرهەمی ئەو لە قەڵەم نەداوە.

ئەوەی ئەم نهێنییەمان بۆ دەکاتەوە شیعرەکانی زەمبیل فرۆش خۆیەتی. ئەگەر بەراورد لە نێوان زەمبیل فرۆش و بەرهەمەکانی مەلای باتەیی (شیعری لیریکی و مەولوودنامە) بکەین دەبینین لە زمان و شێوە جیاوازی هەیە. زەمبیل فرۆش زیاتر دەشکێتە سەر زمان و شێوەی ئەدەبی خەڵکی کورد، لەبەر ئەوە لە بەرهەمی مەلای باتەیی ناکا.

سەرەڕای ئەوەی کە زەمبیل فرۆش لە ڕووی تەکنیکییەوە هی ئەو شاعیرەیە کە «شێخ سەنعان»ی داناوە، دەبینین لە دوو بەیتی دوایی دەسنووسەکانی ژمارە ٢٦، ٢٧، ٣٦دا دەڵێ:

«ئەی میم و حێ خوەش دەفتەرە...»

دیارە «میم و حێ»ش نازناو یا ناوی نهێنیی شیعری فەقێ تەیرانە، زیاد لەسەر ئەم هەموو بەڵگانەش لەناو خەڵکی باکووری کوردستان «زەمبیل فرۆش» بەبەرهەمی فەقێ تەیران ناسراوە.

**گەشتێک لە گێتی «زەمبیل فرۆش»دا**

زەمبیل وەکو شتێکی پێویست پێوەندی بەژیانی شارەوە هەیە، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتدا. بوونی بازاڕ بەڵگەی هەرە گرنگی شارە، چونکە شێوەی پێوەندی ئابووری لەناو کۆمەڵدا دیاری دەکا، زەمبیل دەورێکی باڵای هەیە لە ژیانی بازاڕدا چونکە بۆ گواستنەوەی هەموو ئەو شتومەکانە بەکاردێ کە لە بازاڕدا دەفرۆشرێن.

پیشەسازی زەمبیل لە ڕۆژهەڵاتدا لەگەڵ پەیدابوونی شار کەوتۆتە ناوەوە. ئەو وەستایەی زەمبیل دەچنێ و ئامادەی دەکا لە چینی خوار ناوەڕاست دەژمێررێ. ئیتر ئەم وەستایە شاگردی دەبێ، لەلاییێک یاریدەی دەدەن بۆ چنینی زەمبیل، لەلاییێکی تریشەوە بۆی دەفرۆشن و کرێی خۆیان وەردەگرن. یاخود زەمبیل فرۆش کۆمەڵێک زەمبیل بەهەرزانتر لە وەستای دەکڕێ و لەناو بازاڕ یا کۆڵانەکانی ناو شار دەیفرۆشێتەوە کڕیاران و شتێکی لێ قازانج دەکا و پێی دەژی. زەمبیل فرۆشی ئێمە وەک دەردەکەوێ لەسەر قازانجی زەمبیل فرۆشتن ژیاوە.

لەم ماوەیەدا تەواوی تێکستی «زەمبیل فرۆش»ی فەقێ تەیران بڵاو دەکەینەوە، ئەم تێکستەی ئێمە لە ئەنجامی بەراوردکاری لە نێوان هەموو تێکستە دەسنووسەکانی نامەخانەی گشتیی (سانت پیترسبورگی ئێستا) و تێکستە ساغکراوەکەی ژاکلین موسەیلیان هاتۆتە ناوەوە، ئەوەی شایانی باسیشە ئەوەیە ساغکردنەوەکەی موسەیلیانیش دیسانەوە هەر بەئیملای کۆن نووسراوەتەوە، تێکستی ئێمە بەئیملای تازە تۆمارکراوە و ئەو وشانەی بەڕاستمان زانیوە ئەوانەمان نووسیوەتەوە. فەقێ تەیران بەم

جۆره دهست بهگێڕانهوهی چیرۆکهکهی دهکا:

ئهی دل وهره دیسا ب جۆش
جارهک ژ جاما مهی بنۆش
بکم قیسسهتا زهمبیل فرۆش
دا سهح بکن حیکایهتێ

زهمبیل فرۆش لاوهک ڕهوال بوو
ب کلفهت و ئههلی عیال بوو
حوسنهکه یووسف ل بال بوو
حهققه ڕهززاقێ قیسمهتێ

ئهو قهوی لاوهک فهقیر بوو
دائیما خوهدێ د بیر بوو
د پشتێ سهلکان ژیر بوو
دهست دکر ب وێ سنعهتێ

شوغلێ وی سهلک و تهبهق بوو
دائیما ئهو ڕاست و حهق بوو
قیمهتی سهلکان وهرهق بوو
ئهو پی د دیرا کلفهتێ

کلفهتی قیسمهت ل وی بوو
ژ تشت و مال چ وی نهبوو
د پیشێ سهلکان قهوی بوو
ههر ب دهست مهشغهلهتێ

ههر ڕۆ ب دهست زهمبیل دبهست
دبرنه بازاڕان ب قهست
خارن و نان دهات ب دهست
ڕازی دبوو ب قیسمهتێ

ڕۆژێ له ڕۆژان زهمبیل فرۆش بهپێش قهڵا و کۆشک و باڵهخانهی میری شار تێدهپهڕی، ژنی میر چاوی پێی دهکهوێ و حهزی لێ دهکا. بێگومان ئهم دیاردهیه له ئهنجامی ئهوهیه که ژنی شارستانی بهتایبهتی ژنی گهورهپیاو و دهوڵهمهندانی که له ناو کۆشک و سهرا دهژین پیاو زۆر دهبینن و ئاشنایهتییان لهگهڵدا پهیدا دهکهن، ئهمانه بهزۆری هاوڕێ و برادهرانی خانهواده له گهورهپیاوان یا دهستوپێوهند له باغهوان و خزمهتکاران دهبن.



میر و دهوڵهمهند و گهوره پیاوان چاو لهدهر دهبن، پێوهندی لهگهڵ ژنی تر پهیدا دهکهن، یا ههریهکێکی چهند ژنێکی ئاشکراو نهێنی دهبێ، لهبهر ئهوه ژنی ئهم گهوره پیاوانه ههوڵ دهدهن بۆشایی ناو دهروونیان پڕ بکهنهوه، بهوهی تۆڵه له مێردیان بسهننهوه، بۆیه بهلایانهوه ئاساییه ئهگهر پێوهندی لهگهڵ ههر کهسێک پهیدا بکهن که بهدڵیان بێ، ئهمه وهکو ناوهڕۆکێکی هونهری بهناوی «مهکری ژنان»هوه چۆته ناو ئهدهبی گێتییهوه:

ڕۆژهکی سهلکان کو تینه
خاتوونهک ژۆردا دبینه
ب دل و جان د حهبینه
کهتییه بهندا مهحهبهتێ

مهحبهتێ کچ موبتهلا کر
سر ل جاریا ئاشکرا کر
لاوهکی قهلبم جودا کر
من ژ عهشقان خهو نهتێ

ئهو لهتیفا بێ ئیختیاره
جارییهک ژۆردا ههناره
تو ههڕه بێژی ب زاره
ما بێن سهر مهسلهحهتێ

ئهو جاریانه د خهوفا خودێنه
لاو ب ڤێ حیله دبینه
میر ژ ته سهلکان دڤینه
لێ دکتن حیلهتێ

تو چێکه سهلکان د چاکه
بینه دهرگاهی بههاکه
میر حهقێ ته دی ئهداکه
شوغلهک خێرا تهتێ

لاو ڕابوو چوویه ماله
چێکرن سهلکی دهلاله
ئانینه دهرگاهی ڕهواله

رِزق ئەڤە حەق بدەتێ

سەلک برن ب ژۆر هەنارە
دیت جارییەک هاتە خارە
میر ژ تە دڤێ دیدارە
دێ بدەتە قیمەتێ

گۆ بلا قیمەت ب وی بە
ئەڤ نزانت بەند و لیبە
چوونە بال میران چبە
ئەوی نزانت حالەتێ

زەمبیل فرۆشی ئێمە بێگومان کوڕە جووتیارە، لە گوندەوە کەوتۆتە شار، لە ڕەنجبەری کوڕی جووتیاری گوندەوە بووە بەهەژاری شار، ژیانی نەمر و نەژی لەسەر قازانجی زەمبیل فرۆشتنە:

لاو بوی لیبی نزانی
بێ فکر ئەو چوویە بانی
دەرکە دادا دەرکەڤانی
ئەڤ چ بەلا بوو لاو کەتێ

وی کو دی دەر پێڤەداڤە
غەیرییە لێ ڕەنگ و چاڤە
گۆ یەقین ئەڤ حیلە داڤە
ئەز دێ ببینم زەحمەتێ

ئەو جارییا پڕ لیپ و بەندە
لا ببال میران ڤەخەندە
دی شپرالەک لەب ژ قەندە
قەت کەس نەدابوو وەسفەتێ

لاوی ڕاست ب خودێ را
پر ژ وی قەنجی دگێڕا
من ژ تەناڤێ تو زێڕە
من خلاس کە ژ زەحمەتێ

لە پاش ئەوەی کە زەمبیل فرۆش دەگاتە سەرا و پەردە و ژووری نوستنی ژنی میر لەگەڵ یەکتری



دەکەونە گفتوگۆ. لێرەدا ژنی میر هەوڵ دەدا هەر لەو دەمەدا زەمبیل فرۆش لەگەڵی بچێتە ناو نوێنەوە، بەڵام زەمبیل فرۆش خۆی بەدەستەوە نادا. ئەگەرچی فەقێ تەیران وا پیشان دەدا کە زەمبیل فرۆش خۆی بەبچووک دادەنێ بەرامبەر بەم ژنە میرە و ئەوە دەخاتە ڕوو چۆن دەبێ ژنێکی وا بەدەسەڵات و دەوڵەمەند حەز لە کوڕێکی بێ دەسەڵات و هەژار بکا! بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە زەمبیل فرۆش بەم قسانە دەیەوێ دەماری چینایەتی ژنە میر ببزوێنێ بۆ ئەوەی بەڵکو وازی لێ بهێنێ:

خاتوون دبێ چارە تو نینە
شەرم مەکە وەرە نڤینە
من ب تە دایە ئەڤینە
دا ببینم ژ تە لەززەتێ

لاو دبێ ترسم ژ جەبباری
دوو حەرام بینە دیاری
ئاگرەک وی ل مە بباری
ئەز و تو بکن تەوبەتێ

کچ دبێ لاوی ببانی
ئەز دبیم داتو بزانی
من ژ بۆ یا دل تو ئانی
تو نزانی موحیببەتێ

لاو ژ خاتونێ دبێتە
تو مەخازیا دل دڤێتە
دا ژ حەق نبن فەهێتە
ڕوو سپی بن و د قیامەتێ

کچ دبێ باوێژ خەیالان
وەرەنێڤ دۆشەک و بالان
بین بکە زلفان و خالان
دوورە ژ ڕۆژا ئاخیرەتێ

لاو دبێ زلفێت حەریرە
ما پیرۆزبن ئەو ل میرە
چە حەددی لاوی فەقیرە

دەست بدەت ڤێ مەحەببەتێ

کچ دبێ لاوی فەریڤان
وەرە ناڤ ڕەیحان و سێڤان
شەکری بمیژ ب لێڤان
شویهی جاما شەربەتێ

لاو دبێ قەنجا تەمامی
هەر وەکی شەکر د جامی
ژ سر و پی تو ل من حەرامی
ترسم ژ مەعنا ئایەتێ

کچ دبێ لاوی ڕەوالە
ئەر تە حاجەت زێڕ و مالە
هە چی تە خوەست من کر حەلالە
بەس بکە ڤێ حوجەجەتێ

لاو دبێ ئەز نی تێرم
زێڕ و مال چ وی خوەندێرم
ئەز ژ ترسا حەق نوێرم
نەکو بەعید بم ژ ڕەحمەتێ

کچ دبێ لاوی ڕاس نە
میر ل کرمانجان قیاس نە
تە ژ دەستێ من خەلاس نە
هو ل تە ددم موهلەتێ

لاو حوجەجەت کر تی بگاڤێ
چم تەهارەت کم ب ئاڤێ
کچ نزانی وی خوّ ناڤێ
دوورە ژ قەباحەتێ

زەمبیل فرۆش کابرایێکی ساکاری پاک بوو، هەندێ ڕەوشتی بەرز لە مێشکیدا چەسپابوو، بەهیچ جۆرێ نەیدەویست بیانڕووخێنێ، توانیبووی بەسەر شەهوەتیدا زاڵ بێ، نەک لەبەر ئەوەی خۆی هەژارە و بەرامبەر بە ژنە میرێکە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ژنەکەی بەکەسێکی نزم و تاوانبار دەزانی، هەروەها لاشی



ئاشکرابوو کە خۆی یەکەمین و دوامین کەس نییە ژنە میر حەزی لێ کردبێ و لەگەڵیدا خەوتبێ.

بۆ ڕزگاربوون لەم تەنگوچەڵەمەیە داوا لە ژنە میر دەکا ڕێگەی بدا بۆ ئەوەی نوێژی خۆی بکا، بەم نوێژکردنە زەمبیل فرۆش دەیەوێ هەموو ڕێگەیێک بگرێ نەوەکو خوانەخواستە دڵی نەرم بێ و لەگەڵ ژنە میردا جووت ببێ، ئیتر لە پاش نوێژ لە سەربانی قەڵا دەست بەموناجات دەکا و لە خودا دەپاڕێتەوە:

خاتوونا پڕ شۆخ و مەستە
لاو ب دل و جان د خوەستە
مەسینەک ئاڤ دا ب دەستە
ژ بۆتە بکم خزمەتێ

لاو ب دەرکەت ژ مەنزیلێ
دەچوویە سەربانی کەلێ
قەت چار نەبوو تێدا هەلێ
داما د فکر حیلەتێ

داما کو دی دل کر گری
دل شەووتی ئەو پڕ گری
ڕوودا و ئەڤراز فکری
بانگ کرە شاهی قودرەتێ

بانگ کرە پادشاهی موبین
گۆ یا دەلیلوکازیرین
تو شادکی قەلبی حەزین
خەلاس دکی ژ زەحمەتێ

یا خالیقی ڕەحمەت کەسیر
یا عالیمی ب قەلب و زەمیر
حەمی سیرڕان توی پێ خەبیر
فەتتاحی بابی شەفقەتێ

فەتتاح تویی میفتاح ب دەست
تو خالیقی هەرچی کو هەست
یەک جار ب تە من پشت د بەست
دا من نەدی هیلاکەتێ

جەرجیس ب شاران بڕی
ئەیووب وەکی کرمان دڕی
یووسف وەکی عەبدان کڕی
تە ئینان سەر سەڵتەنەتێ
وان ئیبراهیم ئاڤێتە نار
پیت و برنگ لێ بوونە سار
ڤەدا بران تە ژ بوی نار
تە خەلاس کر ژ زەحمەتێ
مووسا دنێڤ بەحرا عەمیق
تەلێ ڤەکر دوانزدە تەریق
فیرعەون دنێڤ مایە غەریق
تە دا جەزایێ شرکەتێ
یوونس وەکی حووتدا بەلعاند
یەک وەسلەک ژی نەخلاند
دیسان ب دنێ وەسلاند
من سدق و باوەڕ ب تە تێ
باوەڕ بکن ڤێ گۆتنێ
تۆفان کو هات گرتە دنێ
نووح و گەمی مان ب تەنێ
توی خالیقی ڤێ هەیئەتێ
دەشت و چیا تێک بوونە بەحر
وان عاسی یو خەلقی د خوەر
جوملە دنێڤ دا مانە قەهر
توی لایقی وەحدانەتێ
تە خەلاس کرن ئەو حەمی
دزانم کو تو نە نائیمی
ئەز دی خوە باڤێم ڤێ دەمی
حەول و قووەت ژ بال تە تێ



لەپاش ئەمە خۆی لەسەر بورجی قەڵاوە فڕێ دەداتە خوارەوە، بەڵام خودا جبراییل دەنێرێ و دەیخاتە سەر باڵی و بەنەرم و نیانی دەیگەیێنێتە سەر ئەرز:

لاوی ڕاستە ب جەببارە
دل یەکە نابە دوو پارە
خوە ژ بورجێ ئاڤێتە خارە
زوو هاتە نێڤا هێشەتێ
ئەو خالیقی هەر عیلم ل نک
وی گۆتە جبراییل چاپک
هەرە عەبدی من بگر سڤک
قەنج لێ بکە سیانەتێ
ئەو جبراییل پڕ چەلەنک
هاتە خاری ژ بانی فەلەک
لاو ل هەوا گرت و گەلەک
ویرا دکت عینایەتێ
جبراییل هاتی ژ کەرەم
لاو ل هەوا دگرت ب شەرم
دانیە سەر عەردی ب نەرم
دوور کر ئەو ژ زەلالەتێ
لاوی ڕاست پاک وجوودە
ئەو سەر بر ب سوجوودە
شوکر کر ژ بۆ وەدوودە
تە خەلاس کرم ژ زولمەتێ
شوکر و مننەت ئەو لاو د خوەست
دیسان ب مال ڕابوو بقەست
میران سەلک کێشا ژ دەست
زەنبیل ستاندن ب زولمەتێ

ئەو ڕۆژە زەمبیل فرۆش بەدەست بەتاڵی دەچێتەوە ماڵەوە. بەڵام ڕەوشتی تەندوور داخستن ناخەنە پشت گوێ نەوەکو هاوسێیان گومان بکەن لەوەی کە ئەو ئێوارەیە شامیان نییە. لەکاتێکدا کە

هاوسێیێکیان بۆ پشکۆی ئاگر ڕوودەکاتە ماڵیان خێزانی زەمبیل فرۆش سەری تەندوور هەڵدەداتەوە دەبینێ وا نان و خواردەمەنیی بەهەشت تەندووری پڕ کردووە:

ژنی هەبوو عەقلەک ل دۆر
هەرچی سەلک ستاندن ب زۆر
مە سپارە پادشاە ل ژۆر
ئەدا بکت د قیامەتێ
ژنی کو ئەو گۆتن کرە
ب یەقین ئەو ژمیر قانیع ترە
ئەولیا خودێ چو بوو حازرە
تو عالیمی ب غەیبا نیەتێ
ژن دبێ تو وەرە ئێرە
ئەم ئاگرەک بکن لێرە
وەکی دوە و وەکی پێرە
بەتال نکن ڤێ عادەتێ
ژنی تەندوور هەلکر دمالە
دەری گرت ئەو چوون ژ بالە
دا جیران نکن فیکر و خەیالە
مە ناڤێ زاتی شوبهەتێ
ژنی تەندوور هەلکر سڤک
زادەک نەبوو باڤی کوچک
دەری گرت و چووبوو ژنک
تەندوور سۆر بوو ژ نیعمەتێ
تەندوور پڕ بوو ب نان و ئاش
دەری گرت و چوو بوویە پاش
خالیق ژ جەم قیسمەت معاش
تەندوور سۆر بوو ژ نیعمەتێ
جیرانەکی وان هاتە سەر
ئاگرەک ژ وان خواست ب خەبەر



دەما کو وان لێ کر نەزەر
تژی تەعامی جەننەتێ
خێر دی ئەوان کو بێ حیساب
ئینانە دەر نان و کەباب
شەفەقەت ل وان کر ئەی وەهاب
تێر بوون ژ زاد و نیعمەتێ

فەقێ تەیران چیرۆکە شیعرییەکەی بەوە دوایی پێ دێنێ کە ئادەمزاد دەبێ ڕاست بێ لە ژیاندا، ناخۆشی لە پێناوی ڕاستیدا دەبینێ، بەڵام بێگومان لە دواییدا دەگاتە خۆشی و ڕاحەتی گیانی:

ئەر ب ڕۆژە ئەر ب شەڤە
تاعەت بکن هوون ب خەڤە
هەرچی ڕاستە جەزا ئەڤە
دا هوون نبن ژ ئاخیرەتێ
یا محەمەد غەمخواری ئوممەتێ
هەرچی ژ من باوەڕ نەتێ
نە موستەحەققی شەفاعەتێ
مەخرەج دوورە ڕۆژا ئاخیرەتێ
ئەی (میم و حێ) خوەش دەفتەرە
هەرچی ژ من نە باوەڕە
نە ژ ئوممەتا پێغەمبەرە
نە مستەحەققی شەفاعەتێ

چیرۆکی شیعری زەمبیل فرۆش نموونەیێکی ڕەسەنی ئەدەبی شارستانییە، بێگومان سەرچاوەی بنچینەیی ئیلهامی فەقێ تەیران حیکایەتە فۆلکلۆرییە جیاوازەکانی ئەدەبی سەرزاری خەڵکی کوردە، دیارە لە بنەڕەتیشدا ئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کاریان لە یەکتری کردووە و چیرۆکی لەم بابەتە ئەدگاری هەموو نەتەوەکانی تریشی تێدایە. ئەمە و ئەگەر ئاوڕێکیش لە ئەدەبی سێکس بەتایبەتی (مەکری ژنان) بدەینەوە، ئەوا بازنەکە فراوانتر دەبێ و هەموو ئەدەبی گێتی دەگرێتەوە بەوەی کە «ژن» بەدوای پیاو دەگەڕێ، نەک پێچەوانە. بەڵگەیێکی ڕۆژهەڵاتی ئەمە بنچینەی دروستبوونی حیکایەتەکانی «هەزار و یەک شەو»ە، کە شەهریار بەوەی زانی خاتوونی خێزانی نەک لەشی خۆی پێشکەش بەخزمەتکارە ئاساییەکانی دەکا، بەڵکو ئەو خزمەتکارانەش کە عەبد و قولەڕەشن، ئیتر ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی، شەهریار هەموو ڕۆژێک ژنێ بێنێ و لە پاش کار بیکوژێ، تا شەهرزاد پەیدا بوو و

جوانانی ولاتی لەم کارەساتە ڕزگار کرد.

بەڵگەیێکی ڕۆژئاواییش ئەوەیە لە سەدەی چواردەم لە بەرهەمی «دیکامیرۆن»ی نووسەری ئیتاڵی جیۆڤانی بۆکاشیوە Boccaccio (١٣١٣ - ١٣٧٥) ڕەنگی داوەتەوە.

### دمدم

ڕووداوی جەنگی دمدم ئەوەندە گەورە و مەزن بوو، تەنیا لەناو لاپەڕەکانی تۆماری مێژوو نەمایەوە. لە ڕۆژگارانی ڕووداوی جەنگی دمدمەوە تا ئێستا قارەمانیەتی جەنگاوەرانی کورد ئەدەبی میللیی سەرزاری کوردی تەنیوە، لە سەرانسەری کوردستان بووە بەسەرچاوەیێکی گرنگ بۆ داهێنانی بەرهەمی ئەدەبی و هونەری بەهەموو بابەتەکانیەوە.

تێکستێکی زۆری ئەدەبی میللی لەم ڕووەوە تۆمارکراوە و بڵاوکراوەتەوە. ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسانی ئەورووپا دەوری باڵایان بووە، لەمانە ئەلیکساندر ژابا، ی. پریم، ئا. سوسین، ئوسکارمان، کوردوییڤ و گەلێکی دیکە، بڕێک تێکستیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانانی خۆیان و بڵاویان کردۆتەوە.

هەندێ لەو تێکستە ئەدەبییانە بەناوی شاعیرانی وەکو فەقێ تەیران و مەلای باتەیی تۆمارکراون، ئەوانەی لەم بەرهەمانەیان کۆڵیوەتەوە زۆربەی لەسەر ئەو ڕایەن ئەگەر لە ئەدەبی نووسراوی حسێب بکەن بە بەرهەمی فەقێ تەیرانی دادەنێن، بەڵام لێرەشدا دوودڵی لە ناوەوەیە. هەرچۆنێ بێ فەقێ تەیران سوودی لە حیکایەت و بەیتی «قەڵای دمدم»ی ئەدەبی میللی وەرگرتووە و کورتە چیرۆکێکی شیعری لێ دروست کردووە.

ئەم چیرۆکە لە ٦٧ چوارین، واتە ٢٦٨ نیوە دێڕ شیعر پێکهاتووە. کێشی خۆماڵی حەوت کەرتییە، لە هەندێ دێڕدا ئەگەر بڕگەکان نەگوشرێن، دەبێتە هەشت کەرتی. هەر چوارینێک لە چوارینەکان لەسەر یەک قافیەیە (ا ا ا ا)، (ب ب ب ب)، (ج ج ج ج)، هتد...

ئەم شیعرەی فەقێ تەیران دەبێ لە هەموو تێکستە فۆلکلۆری و کلاسیکییەکان کۆنتربێ، چونکە جەنگی قەڵای دمدم ڕووی داوە فەقێ تەیران لە ژیانا بووە و لە نزیکەوە ئاگاداری بووە.

### بەیتی ئەسپی ڕەش

ئەم چیرۆکە شیعرییە کورتە تێکستێکی یەکجار زۆری تۆمارکراوە و لە نامەخانەکانی ڕۆژهەڵاتناسی ئەورووپا پارێزراون. ئەوی ڕاستی بێ ناوەڕۆکی حیکایەتەکە سەرانسەری ئەدەبی کوردی لە باکووری کوردستان داگیرکردووە، نەک تەنیا ئەدەبی نەنووسراوی سەرزار بەڵکو بووە بەسەرچاوە بۆ بەرهەمی ئەدەبی کلاسیکی نووسراویش. ئەم دوو جۆرە تێکستە چوونەتە ناو یەک و تێک ترنجاون بەجۆرێک جیاکردنەوەیان کارێکی ئاسان نییە. جگە لەمە ئەم چیرۆکە شیعرییە بەناوی جیاوازەوە کەوتۆتە ناوەوە، هی وەکو «بەیتی ئەسپی ڕەش»، «قەولی ئەسپی ڕەش»، «نەوالەیی سیسەبان»، «دۆڵی سیسەبان لە قەفقاس» و هی دیکە.

لەبنجدا ناوەڕۆکی ئەم حیکایەتە پێوەندی بەغەزەواتەکانی ئیسلامەوە هەیە لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی



ئایینی ئیسلام. بەزۆری قارەمانەکانی لە عومەری کوڕی خەتاب و عەلی کوڕی ئەبووتالیب خۆیان دەنوێنن. ناوەڕۆکی چیرۆکەکە ئەوەیە گۆیا عەلی کوڕی ئەبووتالیب خەودەبینێ لە خەونەکەیدا هاوار و فەریادی ئەو ئیسلامانەی دەکەوێتە بەرگوێ کەوا لە جەنگدان لەگەڵ کافران لە دۆڵی سیسەبان لە قەفقاسدا. دەستبەجێ لە خەو ڕادەپەڕێ و دەست دەداتە زولفەقار و سواری دوڵدوڵ دەبێ و بەچاوقوچانێک فریای موسوڵمانان دەکەوێ و کافران تەفروتوونا دەکا.

ئەم حیکایەتە تەنیا لە ئەدەبی کوردی ڕەنگی نەداوەتەوە، لە ئەدەبی میللی عەرەبیش ئەم حیکایەتە بەرچاو دەکەوێ و بەچاپکراوی لە ولاتانی عەرەبی باکووری ئەفریقاش دەس دەکەوێ، حیکایەتێکیان بەم جۆرە ناوی بەعەرەبی تۆمارکراوە «غزوة السيسبان وماجرى فيها للأمام علي ابن أبي طالب = غەزای سیسەبان و بەسەرهاتی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتالیب تێیدا».

ئەو تێکستە ئەدەبییە میللییانەی لە ناوەوەن زۆرن، بەڵام لە تێکستە ئەدەبییە کلاسیکییەکان کەمترن. خاوەنی ئەمانە بەتەواوی نەناسراون، هەندێکیان بەناوی عەلی هەریری و فەقێ تەیران و مەلای باتەیی تۆمارکراون، هی دیکەیان بێ خاوەنن. ئەمە و مێژوونووسانی ئەدەبی کوردی بیروڕای جیاوازیان هەیە نەک تەنیا لەبابەت خاوەکانیانەوە، بەڵکو لە ڕووی ئەوەی کامە تێکست لەمانە سەر بەئەدەبی میللییە و کامەیان ئەدەبی نووسراوە!

### بەیتی بەرسیسی عابید

چیرۆکی شیعری بەرسیسی عابید یەکێکە لە بەرهەمە بەرچاو و گرنگەکانی فەقێ تەیران، تێکستی ئەم چیرۆکە لە نامەخانەکانی ئەورووپا پارێزراون بەتایبەتی لە ڕووسیا. ناوبانگی بە«بەیتی بەرسیسی عابید» و «بەیتی بەرسیسایێ» دەرکەوتووە.

فەقێ تەیران ئەم چیرۆکەی لە «هێشەت» لە ساڵی (١٠٣٠ھ/ ١٦٢٠م) هۆنیوەتەوە. بیناسازی شیعرەکە لەسەر بنچینەی بابەتی موسەممەتە (مسمط) ئەمە لە شیعری کوردستانی سەروودا باوە. شیعرەکە لە ڕووی کێشەوە لەسەر کێشی ڕەجەز و ڕەمەلی عەرزوو ڕێکخراوە، بەڵام زیاتری کێشەکان ڕەجەزە و کەمتری لەسەر ڕەمەل ڕێکخراوە.

بەسەرهاتی بەرسیس بریتییە لە ٢١١ چوارین، واتە ٨٤٤ نیوە دێڕ شیعر، ئەگەر بەحسێبی مەسنەوییش بێ دەکاتە ٤٢٢ دێڕ شیعر. لە چوارینەکاندا سێ نیوە دێڕی یەکەم لەسەر یەک قافیەیە، دێڕی چوارەمیش لە سەرانسەری شیعرەکە لەسەر یەک قافیەیە (ا ا ا ـەتێ، ب ب ب ـەتێ، ح ح ح ـەتێ...) تا دوایی.

نویشکی بەسەرهاتی بەرسیسی عابید بەم جۆرەیە:

«بەرسیسی عابید کابرایێکی خەڵکی شام بوو، ماوەی ٦٩ ساڵ لە ولاتی شام شەو و ڕۆژ لەناو ئەشکەوت عیبادەتی کردووە، لەگەڵ مەڕ و ماڵاتدا ژیاوە، خواردنەوەی ئاو و خواردنی گیا بووە. هەموو شەل و کوێر و کەڕ و سەقەت و نەخۆشێکی دیکە بەدوعای ئەو چاک دەبوونەوە.

بەهۆی ئەوەی بەرسیس وەکو سۆفییێک شێخی نەبووە، شەیتان ئەمەی بەهەل زانیوە و هەوڵی داوە بیخەڵەتێنێ. زۆری هەوڵ دا، کارێکی دژوار بوو نەیدەتوانی زەفەری پێ ببا. شەیتان کورێکی هەبوو ناوی «وەسواس» بوو. ئەمە بەباوکی دەڵێ من چاری بەرسیس دەکەم، کەچی بۆ ماوەیێکی زۆر هیچی پێ نەکرا، لە دواییدا فێڵێکی دۆزییەوە بەمە نەبوایە نەیدەتوانی بەسەر بەرسیسدا زاڵ بێ، پیلانەکە ئەوە بوو بەهۆی کچێکی شۆخ و شەنگەوە لەرێ دەری بکا.

بۆ ئەم مەبەسە شەیتان خۆی کرد بەعابیدێک، لە نزیک بەرسیسەوە دەستی بەعیبادەت کرد. وا بوو بەرسیس چووە زیارەتی و خۆی پێ ناساند و کەوتە گفتوگۆ لەگەڵیدا، شەیتان وتی: کەسی سۆفی و بەدین پێویستە شێخی هەبێ بۆ ئەوەی رێبەر و رێپیشاندەری بێ، سۆفی بەبێ مورشید نابێ. وابوو لە ئەنجاما بەرسیس ئەوی کرد بەشێخی خۆی.

میری وڵاتی شام کچێکی جوان و رەند و بەدەوی هەبوو، لە وێنەی حۆری بەهەشتدا بوو. شەیتان خۆی کرد بەپیرێژنێک و چووە لای کچەکە، کچ نووستبوو، پیرێژن لە بناگوێدا قیراندی، کچە راچەنی و لەرز و تا گرتی، لە دواییدا تووشی نەخۆشی دەمارگیری بوو.

میری شام زانا و پزیشک و مونەجیمی هەموو لایێکی کۆکردەوە، چارەی نەخۆشی کچەکەیان بۆ نەکرا. لە دوای سێ رۆژ شەیتان چووە خەونی دایک و بابی کچەکە، پێیانی وت: ئەگەر دەتانەوێ کچتان چاک بێتەوە بیبەنە لای بەرسیس، شەوێک بەتەنیا لای ئەو بمێنێتەوە لە نەخۆشییەکەی چاک دەبێتەوە. میر بۆ ئەم مەسەلە پرس بە وەزیر دەکا، وەزیر دەڵێ: ئەم خەونە راست نییە، بەڵام میر بەقسەی وەزیری نەکرد. ئیتر کچەیان ئامادە کرد و بردیانە ئەشکەوتی بەرسیس، بەڵام بەرسیس بەگوناهی دەزانی تەماشای دەموچاوی بکا. شەیتان پەردەی لەسەر روخساری کچەکە لادا بە بەرسیسی وت تەماشای بکا. بەرسیس کە چاوی پێکەوت خۆی پێ نەگیرا و کچەکەی لە کچێنی خست، بەڵام زوو پەشیمان بووەوە، بەشێخی خۆی، واتە بەشەیتانی وت زینای کردووە. شەیتان پێی وت: دەترسم کچەکە زگی پڕ ببێ و ئەم نهێنییە ئاشکرابێ، لەبەر ئەوە باشترە بیکوژی. بەرسیس کچەکە دەکوژێ لە ژێر لم دەیشارێتەوە.

کچەکە شەو دەچێتە خەونی باب و دایکی و پێیان دەڵێ بەرسیس کوشتوومیەتی و لەژێر لم شاردوویەتیمەوە. باوک و دایک دەچنە لای شانۆی کارەسات و لاشەی کچەکەیان دەدۆزنەوە، بەرسیس دەگرن بۆ ئەوەی لە سێدارەی بدەن. لەو کاتەدا شەیتان دێتە لای، بەرسیس پێی دەڵێ رزگارم بکە! شەیتان دەڵێ سوجدەم بۆ ببە خەلاست دەکەم. بەرسیس سوجدەی بۆ دەبا و لە دین و ئیمان دەردەچێ و لەسێدارە دەدرێ، بەم رەنگە هەموو عیبادەتەکەی بەفیرۆ دەروا».

فەقێ تەیران گێرانەوەی چیرۆکی بەرسیسی عابید بەم دێرە شیعرانە دەست پێ دەکا.

گوهـ بدنە پیرێ دەفتەران
دا ئەز بخونم ڤێ خەتێ
خودێ ئیزنا مە بدە



ل جوندییێ د خزمەتێ

***

خزمەتا سوڵتان و میران
سنعەتا دانا و وەزیران
هوون مەکن بێ شێخ و پیران
گوهـ بدن ڤێ شیرەتێ

***

ئەڤ پەندە خاسە شیرەتە
شەرتی غولامان خزمەتە
باخو نەبین زەحمەتە
حەقێ ئینساف و مروەتێ

وەکو لەم پێشەکییەدا دیارە شاعیر لە دەستووری دارشتنی چیرۆکی شیعری لە رووی ناوەرۆکەوە هەندێ لای داوە و بەموناجات و نەعت و پێداهەڵدانی پێغەمبەران و ئەولیایان دەستی بەگێرانەوەی چیرۆکەکەی نەکردووە، بەڵکو تەنیا لە سوودی مانای ناوەوەی رووداوەکان دەدوێ و یەکسەر دێتە سەر باسی قارەمانی چیرۆکەکە بەرسیسی عابید.

هاتم قسا بەرسیس ببێم
شەیتانی یا ئیبلیس ببێم
ل عابیدێ حەبیس ببێم
ئیزهار بکم وێ شوهرەتێ

***

ئیزهار بکم بەحسێ د عام
بەرسیس ریجالەک بوو د شام
تاعەت دەکر دائیم مودام
زەربوو ژ خەوف و هەیبەتێ

***

زەر بوو ژ وەعزێ سەروەران
دوور بوو ژ بەحس و خەبەران
کەفتە مغار و کونبەران

جوو بوو مەقامێ وەحدەتێ

***

بەرسیس نموونەی عابید و سۆفییێکی ڕۆژگارانی پەیدابوونی فەلسەفە و ئیدیۆلۆجییەتی سۆفیزم بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. بەرسیس سۆفییێکی خۆڕسک بوو، واتە شێخ و مورشیدی نەبوو. ئەم دیاردەیە هەڵوێستێکی جوانکاری تێدایە شاعیر بەکاری هێناوە بۆ ئەوەی هێزی ناپاک (شەیتان) وەری بگرێ و کۆتایی چیرۆکەکە تراجیدییانە بکەوێتە ڕوو.

ترسا خودێ پڕ لێ هەبوو
ژ عامێ و غەیرانی ڤەبوو
سەد حەیف کو شێخەک نەبوو
مابوو دوێ خەبینەتێ

***

ئەر ئەولیا ئەر ئەنبیا
ئەر عابید و ئەر ئەسفیا
بێ شێخ و پیر جائیز نییە
تاعەت بکن ڤێ وجهەتێ

***

شەیتان بەوێنەی عابیدێکی سۆفی خۆی دەنوێنێ و دەکەوێتە عیبادەت لە نزیک بەرسیس کونجێک بۆ خۆی دەدۆزێتەوە و خەریکی عیبادەت دەبێ.

ئەو ساحیرێ ڕەنگ سامیری
خەملی ب لبسێ زاهیری
نیزیکی بەرسیس ئیوری
ب حوججەتا عیبادەتێ

***

وی عیبادەت بێ حسێب کر
بەرڤە قیبلێ سەر ڤەجێب کر
تێک و ڤێک حیلەئو لێب کر
زاهیری شێخ شوبهەتێ

بۆ هێنانەدی ئەو مەرجەی پێویستە هەموو عابید و سۆفی و دەروێشێک شێخ و مورشیدی هەبێ



بەرسیس هاتە سەر ئەو باوەڕەی عابیدی هاوسێی بکا بەشێخی خۆی.

بەرسیس دبێ ئەو دێ وەبێ
دێ کێ ژ تە چێتر هەبێ
ب پیر و ئوستادێ مەبێ
ئەز ژێ بین نەفعەتێ

***

خەیر و شەڕ و مەکر و بەلا
موهرا نەسیب و ئەجەلا
ڕاست بوو ژ ڕۆژا ئەزەلا
ئەمرۆ بەرات ژ بال تە تێ

***

ئەزەلی بەرسیس حەموول کر
شێخی یا ئیبلیس قەبوول کر
خێر و شرومی یێ فوزوول کر
چوو تەلیسما دولەتێ

لە دوای ئەوەی عابیدەکە بوو بەشێخی بەرسیس، ئیتر کەوتە پیلان دانان لە پێناوی ئەوەی لە ڕێی ڕاست دەری بکا. بۆ ئەم مەبەسە نەخۆشی کچی میری شام بەکاردێنێ. فەقێ تەیران بەم جۆرە وەسفی ئەو کچە نازەنینە دەکا.

میرەک هەبوو بێ حەد ب مال
بکرەک هەبوو قامەت شەپال
سیما وەکو بەدرا کەمال
قەت کەس ئەدا کت وەصفەتێ

***

قەت کەس ئەدا کت مەدحان
شەبیهێ هەیڤا چاردەهان
عومر ژ وان سال و مەهان
ویلدان و حوورا جەننەتێ

***

ویلدان و حوورا بێهن خوشە
ئەشک و غەزالا چاڤ ڕەشە
دێم قەمەرە خال حەبەشە
حیبرا بی بێ سەر کاغەتێ

***

خالێ ژ ڕەنگێ فلفلان
ئیلان و جووتێ قاتیلان
ئەو فڕ دکن خوونا دلان
باکر چ زانت مروەتێ

***

ئەو کچە جوانە تووشی نەخۆشی دەبێ، شەیتان دەچێتە خەونی باوک و دایکی، ڕێنماییان دەکا ببیەنە لای بەرسیسی عابید، سۆزی دایکێتی و باوکێتی بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ دەبێ، بڕیار دەدەن بیبەنە لای بەرسیس و بیر لە هیچ جۆرە ئەنجامێک ناکەنەوە.

د خەوێن دبین باب و دێ
وە دڤێ کچێ خوش کت خودێ
باندێ بنە بال زاهیدێ
ڕۆژەک بدەن لێ موهلەتێ

***

کارا کچێ کن ب ئاواکی
سەری بشون ب ئاڤەکی
دا شێخ ببینێ گاڤەکی
قەنجە ل بو مەسلەحەتێ

***

ڕابوونە خەملا وێ بکن
کارێ کو باب و دێ بکن
لازم قەوی دێ چێ بکن
ژ زیڤ و زێڕێ سبەتێ

***



یەک جار د زیڕی وەردکن
کاشانیا د بەر دکن
تێکدە جلا ماوەر دکن
ژ بێهن و بوخورا حوسنەتێ

***

دێما گولی سوراڤ دکن
زولفان ل سەر داڤ داڤ دکن
ب حنەئو زەرباف دکن
ب جەوهەرێ د قیمەتێ

بەرسیس کە چاوی بەکچەکە دەکەوێ لە هۆش خۆی دەچێ و خۆی لە نێوان دوو ئاگردا دەبینێ، یەکێکیان وەک سۆفی، ئەویتریان ئادەمزادێک دەکەوێتە داوی شۆخێک گەلێ ئاستەمە کەسێک بتوانێ لەو داوە ڕزگاری ببێ.

ئەو عابیدێ حەیران و مەست
بەند بوو ب تەقدیرا ئەلەست
شێخ ئیختیار چوو بوو ژ دەست
شەرمەندە بوو د خلوەتێ

***

شەیتان دبێ قەت شەرم مەکە
یەک ئادەمەک نین بێ لەکە
باندێ ژ عەیبان توبە کە
مووسا دکت شەفاعەتێ

***

قەت غەم مەکە دونیا وەیە
بەنگ و زینا قەتل و مەیە
ل وان حەمییان تەوبە هەیە
پاقژ دبت ب تەوبەتێ

***

ب تەوبێ دچن بێ ئەدەبی

ترسم کچێ حەملەک هەبی
باندی تو ژی شەرمەندەبی
کو بکن گەلۆ ژ ڤێ قیسسەتێ

***

شەیتین ژ بەرسیس لەومە کر
تە فتنەکە هەڤ خوە کر
چا خو ژ میر شەرمەندەکر
داخل بووی د خەتیئەتێ

***

شەیتان توانی بەرسیس بخەڵەتێنێ و بەناوی دوعا و تیمارکردنی نەخۆش ئەو کیژە نازک و نازەنینەی لە کچێنی خست، شەیتان هانی دا بۆ ئەوەی لەم کارەساتە ڕزگاری ببێ بەکوشتن تاوانەکەی بشارێتەوە.

پاش کو بەلا بوو سادیرە
قەتلا کچێ ئەولا ترە
دا سەح نەکن باب و برا
ترسم ژ تە ژ سیاسەتێ

***

ڕەنگ و ڕووی شێخ شەحتاند
ئەو ل تەریقێ غەلەتاند
کچ کوشت و خون لێ شەبتاند
شەرعێ ژ بابێ دیە تێ

لە دوای کوشتنی کچی میر، شەیتان دەچێتە خەونی باوک و دایکی و تێیان دەگەیەنێ کە کچیان خراپ کراوە و لەژێر لم شاردراوەتەوە.

بابێ ژ خەونێ دل ڤەگەشت
شاه و غولام ڕابوون ب قەست
چوونە شکەفتێ دەست ب دەست
داخواز دکن ئەمانەتێ

***

میر فەرمان دەردەکا بەرسیس لە سێدارە بدرێ.



جەلاد ژ گەنجان کار دکت
بەرسیس ژ دەست هاوار دکت
مەلعوون خوە لێ ئیزهار دکت
دیسان گهایە لەعنەتێ

***

بەرسیس گری گوتی ب زار
نییەت خرابێ قەلسێ یار
چرا نەهاتییە دیار
بێ شەفقەت و بێ ڕەحمەتێ

شەیتان بۆ بەئەنجام گەیاندنی پیلانەکەی، داوا لە بەرسیس دەکا ئیمانی پێ بێنی ئینجا لە کوشتن ڕزگاری دەکا ، ناچار دەبێ ئیمانی پێ دێنێ. بەم جۆرە بەرسیس لەدین و دنیا دەبێ. بە لەسێدارەدان گیانی بەدۆزەخ شاد دەبێ.

فەقێ تەیران بەم چوارینانە دوایی بەچیرۆکە شیعرییەکە دێنێ.

بێ حیساب(مکسی) خەبەردان
ژ یارا قەلس و نەمەردان
دێ نەدامەت بێ ب سەردان
(میم و حێ) ب روایەتێ

***

(میم و حێ) ئەڤ بەند دگۆتن
ئەم ب مەعنایێ هەڤۆتن
عوجبێ گشت خێزان دشۆتن
لەو ریا ب کێرنەتێ

***

فیعلا خراپ خو د بینییە
عوجبێ مەکن ل دینییە
دەربا سەر راست مسکینییە
ژ دەروێشی و حەقارەتێ

فەقێ تەیران لەم چیرۆکە شیعرییەدا مەبەسی ئەوەیە ئەنجامێک بخاتەڕوو بەپێچەوانەی چیرۆکی

«شێخ سەنعان» بێ، هەردوو گێڕانەوە بەهەناسەییێکی سۆفیزم بەڕێوە دەچێ، بەڵام لە یەکەمیاندا ڕاستی سۆفیزم دەخاتەڕوو کە شێخ سەنعان و کچە گاوور لەناو یەکتری دەتوێنەوە و لە بەهەشتدا بەژیانی جاویدانی شاد دەبن، بەڵام لە دووەمیاندا شێخ بەکافری سەر دەنێتەوە، چونکە لە بیروباوەڕیدا ڕاست نەبوو بۆیە بەرگری خراپەی (شەیتان)ی پێ نەکرا.

## هەی ئاڤ و ئاڤ

بەیتی «هەی ئاڤ و ئاڤ» یەکێکە لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی فەقێ تەیران، زیاتر شاعیر لەم شیعرەدا خەریکی ئامۆژگاری و بینینی خۆیەتی بەرامبەر بەجوانی سروشت، لە لاییێکی تریشەوە دانایی دەردەبڕێ لە ڕاست کردەوەی ئادەمزاد. ئەم بەرهەمە بەناوی «بەیتی فەقێ تەیران بەر ئاڤێرا خەبەردایە» تۆمارکراوە، وا باوە شاعیر ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵ ڕووبار دیجلە (ڕووباری بۆتان)دا کردووە لە گوندی فینیک.

فەقێ تەیران پێش ئەوەی دەست بکا بەگفتوگۆ لەگەڵ ڕووبار، دەڵێ «بەیتا من پڕ خوەشە، گۆهـ بدن، خودان کەمال».

هەی ئاڤ و ئاڤ هەی ئاڤ و ئاڤ
ماتو ب عشق و موحبەتێ
پێلان د دی خورت و بەلاڤ
بێ سەکەنی و بێ ڕاحەتێ
بێ ڕاحەت و بێ سەکەنی
یان عاشقێ یاخوە خوەنی
یان شوبهەتا قەلبێ منی
ژ عشقاکێ ناتەبتێ
ژ عیشقا کێ هەر تێی و تێی
هەتا کەنگی هەر بێی و بێی
بۆ من بێژە حەیرانی کێی
دا ئەز بزانم قیسەتێ
دا ئەز بزانم ڤێ سڕێ
ژ هندکێ هەتا پڕێ
ژ مەعنیا ڤێ گورگورێ
ژ کێرا دکی ڤێ تاعەتێ
ژ کێ را دکی زیکرێ ب حال



قەت کشکشێ ناکی بەتال
تەشبییە من ڕەهەت و عەمال
شەڤان و ڕۆژان خەو نەتێ
شەڤان و ڕۆژان بێ خەوی
ژ محبەتا کێ دتەوی
شەڤ تارییان قەت نەخەوی
ژ ئەمری کێ ڤلەز کەتێ
هەی ئاڤ مال خراب ب بەز
ژ عەردەکی تو تێی ب لەز
سەوداسەری وسا ژ ئەز
تو وەها دهەری خزمەتێ
خزمەت دکی بێ پێ و دەست
چەندی دکی چوونا گوهەست
خودێ نەگۆ گاڤەک نەوەست
دایم دچی دەنگێ تە تێ
دەنگێ تە تێ ب ڕۆژ و شەڤ
تاعەت دکی بێ قەلب و دەڤ
پێل را ددن ژ مەوجێ کەف
شین بووی ژ ڕەنگێ قودرەتێ

وەکو لە پێشەکی ئەم موناجاتە دەردەکەوێ فەقێ تەیران گفتوگۆ لەگەڵ ڕووباری دیجلە دەکا، دەیەوێ ئەوە بخاتەڕوو نەنوستن یا بێ خەوی ڕووبار بکا بە بەڵگە بۆ زیندوویێکی هەمیشە هوشیار، ئەم سیفەتە بەکاردێنێ لە پێناوی دروستکردنی وێنەی جوانی شاعیری. وێنەی بزووتنەوەی ئاو لە گۆڕان دایە، لە چرکەییێکدا دیمەن دەگۆڕێ، شاعیر دەڵێ:

گەهـ گەهـ سپی تەشبی بەشیر
مسلی تە قەت ناچن چو تیر
دەنگی تە تێ یار تێتە بیر
مێلا حەبیبێ ب چوونا تە تێ
لازم تە مەحبووبەک هەیە

یان مەیل و مەتلووبەک هەیە
یان دۆست و مەنسووبەک هەیە
یان سرڕ و مەرمووزەک هەیە
لەو بێ لیباس و کەسوەتێ
لەو بێ لیباس و تازی یی
د شێر و ڕەقس و گازی یی
ژ کێرا دکی عشق بازی یی
ڕەمزان و خوەش ئیشارەتێ
ڤان تەشبیهان ژ کێرا دکی؟
ڕەمز و سەوادان فێکرا دکی
حەمیان ژ بال خوە را دکی
دگەڕی ژ مەحەلا غوربەتێ
دگەڕی د ڤێ پیرە دنێ
قەت نانڤی ناسەکنێ
ڕەنگ شوبهەتێ قەلبێ منێ
ژ میحنەتا ئەو زەحمەتێ
زەحمەت بەری محبەت کەشی
تو نازکی تەبعەت خوەشی
بێ ڕوح ل عەردا دەمشی
بێ دەست و پێ تو ژ کوڤەتێ
بێ دەست و پێ بێ چەنگ و پەڕ
ئەڤ پێل و مەوج و فەتل و گەڕ
پەیدا دبن ژ تە کەڕ و فەڕ
ناکی بەیان ڤێ عیللەتێ
ڤێ عیللەتێ بەیان بکە
تۆ ڤێ سرڕێ پەنهان بکە
جارەک ل من عەیان بکە
دا سەح بکین حیکایەتێ



دا سەح بکین ڤی مەسئەلێ
جوزئەک ژ بەحسا ئەووەلێ
بنیاد بۆنا مەنزەلێ
دەوران و چەرخا خیڤەتێ
خیڤەتا عالەم د ناڤێ
ژ بەرکەتا فەیز و گولاڤێ
من تەمەننا کر ژ ئاڤێ
ژ مەعنیا حەقیقەتێ
حەقیقەتا ڤان جەوهەران
مەعریفەتا عەناسیران
پەنهان نەکە ژ یار و بران
بێ فەم ببێژە حیکمەتێ
بێ فەم و قیل و قال ببێژ
ژ من را ب لەفزی حال ببێژ
هەر (میم و حێ و دال) ببێژ
شەرح و بەیانا کاغەنێ
ڤێ کاغەتێ ئیسبات بکە
قەید و سیڕ ئیختیار بکە
قەنج ڤێ سرڕێ بنیا بکە
دا ئەم بزانن ڕەبێیەتێ
دیدار و دینا سەرتەمی
ئاڤێ ب ڕەببێ عالەمی
تو حادیسی یان قیدەمی
یان تو نزانی حیکمەتێ
ڕۆژەک ژ بنیادا مەزن
گەر چ نە مەشرووح ئەشخن
بینا قەدەح ژ هاتە من
ئەو بین ژ بنیادا تە تێ

یانێ ژ بنیایادا دەلال
بۆری ل من کو چەند سال
قەت کەس نەکر ئەڤ ڕەنگ سوئال
هەتا نها ڤێ سەحەتێ

هەتا گهامە ڤێ دەمێ
جا یەک نەبوو ژ ڤێ عالەمێ
عەبدەک ژ پشتا ئادەمێ
ب فکرادا هەوالێ شەتێ

کەهنی دزێن شەت ژێ دچن
هەنگێ خودێ دان ئنس و جن
ئادەم نەکر پرسەک ژ من
نەژ ئەنبیا یێ ئۆمەتێ

شاعیر هەمیشەیی ڕووبار لە هەمیشەیی کردگار دەبینێ، لە بنجدا هەمیشەیی بۆ کردگارە، ئەگەر ئەو سیفەتە لە شتێکی تردا هەبێ، بێگومان ئەو شتە کردەوەی کردگارە. فەقێ ئەمە لە پێغەمبەرانیشدا دەبینێ. هەر لەو چەند دێڕەدا ئاوورِ لە «سەرتەم» دەداتەوە، باس لە ئایینی دەکا و ئارەزووی دیداری هەیە. سەرتەم ناوی ئەو کچە گاوورە (ئەرمەنە، یا گورجە)یە کە لە بەرهەمە سۆفیزمییەکانی فەقێ تەیراندا هاتووە.

پێغەمبەران عەقل هەبوون
قەت هەوجەیێ پرسان نەبوون
مەکسی دبێ ئاڤێ وەبوون
وان دەست گهابوو سوحبەتێ

ئەو سوحبەتا جارا ئەول
پێغەمبەران دزانن شوغل
عەیبە ل بال ئەهلێ عەقل
تەفتیش بکن مەعریفەتێ

مەعریفەتێ تەفتیش بکن
پرسێ ژ بو نا پیش بکن
قەنج ڤێ قسێ تەفتیش بکن
ژ عارفان کەراهەتێ

خەلقێ خودێ عەقل کرن
هەم عاریف و کەمال کرن
نوورەک د دلدا هلکرن
ئەسلێ قسا وی پێ کەتێ

یێ میسلی من بێ عیلم و خەت
مەجنوونەکێ حەیوان سیفەت
تەفتیشا پرسان ئەو دکەت
لەوما کولیپە ل ئۆمەتێ

پرسا (فەقێ) بێ جە نەبوو
لەو را د قورئانێ هەبوو
عەرشێ خودێ ل سەر تە بوو
ئاڤێ گەلۆ بیراتە تەتێ

شاعیر پەنا دەباتە بەر ئەفسانەی سۆفیزم، دەیەوێ هەندێ لە حیکایەتی دروستکردنی گەردوون بگێڕێتەوە، بەوەی عەرشی کردگار لەسەر ئاو بووە، یاخود لە سەرەتادا ئاو دروستکراوە، ئینجا پەنجە بۆ فەلسەفەی پێش فەلەسەفەی گریک درێژ دەکا، چوار فەیلەسووفەکانی بەرایی کە «ئاو» و «با» و «خاک» و «ئاگر»یان بەبنچینەی دروستکردنی «گەردوون» داناوە یا جەوهەرە بنچینەییەکان.

ئاڤێ جەواب دایە سووخەن
ئەزمان نەبو ب حال گۆتە من
ڕەمزێن د پادشاهێ مەزن
سوبحان ژ وێ سەلتەنەتێ

سوبحان ژ مەعبوودێ ل سەر
کێ دی ژ خودێ کت خەبەر
ئەم جارەکی ئینانە دەر
کەچ بوون د کەنرا قودرەتێ

کەچ بوون د کەنزا ئەقدەمێ
با خوە ژ عەشقا ئادەمێ
ئینانە کارێ عالەمێ

زاهیر کرن ڤێ سوورەتێ
زاهیرکردن چار باکرە
ئاڤ و هەوا خاک ئاگرە
حەیوان هەمی ژ چی کرە
دار و نەباتا کوەتێ
دار و نەبات لەعل و زەر
حەیوان و ئەسنافێن د سەر
تەیر و تویوور و دەعبەوەر
تەرکیب کرن ژ نوتفەتێ
چ تشت پیچە نا فەرجن
ئینسان ژ تینی خارجن
لەو جن ژ ناری مارجن
ڕۆژەک ژ من یەک تەبعەتێ
چار تەبعەتێن ڤێکرا ز دین
هن ئاتەشێن هن باردین
د بەحرا (هەیوولا) دواردین
مەلبووس کرن ب ڤێ وجهەتێ
ب چار وەجهان ئەم یابسین
قەدیم یەکە ئەم حادیسین
لەوما ژ تینا یابسین
هندێ دخوازن ڕەفعەتێ
هەم سوفلەوی بازی دکن
هەم مەیلی ئەفرازی دکن
هەم (کەینوون)هەم گازی دکن
جارەک بینن ڕەویەتێ
جارەک بینن ئەم چا خوەهین
بێ مەسلەحەت نا کەڕهین
ژ مەشیەتێ نا بەتهین



جودا کرن ژ وەسفیەتێ
ژ وەسفەتێ جودا کرن
ژ سوحبەتێ ئەم ڕاکرن
حەتتا قیام سەودا کرن
سەرگەشتە بوون د حیرەتێ
د حیرەتێ سەر گەشتە بین
قائیم ل سەر زاتێ خوە بین
چاردە تەبەق کاریێ وەبین
ڕا بوو ژ مازا غەفلەتێ

لە ئەنجامی خوێندنەوەی ئەم شیعرە دوو ڕاستیمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، یەکەمیان ئەوەیە فەقێ تەیران وەک ڕۆشنبیرێکی هۆشیار خۆی پیشانمان دەدا، ئەوە دەردەخا کە شارەزایی لە مێژووی گریکدا هەیە، بەتایبەتی فەلسەفەی سەرەتایی کە بەفەیلەسووفەکانی بەرایی پێش سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ ناسراون. دووەمیان هەستی بەژیانی هەمیشە زیندووی پڕ لە جموجۆڵی ئاوی ڕووباری دیجلە کردووە، لەم تیۆرییە و لە بزووتنەوەی ئاوەکە هەندێ وێنەی شیعری داهێنراوی دروست کردووە لەم پارچە شیعرەدا کە بەڕاستی مۆنۆلۆجە، بەڵام بەوێنەی دیالۆج خۆی دەنوێنێ.

## دلۆ ڕابە

ئەم بەیتەی فەقێ تەیران دەچێتە ناو ئەو بەرهەمانەی بەچیرۆکی شیعری دەژمێردرێن. لەسەر بنچینەی چوارین هۆنراوەتەوە، کێشی هەشت سیلابی خۆماڵییە، قافیەی سێ نیوەدێڕی یەکەمی هەموو بەندێک یەکێکە (ا ا ا، ب ب ب...) نیوە دێڕی چوارەم لە هەموو بەندەکاندا (ارە)یە، تەنیا بەندی یەکەم نەبێ لە ڕووی قافیەوە (ا ب ا ب)یە، شاعیر ویستوویەتی لەم لایەنەوە جۆرە جوانکارییەکی مۆسیقی بنوێنێ.

بەیتەکە لە ٧٧ بەند پێکهاتووە، بەم چوارینانە دەست پێدەکا:

دلۆ ڕابە، دلۆ ڕابە
ڤەکە چاڤان کو ئێڤارە
نەزان و بەس د خەودابە
ژ نەومێ ڕا مەبە یارە

***

ل خوە شیرین مەکە نەومێ
ژ نەفسا خوە بکە لەومێ
مەچە نێزیکی ڤێ قەومێ

مەبە غافلێ بێکارە

***

دلۆ نەوما مە ژی بەحسە
بەیانا غەفلەتێ نەحسە
نە هشیاری گەلەک نەحسە
مەنێڤ خوا بە کو مردارە

***

دلۆ ڕابە ژ ڤێ خوابێ
وەکی باپیر وەکی بابێ
ئەم ژی دێ چینە توورابێ
ل بال با خوی وەفردارە

***

بەیتەکە بەم دوو چوارینە کۆتایی دێ:

(میم و حێ) حەفتێ فەلەک چوون
ژ هیجرەتی دەوران گەلەک چوون
سالٚ (هەزار و چل و یەک) چوون
ئەڤ غەزەل ئانی دیارە

***

ئەم بچن هەڤال بمینن
(میم و حێ) بیرا خوە بینن
فاتیحان ژێرا بخوێنن
هەر حوسن دەر ئینتیزارە

لەم بەیتەدا دیالۆجی شاعیر لەگەڵ دڵی دایە، بەلای ئەوەوە دڵ نابێ بخەوێ، چونکە نوستن بێ ئاگایی ساز دەکا، ئەمە دەبێتە کارەسات، وێنەی ئەو ڕووداوە ئاژاوەی ناوەوەی دەروونی ئادەمزادە.

لە چوارینی پێش دوایی شاعیر کاتی دانانی بەیتە غەزەلەکە دەستنیشان دەکا و ساڵی ١٠٤١ی هیجری بۆ داناوە، ئەمە دەکاتە ساڵی ١٦٣١ی میلادی.

## لیریک

ئەو پارچە شیعرانەیە کە خەریکی جوانی و دڵداری و سۆفیزم و سروشت و ژیانی کۆمەڵایەتین. فەقێ تەیران بەپێچەوانەی هەندێ لە شاعیرانی تر تەنیا لەگەڵ دلبەر قسە ناکا و وێنەی پەیکەری جوانی ئەو



ناکێشێ، بەڵکو گفتوگۆ لەگەڵ ڕووباری دیجلە و قاز و قولینگ دەکا، لە چارەنووسی ئادەمزاد دەوێ، دەرد و غەمی تایبەتی خۆی دەردەبڕێ، خوو و ڕەوشتی ژنی زمان درێژ دەخاتە ڕوو، ڕاز و نیاز و گفتوگۆی لەگەڵ مەلای جزیری بەڵگەی قسەی جوان و نیشانەی مانای جاویدانییە، جا لەگەڵ مەلای جزیری پێکەوە وتبێتیان، هەر کەسە و قسەکانی خۆی، یا شیعرەکە هەمووی فەقێ تەیران وتبێتی بەزمانی خۆی و مەلای جزیرییەوە ئەمەیان ئەوەندە گرنگ نییە.

باغچەی شیعری فەقێ تەیران گەورە و فراوانە، گوڵی هەمە جۆری تێدایە، هەموو ڕەنگێک دەنوێنن، هەموو بۆنێک دەپژێنن، بلبل ئەگەر لە ئاسمانی ئەو باغەدا لەنجە بکا ناتوانێ لانەدا.

(١)

ئەم پارچە شیعرە بەهاری و نەورۆزییەی فەقێ تەیران لە ڕووی کێش و قافیەوە لەسەر بنج و بناوانی کێشی هەشت سیلابی فۆلکلۆری خۆماڵی دانراوە، قافیە لەسەر دەستوورە گشتییەکەی فەقێ تەیران و شاعیرانی میللی دیکەی کوردستانی سەروو بەڕێوەدەچێ (ا ا ا ب، ا ا ا ج ...هتد) بەڵام ئەوەی لێرەدا سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە نیوەدێڕی چوارەم لە هەموو چوارینەکاندا دووبارە دەبێتەوە، واتە نیوە دێڕ «دیسا ب خێر بێتن بهار...»، ئەم بابەتە شیعرە لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی و نەتەوەکانی دیکەی ئیسلام فارس و تورک «تەرجیع بەند»ی پێ دەڵێن، بەڵام ئەوە هەیە لەوێ شیعرەکان لەسەر کێشی عەرووز دادەنرێن.

فەسلا بهارێ جەننەتێ
خوەش خوەش ل زۆزانێ مەتێ
مەن لەم یەراهو زینەتێ
دیسان ب خێر بێتن بهار

فەسلا بهار پیرۆزییە
بەژنا زراڤ نەورۆزییە
تەیران هەوار و گازییە
دیسا ب خێر بێتن بهار

ئەوان تەیران ئاواز دگۆت
شالویل و بلبل بوونە جۆت
ئەوان کەیفەک ب من فرۆت
دیسا ب خێر بێتن بهار

ئەوان تەیران ئاواز ئاواز
نێ سور دبن ئەو سی و قاز
ڕەڤدا قولینگ تێتن ب ناز

دیسا ب خێر بێتن بهار

(٢)

ئەم بڕە شیعرەی فەقێ تەیران گازاندەییێکی ئاساییـیە وێنەی لە غەزەلی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەبینێ، شاعیر بیر لە جوانی دەکاتەوە، بەڵام دەستی ناکەوێ، کەچی ئەو دەست نەکەوتنە دەبێتە هۆی ئەوەی بەرهەمێکی داهێنراوی جوان لە شیعردا بکەوێتە ناوەوە. ئەم بڕە غەزەلەش کە بریتییە لە (١٩) چوارین وەکو غەزەلەکەی پێشوو نیوە دێڕی چوارەم لە هەموو چوارینێکدا دووبارە دەبێتەوە، واتە نیوە دێڕی «ئای دڵی من ئای دلۆ...». غەزەلەکە بەم چوارینانە دەست پێدەکا.

دل ژ من ناکەت خەیالان
بوومە پەروانا سەمالان
بێری یا حوسن و جەمالان
ئای دلێ من ئای دلۆ
جان ڤریتم تە نە بینم
دەفتەرا عشقێ بخوینم
سەرخوەش و سەکران و دینم
ئای دلێ من ئای دلۆ
سەرخوەش و سەکران و مەستم
ئەفعایێ ئەسوەد دگەستم
سەبر و ئارام چوون ژ دەستم
ئای دلێ من ئای دلۆ

بەم چوارینانەش دوایی دێ:

گەزمەیا جەرگ و هەناڤان
هورترا ئەژنۆ ئوگاڤان
تارومار کر بووم ژ راڤان
ئای دلێ من ئای دلۆ
تارومار کر جان و جیسمە
بیرکردن جیران و خزمە
ئەڤ عیللەت بایەت تەلیسمە
ئای دلێ من ئای دلۆ



(میم و حێ) وەسفی خۆ هلدا
خوەش میسالن چون د جلدا
جەرح و کۆڤان چون د دلدا
ئای دلێ من ئاوی دلۆ

ئەم غەزەلە و شیعرەکانی دیکەی فەقێ تەیران ئەگەر لە ڕووی ڕوخسارەوە لەگەڵ چیرۆکە شیعرییەکاندا بەراورد بکرێن، جیاوازییێکی ئەوتۆ بەدی ناکرێن لە بارەی جۆری وشە و کێش و قافیە و ڕیتم و هەموو جەوهەرەکانی ڕەوانبێژی ترەوە.

(٣)

فەقێ تەیران لەلایەن ڕوخسارەوە دەورێکی باڵای هەیە لە گۆڕانی شیعری کوردی و دروستکردنی بابەتی تازە لە ڕووی قافیەوە، بۆ بەڵگە لەم بڕە غەزەلەیدا هونەرێکی نوێ دەنوێنێ بەوەی لەسەر بنچینەی کوپلەی سێ نیوەدێڕی پارچە شیعرێک دادەنێ نیوە دێڕی دوایی وەکو «خەرجە»ی مووەششەحەکانی ئەندولیسی وایە و هەر سێ «سێ یین»ەکەی پێ دادەخا.

بزانە کو من یار تو وی
تە ئەز کوشتم یەکجار تو وی
بێ دەست و هەم پا تو وی

***

پێ ب غەزەب خوەندی ئەزم
زنجیر ب زەندی ئەزم
عاشقی جندی ئەزم

***

خوەش قەد و ئەهلا تو وی
خوەش بەژن و بالا تو وی
پڕ بەخت و تالا تو وی
دوور ژ وەسلا ئەزم

(٤)

فەقێ تەیران لەناو کوردانی قەفقاسی ڕووسیا جێگە و ڕێگەییێکی تایبەتی هەیە، بەناوبانگە، خۆشەویستە، گەلێ لە شیعری جوانی میللی فۆلکلۆری دەدەنە پاڵ ئەم شاعیرە، لەبەر ئەوەیە هەندێ جار هەست بەوە دەکرێ شیعرێکی میللی بەناوی شاعیر ناوبانگی پەیدا کردبێ یا بەپێچەوانەوە هەندێ

شیعری فەقێ تەیران ناوی خاوەنەکەی ون کردبێ و بووبێ بەشیعری میللی سەرزاری بێ خاوەن. لەم لایەنەوە قەناتی کوردۆ دەوری دیاری هەیە لە کۆکردنەوەی هەندێ لەو شیعرانەی لەناو خەڵکیدا بەشیعری فەقێ تەیران ناسراون. زۆریان لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی لەلایەن هەندێ لە زانایانی ئەرمەن و کوردەکان خۆیانەوە تۆمارکراون و بڵاوکراونەتەوە.

ئەم شیعرەی خوارەوە بەناوی «دلبەر» لە کۆکراوەکانی ڕۆشنبیری ئەرمەنی (س. مووڤێسیان)ە لە کتێبی «زماننامَا کورمانجی» لە ساڵی **١٩٣٥** لە یەریڤان بڵاوی کردۆتەوە. قەناتی کوردۆ تێکستی ئەو شیعرەی بەتیپی لاتینی نووسیوەتەوە و لە کتێبی «تاریخا ئەدەبیاتا کوردی» بڵاوی کردۆتەوە.

ئەی دلبەرا گەردەن زەری
وەی نازکا دێم قەمەری
قامەت ژ مووما فەنەری
ویران ئەزم مالم خراب
ئەی دلبەرا گەردەن لەتیف
وەی نازکا قامەت ئەلیف
قامەت ژ رەیحانا خەفیف
ویران ئەزم مالم خراب
ئەی دلبەرا گەردەن دوراج
وەی نازکا میسلی زوجاج
قامەت ژ ڕەیحانا قەراج
ویران ئەزم مالم خراب
ئەی دلبەرا قامەت میسال
وەی نازکا دلی هەژار
تە ژ خاندن کرم بەتال
ویران ئەزم مالم خراب
ئەی دلبەرێ وەی دلبەرێ
فەریاد ژ دەستێ کەسەرێ
ئاڤەک ژ ئاڤا کەوسەرێ
ویران ئەزم مالم خراب
ئەی دلبەرا گەردەن زراڤ



دێم شووشەیە، تژی گولاڤ
ئەی دوختەرا بەژنا زراڤ
ویران ئەزم مالم خراب
چاڤان کو هلتینی ب مەستە
ئەو چەند یا میسری ب دەستە
ل کوشتنا من تە ب قەستە
ویران ئەزم مالم خراب
ئەو ب قەستا من بکوژی
ئەو کافرە دل ناسۆژی
گەلەک سۆتم کرم ڕژی
ویران ئەزم مالم خراب
گەلەک سۆتم کرم کەباب
کریە ب من سەد ڕەنگ خراب
یا لەیتەمی کونتو توراب
ویران ئەزم مالم خراب
یالەیتەنی کونتو ڤە خوور
وەی نازکا من تە ژ دوور
بێ هش کرم زلفی د حوور
ویران ئەزم مالم خراب
بێ هش کرم زلفی د ڕەش
بسکێ سیاه، بهنێ د خوەش
ئەی دوختەرێ چابک بمەش
ویران ئەزم مالّم خراب
بێ کێف کرم زلفێ د رەش
بسکێ سیاه زلفێد قەمەر
عەشق و حبەتا من ل سەر
ویران ئەزم مالم خراب
سۆتم بەرشاتم بی حەساب

لێ پرسی بۆ کرمە کەباب
کریە ب من سەد ڕەنگ عەزاب
ویران ئەزم مالم خراب
سوبحان ژ شاهە ب تەنێ
خالیق ل خالا گەردەنێ
ئەز دین کرم بەردان دنێ
ویران ئەزم مالم خراب
عەشقا مەزا ج پەیدا بوویە
ئیرۆ ل من دژڤار بوویە
هیڤی دکم حەقیقییە
ویران ئەزم مالم خراب

فەقێ تەیران لەم بڕە شیعرەیدا ئەفسانەی دڵداری گیانی دەخاتە ڕوو، زیاتر بەسیحر و جوانی دلبەر هەڵدەڵێ ئەوەی دڵی خۆی هەستی پێدەکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەچاو و بسکی ڕەش دوور نەکەوتۆتەوە ئەوەی ڕەمزی دیاری کەرەستەی جوانکارییە لە شیعری نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

(٥)

ئەم غەزەلەی فەقێ تەیران بەناوی «فەقێ تەیران و ئەڤینا دلا» موناجاتێکە لەگەڵ دڵ، ڕەنگە وەکو دیالۆجێک بکەوێتە ڕوو، بەڵام لە ڕاستیدا مۆنۆلۆجە، واتە فەقێ تەیران لەگەڵ خۆی قسە دەکا، هەر خۆشی بەدڵ داناوە، لەبەر ئەوەیە دڵ وەرامی ناداتەوە بۆیە دەبێتە مۆنۆلۆج.

لە ڕووی کێش و قافیەوە شاعیر پێڕەوی هیچ دەستوورێکی نەکردووە، کێش ئاساییە، خۆماڵی و هەشت سیلابییە، بەڵام یاریی بەقافیە کردووە لە غەزەلەکەدا سیستێمی کووپلە بەدی دەکرێ، بۆ ئەم مەبەسە سێ جۆرە کووپلەی بەکارهێناوە: هەندێکی مەسنەوی، جووت قافیە، یا دوونیوە دێڕ شیعر، بڕێکی سێیین (سێ نیوە دێڕ شیعر)، هی دیکەی چوارین (چوار نیوە دێڕ شیعر).

نەرۆ دلۆ دلێ بازی
چ ژ حالێ من د خوازی
بەسە بکی هەوار و گازی
تە ئەز کرمە بەلەنگازی
***
ئیرۆ سڤەکە ژ هەر سڤامە



ئەز خەیالا دلدا مامە
نزانم شەرقێ هاتمە شامە
***
نەرۆ دلۆ توب تفق
تو رێوی یی هاتە مفرق
***
هەرۆ دلۆ چرا وو سا د کەوگری
بەسە دکی شین و گری
حیساب بتە گەت نە ل ڤری
چرا ژ ئەڤنا زۆر د گری
***
برینا دلێ من ساغ و سلی
ژ کەزەڤێ دا دخلی
هەر دل بکە شین و گری
***
دلێ من ئیسنانێ بێ زمان
ل من دکە هەوار و فەرمان
***
گەلۆ ژ بۆ چ ئەز ل ڤر نەمام
سەد و پێنج سالێ من بوون تەمام
***
ڤێ سەیادی ل من دا بوو
ل بن بەحرا مەزن را بوو
***
هەرۆ دلۆ ژ خەوێ رابە
غەما دل وێ بەلابە
ژ بەلقیسایێ نایێ جابە
***

کۆفیا هلکەڤ خەملی سەردا
کەچک هات رابووم بەردا
گەلۆ کێ ژ دلێ من خەبەردا

***

شەربەتا لەوز و کلامان
دا دەست خاس و عامان
دلێ من ئینسانێ بێ زمان
ل من دکە هەوار و فەرمان

***

بوو پاییز ل ڤان دەران
خەزان زەر بوون سەرێ داران
سەفا نا بە ل وان دەران

***

دلۆ چما تو ها خواری
تو ژ من را بێ ئیعتیباری
گەلا هەیە ئینسانێ نەمری

ئەم پارچە غەزەلە لە کۆکراوەکانی کوردی قەفقاسی ڕووسیایە، بۆ یەکەمین جار قەناتی کورد بڵاوی کردۆتەوە.

(٦)

ئەم غەزەلەی فەقێ تەیران نموونەیێکی پراکتیکییە لە بەرەنگاورەنگ کردنی قافیە و ژمارەی کوپلە (بەندەکان) بەئارەزووی خۆی دیاری دەکا، کوپلەی دوو نیوەدێڕی و سێ نیوەدێڕی و پێنج نیوە دێڕی بەکارهێناوە. لەمانادا دلبەری لێ ون بووە، هەوار بەهەوار لە دوایدا دەگەڕێ.

وای دلبەرا دێم ب شەمال
بۆتە دگەڕم وار ب وار
هەر بۆتە بووم خراب مال

***

تو دلبەرا ئەسل زادە
تە ژ من بریە چاخ و وەدە



قنیات دل دا بوویە بێ سەودە

***

تو دلبەرا من عەنەلا
ئیرۆ قەوی ژ من بووی جودا
ئەز مامە بێ هش و سەودا

***

تو دلبەرا دەرێ بێ قەبایێ
ب ئوسول جەمال تفڤی ڕوو دنیایێ

***

قەوی ئیرۆ من جەد کرییە
درهەم لە خەلقێ زەف کرییە
سێ سەد و شێست بەیت حازر کرییە
ل ناڤ خەلقێ بەلاڤ کرییە
هاڤەکی رند ل خوە کرییە

گەڕانەکەی شاعیر بەدوای دلبەردا لەبەر ئەوەبووە پێی بڵێ چیرۆکێکی شیعری داناوە لە سێ سەد و شەست بەیت پێکهاتووە. ئەمە یەکێکە لە چیرۆکە شیعرییەکانی لەوانەیە «شێخ سەنعان» بێ ئەگەرچی لەوە کەمتریشە.

(٧)

لەم پارچە شیعرە لیریکییەدا شاعیر لەگەڵ قاز و قولێنگ دەدوێ، قولێنگ لە ئاسمان، شاعیر لەسەر زەوی، فەقێ تەیران وەک هەموو ئادەمزادێک خۆزگە بەباڵندە دەبا، ئازاد و سەربەستە، بێ جێ و مەکانە، ئاگاداری هەموو ڕووداو و هەواڵێکە، زۆر شت دەزانێ، دەیەوێ فێری هەموو شتێکی بکا.

هەی قولینگۆ خوە نەوەستینە
پەڕ و باسکان هەر هلینە
هەرە ژ تەبیبەتێ گلیا بینە
ئیرۆ ل سەر ڕێیان ئەز ڕەویمە

***

تو ل هەوا خوەش جەبار بە
سەر گاز و گێد بلند خوار بە

هەما ژ دەردێ من هشیار بە
هەی مال خراب تو گۆداری کە
پەڕ و باسکان ل سەرمن سی کە
من ژ دگەل خوە ڕێوی کە
چەند گلییان ل من سافی کە

***

مال خراب بکە ل من قیرین
دل و جەگەرا من تەڤ بوارین
ئەزم ئیرۆ بێ سەودا سەرین
گەلەک ڕەفێد ل من دا بهرین

***

هەی قولینگۆ تو دفری ل دنیایێ
هەرە جها بێ بدە عەینەلایێ
بێژە فەقێ تەیران نها نایێ

دوا ئارەزووی شاعیر ئەوەیە، بەقولّینگ دەلّێ: تۆ لە هەموو جێییێک هەی، هەر جێییێکی بچی کردگاری لێیە، بەهەموو کەس بلّێ فەقێ تەیران جارێ نایە!

(٨)

لەم بڕە غەزەلە کورتەدا فەقێ تەیران موناجات لەگەلّ ڕۆژدا دەکا، لە بنجدا بەئەلفوبێی لاتینی بلاّویان کردۆتەوە بەناوی «فەقێ تەیران و ڕۆژ» لە چاپیان داوە.

شاعیر لەم شیعرە لیریکییەدا هەرچەندە باس لە ڕاستییێکی فیزیکی دەکا لەبارەی گرنگی ڕۆژەوە لە ژیاندا، واتە ژیانی مرۆڤ و سروشت (ئاژەلّ و ڕووەک) بەبێ ڕۆژ هەلّ ناکا. بەلاّم هەناسەیێکی جوانکاری داوەتێ بەجۆرێک بۆمان بکرێ ئەم شیعرە وەک هۆنراوەییێکی پەروەردەیی (دیداکتیکی) بخەینە ڕوو.

ڕۆژهەلات و ئاڤا بوو
عەرش و ئاسمان جێکی ڕاوەستابوو
دنیا ب تەبیعەتێ شین و ئاوابوو

***

هەی ڕۆژا سۆر ب ڕەنگێ خوەڤا



بێ تە هێشین نابە گول و گیها

***

تەنێن ب ڕێوی قەت ڕێ نابەت
تو ڕۆژەکە ئامن و تاقەت
بێ تە ناژین ئینسان و مەخلووقەت
ب تە دبن هەر گاڤ فرقەت

***

تو بلندی هەر گاڤ پەروازێ
عەرد ژ تە هەر گاڤ دزێ

***

تو مینا پێلێت ئاگر ل ئاسمان
گەرمی ددی دەشت و زۆزان
تو گەرم د کی سەر و بنە
تەڤا و ڕەوور ب تە دبن قەنج

ئەم شیعرە وەک تەعریفێکی زانستگاییانە بۆ «ڕۆژ» بەهۆنراوە دەکەوێتە بەرچاو.

(٩)

ئەم بەرهەمە شیعرییەی فەقێ تەیران لە ٣٣ چوارین پێک هاتووە، واتە ١٣٢ نیوە دێڕە شیعر، دەتوانین زاراوەی «قەسیدە»ی عەرەبی بۆ بەکاربێنین، ئەمە لەلاییێک لەلاییێکی دیکەوە قەوارەی گەورەیی شیعرەکە بە ژمارەی دێڕی شیعری بۆ چیرۆکی شیعری (ئیپیک) بەکاردەهێنرێ، بەتایبەتی فەقێ تەیران ناچار بووە پێڕەوی ئەمە بکا لە چیرۆکە شیعرییەکانیدا، بەلاّم لێرەدا دەبینین درێژەی بەشیعرە لیریکییەکەی داوە بەبێ ئەوەی جێگە و کات و بزووتنەوە و قارەمانی تێدا بێ بەو شێوەیەی چیرۆکی شیعری گەرەکییەتی. ئەم جۆرە شیعرە لە ئەدەبی کوردیدا لە «قەسیدە»ی عەرەبی و «پۆێم»ی ئەوروپاییەوە نزیکە. با گەشتێک لەم گێتییە جوانەی فەقێ تەیراندا بکەین. شاعیر دەلّێ:

ئیرۆ ژ دەست حوسنا حەبیب
سەرکەشتە وو حەیرانم ئەز
من عەشق و موحەبەت بوون نەسیب
سەوادێ سەرگەردانم ئەز
عەشقێ گەلەک سەوداکرم

بێ مال و بێ مەئوا کرم
نوورا چرا وندا کرم
مووسایێ عیمرانم ئەز

مووسا ژ دەست حوسنا ب نوور
شیرینی یا خاڵێن د هوور
سەجدە برە بەر کۆهێ توور
نێزیکی ڕەمزێ وانم ئەز

ڕەمزێ کو دێ دلبەر بکن
جارەک ب چەشمان سەیر بکن
دێ کۆهی قاف کەرکەر بکن
مەجرووحێ پڕ کۆڤانم ئەز

ئاه ژ دەست کۆڤان و قەهران
من سەبر نایێت ل سەحران
شوبهەتێ مەوجێن د بەحران
قلزم و عوممانم ئەز

قلزم و بەحرێن د هەفتێ
ئاگرێ عشقێ کو کەفتێ
دێ دسۆژیت شوبهێ نەفتێ
من دییە پێ زانم ئەز

موناجاتێکە فەقێ تەیران لەگەڵ دلبەری دڵداری حەقیقی دەیکا، بەڵام نەک بەرەوڕوو بەڵکو وەکو کەسی سێیەم ناوی دەبا. جوانی خۆشەویست سووتاندوویەتی وەکو جوانی نووری کردگار چۆن مووسای عیمرانی سووتاندووە لەسەر کێوی توور (سینا = حۆریب) و خاکەکەی کردووە بەکل و چاوی جوانانی پێ دەڕێژرێ. گەرمایی و سارای بیابان شاعیر بێزار دەکا، پەنا دەباتە بەر زەریا، ڕوو دەکاتە زەریاکانی قلزم (زەریای سوور) و زەریای عومان، شوێنی ئیلهامی شاعیرانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەمانە «عومان»ی پێدەڵێن کەچی عەرەب بە«عومان» ناوی دەبا.

من دییە موحبەت چ ڕەنگە
سۆهتمە دۆژا پرینگە
من مودام دل ژێ بەهنگە



ب نالین و ئەفغانم ئەز

نالینا تەیر و تویووران
کالینا چەنگ و بلووران
غولغولێن د قەسر و قوسووران
بلبلێ خۆش خانم ئەز

بلبلم داییم دخوینم
ئەز یەقین ئەز تە نەبینم
دین دبم سەودا دمینم
سەرخۆش و سەکرانم ئەز

سەرخۆش و ئەبتەر کرم تە
ژ عیللەتان ڕەنگ زەرکرم تە
سۆتم و کەرکەر کرم تە
تو ئاگر و بوریانم ئەز

ئاگر و پێتا د دل دا
مەعنەیان داغان کو هلدا
ئەو کیتاب ناچیت دوو جلدا
حافزێ مەدحانم ئەز

حافزێ مەدح و پەسەندان
ڕۆهینا مەحبووب و ڕەندان
بێ حیساب وەربوون د فندان
سۆتی یێ بێ جانم ئەز

سۆتمە قەت قەت و نارن
کوشتمە زەرب لێ دیارن
من دەمەک سەبر و قەرارن
نەخۆشێ پڕ ژانم ئەز

نەخۆشێ ڕەنگ لێ نەمایی
دەست ل سەر فالی نیهایی
وان دگۆت ژ چاڤان کەهایی

کوشتی یێ عەینانم ئەز

کوشتمە هەردوو عویوونان
یان کی یێد نیسبەت ژ نوونان
رادکەت ئەو قەتل و خوونان

گرتی یێ زیندانم ئەز

فەقێ تەیران لەم شیعرە و لەگەڵێ بەرهەمە ئەدەبییەکانی تریدا خەریکی باڵندانە. جریوە و جووکە و ئاوازیان تەسبیحات و تەهلیلەیە بۆ توانا و گەورەیی کردگار. شاعیر لە حاڵەتی ئاسایی مرۆڤ دەچێتە دەرەوە و سەرخۆش دەبێ، ئینجا ڕووبەڕووی نەخۆشی دەبێتەوە، سەرەڕای ئەم هەموو ئەشکەنجە و ئازارە، بەندکراوی بەندیخانەی عەشق دەبێ.

گرتیمە ئینساف ل میرن
قازی یو موفتی ڤە بیرن
قەید کرم کەس بێ خەبیرن

بەندەیێ هیجرانم ئەز

ما د بەندا فیرقەتا تە
جان فیدایێ خدمەتا تە
دا ببینم، ڕەحمەتا تە

نۆبەدارێ خانم ئەز

نۆ بەدارێ قوللەهێ خوە
دەرگەڤانێ دەرگەهێ خوە
بینە بیر و ئاگەهی خوە

توولەیێ ئاستانم ئەز

توولەیێ دەرگاهێ یارم
شەڤ و ڕۆژان نۆبەدارم
وەستایێ دەر ئینتیزارم

چاڤرێیێ سوڵتانم ئەز

چاڤرێیێ سڕا ل پێشم
مەقسەدا ئەز لێ ڤەنیشم
هیجرەتا یووسف دکێشم



یەعقووبی کەنعانم ئەز

کۆرە بوو یەعقووب ژ دینێ
ژ پەردەیا داغا ئەڤینێ
گەر دبێن ڤەکە برینێ

حەوجەیێ لوقمانم ئەز

وان دگۆت لوقمان تەبیبە
گۆتە من خەف عەندەلیبە
شافی یێ دەردان حەبیبە

بێ باوەڕ و ئیمانم ئەز

سوند دخۆم ساعیدو دەستان
کەڤر و سەیلێت ل بەستان
من ب خۆ ل جورحان ب بەستان

بێ ڕاحەت و ئاسانم ئەز

عاشقان راحەت یا کێمە
ئاگر و پێتا دلێ مە
چەند هەزار مەدحان دبێمە

موحیتێ ئاسمانم ئەز

لەم پارچە شیعرانەدا شاعیر بچووکە وەک لەشێکی ئادەمزاد، خۆی دەکا بەدیل و کۆیلە و پێش خزمەت، بەڵام گیان و دەروون لە پایەی پێغەمبەرانە، «دووری یووسف» و «ئازاری یەعقووب» دەچێژێ.

خۆزی من سەد سەر هەبوونا
سەد هەزار دەڤ پێڤەبوونا
ئەو هەموو ل مەدحێن تە بوونا

هێژ ب وان نوقسانم ئەز

ئەز کز و زەر بووم ژ قەهرێ
دێ دەڤک چ بکەت ژ بەحرێ
یان دووچاڤ چ بکن ژ سەحرێ

بێ دیتنا عەینانم ئەز

سەد هەزار چاڤ من دڤێنا

بایەکی پەردە هلێنا
خەت و خال من تێر بدینا
عەشقە قووتێ جانم ئەز

هەر کەسێ عشق تێ ئەسەر کت
سەد هەزار پەردان ل بەر کت
هەمووی‌یان دێ کەر ب کەر کت
تازی یوو عوریانم ئەز

پەردە چوو ئەز مامە تازی
دل سەرا مەحبووب دخازی
من عیبادەت عشق و بازی
بێ مەیوو مەیخانم ئەز

خانی یا بادەوو مەی تێ
موغنی یوو هەم چەنگ و نەی تێ
من ژ عشقان هەیە هەی تێ
سەرخوەش و سەکرانم ئەز

شاعیر ئاواتەخواز بوو سەد سەری هەبوایە، هەر سەری هەزار دەمی بوایە، هەمووی بۆ پێداهەڵدانی دلبەر بەکار بهێنایە، هێشتا نەیدەتوانی وێنەی جوانی خۆشەویست بکێشێ.

فەقێ تەیران بەم چوارینانە دوایی بە شیعرە لیریکییە بەرز و جوانەکەی دێنێ:

سەرخوەشی ئاڤا حەیاتێ
مەجلیسا ڕەقس و سەماتێ
دی چ کەم ب سەوم و سەلاتێ
ب کووزە وو فینجانم ئەز

ئەو مەیێ گەردەن درێژان
شیشە وو وان بادە ڕێژان
من نەما هش ل نڤێژان
ل دەفتەرا دینانم ئەز

(میم و حێ) عەقل ڤەدەردا
سجلەیا عشقێ و دەردا



لەو قەلەم ئانی ب سەردا
مەعفوویێ غوفرانم ئەز

(١٠)

لەم غەزەلە پڕ لە سۆزەدا فەقێ تەیران ئەوەی ناو دڵی دێنێتە سەر زمانی، ئەو جوانە یا ئەو نیگارانەی دەیانپەرستێ لەگەڵ سروشت تێکەڵیان دەکا، ئینجا هەوڵ دەدا خۆشی ببێ بە بەشێک لە سروشت. لەو کاتەشدا گومانی لەوەدا هەیە ئەو جوانانە لە دەردی دڵی بگەن:

ئەز چ بێژم چ بەیان کم
مەخفیا تە ئەز عەیان کم
سرڕی دلی ئاشکەراکم
کەس ب حالێ من نەزان

چەندی بێژم سرڕ و حالان
ئاه ژ دەستێ چاڤ غەزەلان
هەر دنالم ماه و سالان
کەس ب حالێ من نەزان

ماه و سالان ئەز دنالم
شەڤ و ڕۆژ تالیب ویسالم
عاشقێ بەژنا شەپالم
کەس ب حالێ من نەزان

عاشقێ بەژنا لەتیفم
خەستە حالم پڕ زەعیفم
موبتەلا قامەت ئەلیفم
کەس ب حالێ من نەزان

موبتەلا قامەت فەنانە
ژ یار و دۆستان جودامە
عاشقێ نوورا خودامە
کەس ب حالێ من نەزان

عاشقێ سێڤ و بهامە
ژ بۆ جەمالا مبتەلامە

گــەر ببــینم جــان فــیــدامــە
کـــــەس ب حـــــالـێ من نـەزان
ئەو باغێ سـۆر گـول د نیـڤـێـدا
یار و مـەحـبـووب مـەشـیـان تێـدا
خـــوەشـــە ژی کـــەیفـــا دنێ دا
کـــــەس ب حـــــالـێ من نـەزان
ئەو مـەحـبـووبا وەکـو سـتـێـرا
تەعـــەســـیـــرا کـــچـــا مـــێـــرا
تە حـــەلاندی (فـــەقێ تێـــرا)
کـــــەس ب حـــــالـێ من نـەزان

فـەقێ تەیران ئەم غـەزەلەی لەسـەر بنچـینەی چوارین داناوە، نیـوە دێڕی چوارم لە هەمـوو بەندەکـاندا دووبارە دەبێـتـەوە، لە سێ نیـوە دێڕە بەندەکـاندا لـەلاییێک ئەوە دەردەخـا ئەوەی نـاو دەروونی گـەلێک قـورسـە، لەلاییێکی دیکە باس لە جـوانی خـۆشـەویست و سـروشت دەکـا، ئەو سـروشـتـەی بەجـوانی خۆشەویست جوانتر بووە، بەڵام هەموو ئەوانەی باسی لێوە دەکا ویست و ئارەزووە و ئەو لێیـان بەدوورە، بۆیە حاڵی خراپە و کەس پێی نازانێ.

سێبەر و تارمایی ئەم شیعرە لە غەزەلێکی میهرەبان خاتوونی کچە شاعیری کوردی سەدەی نۆزدەم دەجووڵێتەوە، شیعرەکەی میهرەبان زیاتر دەچێتەوە سەر کێشی عەرووز. لە بەرگەکانی داهاتووی ئەم «مێژووی ئەدەبی کوردی»یە باسی لێوە دەکرێ.

***

فەقێ تەیران گەورەترین شاعیرێکی کوردی کوردستانی سەرووە لە دروستکردن و پەیداکردنی شیعری کوردی، بەشدارییێکی زۆری کردووە لە دانانی بەردی بناغە و پەرەسەندن و بۆ پێشـەوەچوونی شـیعـری کوردی. بەرهەمی شـیعـری شـاعیـر نموونەی بەرزی ئەدەبی نەتەوەکـانی ڕۆژهەڵاتە، لە ڕووی ناوەرۆکەوە خەریکی دڵداری و کۆمەڵایەتی و دانایی و فەلسەفە و سۆفیزم و گەلێ لایەنی دیکەی ژیانی ئادەمزادە، لە ڕووی ڕوخساریشەوە کێش و قافیە و ڕیتمی میللی و زمانی ساکار و ڕستەی ئاسانی بەکارهێناوە و شێوەییێکی ڕەسەنی داوەتە شیعرەکانی.

## بەشی دوازدەم

# مەلای جزیری

**١٥٦٧ - ١٦٤٠**

گـــــولّی باغێ ئرەمێ بوهتـــــــانم
شـــەبچـــراغێ شـــەبێ کـــوردســـتـــانم

### بەسەرهات

مـەلای جزیری یەکێکە لە بەناوبانگترین شاعیری کوردستانی سەروو. ناوی ئەحمەدە، ناوی باوکی محەمەد بووە، لە بنەماڵەی «ئەنسارییان» بووە کە یەکێکە لە بنەماڵە دیار و ناودارەکانی جزیری بۆتان. لە شاری جزیرە لەدایک بووە. ڕاستترین بۆچوون لەبارەی سەردەمی ژیانی مەلای جزیرییەوە ئەوەیە کە مەلا ئەحمەدی زڤنگی نێوان سەدەی دەیەم و یازدەمی هیجری (سەدەی شازدەم و حەڤدەمی مەسیحی) دەستنیشان کردووە.

لە ئەدەبیاتی جوگرافیدا دوو زاراوە لە بابەت «جزیرە» و «بۆتان»ەوە بەکاردەهێنرێن، یەکەمیان «جزیری بۆتان» و دووەمیان «جزیر و بۆتان». ئەوەی ئاشکرایە زاراوەی «جزیرە» بۆ ناوی شارەکە بەکاردەهێنرێ و «بۆتان»یش بۆ ناوی ناوچەکە بەکاردەهێنرێ، بەم پێیە «جزیری بۆتان» ئەوە دەگەیەنێ ئەو شارەی ناوی «جزیرە»یە سەر بەناوچەی بۆتانە، هەرچی «جزیر و بۆتان»یشە ناوهێنانی شار و ناوچەکەیە بەدوای یەکەوە. جگە لەمە زاراوەی «جزیرە» ناوچە گشتییەکەش دەگرێتەوە کە بریتییە لە ناوچەکانی کوردستانی تورکیا کە شاری جزیرە پایتەختییەتی هەروەها خاکی کوردەواری هەموو سوریا و ناوچەی زاخۆ لە کوردستانی عێراقدا.

مەلای جزیری لە ساڵی ٩٧٥ھ/١٥٦٧م لەدایک بووە. زانیارییەکی ئەوتۆ لە ناوەوە نییە لەبارەی پەروەردە و خوێندنی سەرەتایی، بەڵام بەمەزندە و ئەو گێڕانەوانەی لەبەردەست دایە لەبابەت ژیانی خوێندەواری لە سەدەکانی شازدەم و حەڤدەم لە کوردستاندا دەتوانین بڵێین مەلای جزیری لە حوجرەی مزگەوت دەستی بەخوێندنی قورئان کردووە، گۆیا ئەمە لەلای باوکی بووە، چونکە ئەویش مەلایێکی ناودار بووە. لە پاشانا زانستییە ئیسلامییەکان و ئەوانەی پێوەندییان بەزمانی عەرەبییەوە هەیە بەرێکوپێکی و بەسەرکەوتوویی شارەزایان بووە وەک لە بەرهەمە شیعرییەکانیدا دەردەکەوێ.

هەندێ لە سەردەمی فەقێیەتی لە چەند شوێنێکی وڵاتی کوردەواری بردۆتە سەر بەمەستی خوێندن، لە ئامێدی و جۆلەمێرگ و ئامەد (دیاربەکر) ژیاوە. ڕۆژگارێکی درێژ لە گوندی ستریاس لە نزیک دیاربەکر ژیاوە و کۆتایی بەخوێندنی مەدرەسەی حوجرە هێناوە و ئیجازەی دوازدە عیلمی مەلایی لەسەر دەستی مەلا تەها ناوێک وەرگرتووە.



لە دوای ئیجازە وەرگرتن کراوە بەمەلای گوندی سربال لە ناوچەی دیاربەکر، لە پاشانا ڕووی کردۆتە حەسەنکێف و لەوێ بووە بەمەلا، وانەی زانستییە ئیسلامیەکان و زمانی عەرەبی وتۆتەوە، هەروەها ئیجازەی مەلایەتیشی داوە بەفەقێیان، ئینجا گەڕاوەتەوە وڵاتی خۆی و لە جزیری بۆتان زیندەگانی کردووە تا گەیشتۆتە سەرووی تەمەنی حەفتا ساڵی و لە ١٠٥٠ھ/١٦٤٠م کۆچی دوایی کردووە.

هەندێ ئیسگە لە ژیانی ڕۆشنبیری مەلای جزیری ڕوون و ئاشکرایە، ئەمانە ڕاستی سەردەمی ژیان و هەندێ لایەنی بەرهەمەکانی ڕوون دەکەنەوە، وەکو:

١- شیعرێکی لە تەمەنی چل ساڵیدا وتووە (١٠١٥ھ/١٦٠٦م).

٢- شیعرێکی دیکەی لە تەمەنی سی ساڵیدا وتووە (١٠٠٥ھ/١٥٩٦).

٣- لە ڕۆژی سێ شەممەی ١ی موحەررەمی ١٠٤١ی هیجری بەرامبەر بە(٢٩ی تەمووزی ١٦٣١ مەسیحی) جزیری کۆتایی بەنووسینی دیوانی خۆی هێناوە، ئەو کاتە تەمەنی ٦٦ ساڵان بووە.

٤- لە ساڵی ١٠٣١ھ/١٦٢١م لە جزیرە لەگەڵ فەقێ تەیران دیالۆجێکی شیعری داناوە.

هیچ سەرچاوەیێک لەبەردەستدا نییە دیاری ئەوە بکا مەلای جزیری ژنی هێنابێ. ئارامگای لە شاری جزیرەیە لەژێر زەوییێکە لە مەدرەسەی سۆر و بووە بەجێ زیارەتگا و نەزرگای خەڵکی ئەو ناوە. مەدرەسەی سۆر گەورەترینی ئەو نۆ مەدرەسەیە بووە کە لەو سەردەمەدا لە مزگەوتە بەناوبانگەکانی ئەو شارەدا بوون.

وەک لە شیعری مەلای جزیری دەردەکەوێ نازناوی شیعری «مەلا یا مەلێ» بووە، بەڵام نازناوی «نیشانی»شی بەکارهێناوە. هەندێ جار ناوی ڕاستی خۆی کە «ئەحمەد»ە لە هەندێ شیعریدا هاتووە.

### دیوانی مەلای جزیری

لە ڕۆژگاری ژیانی ئەم شاعیرەوە دەسنووسی دیوانی کەوتۆتە ناوەوە لە کوردستانی سەروودا، تا ئێستاش ناو بە ناو دەسنووسی تازەی دیوانی شاعیر دەدۆزرێتەوە، دەتوانین بڵێین دەسنووسی دیوانی مەلای جزیری لە دەسنووسی بەرهەمی هەموو شاعیرانی ئەو ناوچانە زیاترە، یەکێ لەو دەسنووسە نایابانە ئەوەیە کە کوردناسی ئەڵمانی مارتن هارتمان لە ساڵی ١٩٠٤ لە بەرلین بەرێگەی لیتۆگراف بڵاوی کردۆتەوە، واتە ڕۆژهەڵاتناس وێنەی فۆتۆگرافی لاپەڕەکانی دەسنووسەکەی گرتووە وەک خۆی دانەی ئامادە کردووە بۆ نامەخانە و زاناکانی ڕۆژهەڵاتناسی لە ئەوروپا، هەروەها پێشەکییێکی بەئەڵمانی بۆ کارەکەی نووسیوە. ئەم دانەیە یەکێکە لە دەسنووسە چاکەکانی دیوانی مەلای جزیری.

جگە لەمە هەندێ دەسنووسی دیکە تا ئێستا پارێزراون و نرخی تایبەتی خۆیان هەیە هی وەکو:

١- دەسنووسی شاعیری بادینی، میری ئامێدی، محەمەد تەیاری کوڕی ئیسماعیل پاشا لە ساڵی (١٢٣١ھ/١٨١٥م) ڕوونووس کراوە و لە نامەخانەی مەلا تەهای مایی پارێزراوە.

٢- دەسنووسی مەلا مستەفای یووسفی لە ساڵی (١٣٥٧ھ/١٩٣٧م) ڕوونووس کراوە و لە نامەخانەی مەلا مەحموودی یووسفی پارێزراوە.

٣- دەسنووسێک ناوی نووسەری لەسەر نەنووسراوە لە ساڵی ١٣٥٧ھ/١٩٣٧م) ڕوونووس کراوە،

ئەوەی تێدایە خاوەنی دەسنووسەکە عومەری کوڕی ئەسعەد، ئێستا لە نامەخانەی موحسین دۆسکی پارێزراوە.

٤- دەسنووسی مەلا تەها کۆفلی لە ساڵی (١٣٦٩ھ/١٩٤٩م) ڕوونووس کراوە لەسەر دانەی شێخ تاهیری شۆشی، لەنامەخانەی موحسین ئیبراهیم دۆسکی پارێزراوە.

دیوانی چاپکراوی مەلای جزیری بەم جۆرەیە.

١- چاپی محەممەد شەفیق ئەرواسی لە ئەستەمووڵ لە ساڵی ١٩١٩ بڵاوکراوەتەوە.

٢- «العقد الجوهري في شرح ديوان الجزري»، مەلا ئەحمەدی زڤنگی بەعەرەبی لێکی داوەتەوە لە ساڵی ١٩٥٩ لە قامشلی بەچاپی گەیاندووە، چاپی دووەمی لە ساڵی ١٩٨٧ لە دیمەشق (شام) بڵاوکراوەتەوە.

٣- دیوانی مەلای جزیری تێکستی زڤنگی بەبێ لێکدانەوە بەڕێگەی ئۆفسیت لە (دار الكتاب العربي) لە میسر بڵاوکراوەتەوە، ساڵی چاپی دیاری نەکراوە.

٤- گیوی موکریانی لە ساڵی ١٩٦٤ لە هەولێر دیوانی مەلای جزیری بەچاپ گەیاندووە.

٥- سادق بەهائەدین ئامێدی لە ساڵی ١٩٧٧ لە بەغدا دیوانەکەی بەچاپ گەیاندووە.

٦- هەژار تێکست و لێکدانەوەی دیوانی جزیری لە ساڵی ١٩٨٠ لە تاران بەچاپ گەیاندووە.

٧- زەینولعابیدین زنار و م. ئەمین نارۆزی دیوانی مەلای جزیریان گواستۆتەوە سەر تیپی لاتینی و لە ساڵی ١٩٨٧ لە سوید چاپیان کردووە.

٨- زەینولعابدین زنار و فرات



**دەسنووسی مەلای جزیری نوسخەی مارتن هارتمان**



یایتلاری بۆ جاری دووەم دیوانی جزیرییان بەتیپی لاتینی لە ساڵی ١٩٩٢ لە ئەستەمووڵ بەچاپ گەیاندووە.

٩- دیوانا مەلایێ جزیری، بەراوردکردن و هەڵبژاردنی موحسین ئیبراهیم دۆسکی و پێداچوونەوە و کۆکردنەوەی ئیسماعیل تەها شاهین، لە ساڵی ٢٠٠٠ لە دهۆک چاپ کراوە. ئەم دیوانە چاکترین دیوانی مەلای جزیرییە ئەوەی تا ئێستا بڵاوکراوەتەوە.

١٠- لە ساڵانی ١٩٤١ - ١٩٤٣ کۆواری «هاوار»، لە شام، لە ژمارەکانی (٣٥-٥٨) دیوانی مەلای جزیری بەزنجیرە بڵاو کردۆتەوە.

### شیعری مەلا جزیری لە ڕووی کێش و قافیەوە

مەلای جزیری یەکەمین شاعیری کوردە سیستێمی کێشی عەرووزی و یەکێتی قافیەی شیعری کلاسیکی عەرەبی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە، سوودی لە تاقیکردنەوەی ئەدەبی فارسی و تورکی عوسمانی وەرگرتووە.

ئەگەر ئێمە لەلایەن کێشەوە سەرنجێکی ورد بدەینە دیوانی شاعیر، ئەم کێشە عەرووزییانە لە شیعرەکانیدا دەدۆزینەوە: ڕەمەل، هەزەج، ڕەجەز، بەسیت، سەریع، موزاریع، خەفیف، لەناو ئەمانەدا بەشی هەرە زۆری لەسەر کێشی ڕەمەل و هەزەج و ڕەجەز ڕێکخراون، ئەوانی دیکە لە هەر یەکەیان دوو سێ شیعری هەیە.

لەڕووی قافیەوە شاعیر زۆرترین دەنگەکانی زمانی کوردی و هەندێ لە دەنگەکانی زمانی عەرەبی بەکارهێناوە، لەم لایەنەوە مەلای جزیری یەکێکە لەو شاعیرە کلاسیکیانەی کورد کە زۆرترینی دەنگ (تیپ)ی زمانی کوردی و عەرەبی لە شیعرەکانیدا بەکارهێناوە.

گەڕانەوەیێک بۆ دیوانی شاعیر



**دەسنووسی دیوانی جزیری نوسخەی محەممەد تەییاری پاشای ئامەد (دیاربەکر) ١٢٣١ ھ - ١٨١٥ م**

دەبینین ئەم دەنگە (تیپە) کوردی و عەرەبییانە کراون بەقافیە (ا، ب، پ، ت، ث، ج، ح، خ، د، ر، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ف، ق، ک، گ، ل، م، ن، ە ـە، و، ی، ێ).

## مەلای جزیری سەرداری غەزەلی کوردییە

داهێنەری غەزەلی کێشی عەرووزی و یەکێتی قافیە لە ئەدەبی کوردیدا مەلای جزیرییە. دیوانی مەلای جزیری لە ڕووی پلە و پایەی هونەرییەوە لە دیوانی کەڵەشاعیرانی فارسی هاوچەرخی خۆی کەمتر نییە. لەم لایەنەوە مینۆرسکی کە قسەی دێتە سەر ئەوەی باس لە شیعری کلاسیکی کوردی بکا، دەڵێ: هونەری شیعر لەلای کورد گەلێ فراوانە، ئەگەر بیرمان بۆ ئەوە بڕوا بەپێی ئەو نموونە شیعرییەی لەبەردەستمان دایە بڵێین شیعری کوردی نەگەیشتۆتە شیعری نەتەوە هاوسێکانی لەبەر ئەوەیە بەتەواوی لە زمانی ئەدەبی کوردی نەکۆڵراوەتەوە. بێگومان ناشارەزایی لەبەرهەمی شیعری بەرزی مەلای جزیری بووە هۆی ئەوەی ڕووی ڕاستی شیعرەکانی نەکەوێتە بەرچاو. هەروەها مەلای جزیری وەکو کۆنترین کوردی خاوەن دیوان، ڕۆژهەڵاتناسی ئەورووپا نەیتوانیوە پسپۆڕێک بدۆزێتەوە توانای ئەوەی هەبێ دیوانی مەلای جزیری وەربگێڕێتە سەر زمانێکی ئەورووپایی، ئەگەر ئەم کارە بکرێ ڕووی ڕاستی شیعری کوردی کلاسیکی وەکو بەرهەمێکی هونەری بەرز دەکەوێتە بەرچاو.

مەلای جزیری دەورێکی گەورەی هەبوو لە دروستکردن و مشتوماڵ کردن و گۆڕانی غەزەلی کوردی، بەوەی ئادەمزادی تێکەڵ بەسروشت کردووە و پەردەییێکی سۆفیزمی زۆر تەنکی بەسەردا کێشاوە، مەرجەکانی پێویست بەباوەڕی ئایینی کۆ کردۆتەوە.

غەزەل و قەسیدەکانی شاعیر نموونەی زانایی و هۆشیارین لە هونەری شیعردا، وێنەی بەرزییان لە هەڵبژاردنی وشەی بەتین و کێشی عەرووزی پێویست و قافیەی سفت وەرگرتووە. تەم و مژی ئایینی و سۆفیزم قورسی و سەرتیییان داوەتە مانای شیعرەکان، ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی هەموو کەسێک لە مانای شیعرەکان نەگا، تەنیا بەشێک لەو کەسانەی لە پلە و ئاستی خوێندەواری و ڕۆشنبیری شاعیر بوون، واتە چینی خوێندەواری مومتازی ئەو ڕۆژگارانە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی یەکجار گەورەیان کردە سەر پەرەسەندن و گۆڕان و دیارکردنی دوارۆژی ئەدەبی کوردی وەکو سامانێکی گرنگی نەتەوەیی.

بەرزی شیعری مەلای جزیری لە ڕووی هونەرییەوە ڕاستی تیۆری «بەتەواوەتی لەدایکبوونی بەرهەمی شیعری و هونەریی» دەگەیەنی. بەو مانایەی بەرهەمی باش پێوەندی بەپلەی ڕۆشنبیری شاعیرەوە نییە، واتە شاعیر وەکو زانا نییە لە سەرەتاوە بەتاقیکردنەوە تێبپەڕێ و ڕۆژگارانی پیریەتی لووتکەی بیرکردنەوەی بێ لە زانستیدا.

غەزەل و قەسیدە لای مەلای جزیری بەزمانی کوردی بەکامڵی لەدایک بوو، ئەگەر یەکێک بڵێ مەلای جزیری دەبوو بەفارسی شیعر دروست بکا باوەڕ ناکەین خەتای کردبێ، چونکە لەو سەردەمەدا زمانی فارسی باو بوو، بەڵام مەلای جزیری لەبەر ئەوە ئەو ڕچەی شکاند، چونکە بیروباوەڕی نەتەوەیی، یا بەواتاییێکی تر «کوردایەتی» لە دوای جەنگی چالدیران (١٥١٤) بەشێوەییێکی دیکە کەوتە ناوەوە لەو کاتەی خاکی کوردەواری لە نێوان شای عەجەم و سوڵتانی عوسمانی دابەش کرا. ئەمە بووە هۆی



پەیدابوونی هەستی نەتەوەیی، لەبەر ئەوە مەلای جزیری کە شیعری کرد بەکوردی مەبەسی ئەوە بوو بڵێ کورد نەتەوەییێکە مافی ژیانی هەیە، پێویستە ئەدەب و هونەری نەتەوەیی خۆی هەبێ و ئەم ئەدەبە وەکو ئەدەبی عەرەبی و فارسی و تورکی عوسمانی بێ، چونکە ئەویش بەئایین موسڵمانە و خزمەتی ئایینەکەشی کردووە.

مەلای جزیری هەستی بەوە کردووە کە کوردە، بیری لەوە کردۆتەوە ئەو زمانەی قسەی پێ دەکا زمانی زانستی ئەو سەردەمە نەبوو، ئەوەی زانیوە کە خوێندەواری لەڕێی زمانی عەرەبییەوە وەرگرتووە چونکە زمانی ئایینی ئیسلام بووە، لەلاییێکی تریشەوە تەماشای کردووە زمانانی فارسی و تورکی عوسمانی لەگەڵ زمانی عەرەبی تاقیکردنەوەییێکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری تازەیان دروست کردووە، ئەم تاقیکردنەوەیە تەنیا ئایینی نەبووە، پێوەندی بەهەموو لایەنەکانی دیکەی ژیانەوە بووە. ئیتر لەمە گرێییێک لەناو دڵی شاعیر دروست بووە، بۆ کردنەوەی ئەم گرێیە هەوڵی داوە زمانی کوردی بخاتە ناو ئەم تاقیکردنەوەیە لە ئەدەبدا. بەم جۆرە زمانی کوردی بەشداری کردووە لەو ئەدەبەی کە ئەدەبی ئیسلامی پێ دەڵێن و لە ئەنجامی لێکدانی کولتووری هەموو نەتەوە موسڵمانەکان، ناوەڕۆکی ئەم ئەدەبە ئیسلامییە تەنیا ئایین نییە بەڵکو هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە، لەبەر ئەوە بۆ ئەوەی لەلایەنە ئیسلامییەکە جیا بکرێتەوە، ئێمە بەباشی دەزانین زاراوەی «ئیسلامەوی» بۆ بەکاربهێنرێ.

## چوارخشتەکییەکەی جزیری لەسەر شیعری حافز

چوارخشتەکییە ناودارەکەی مەلای جزیری «نەوایا موتریب و چەنگێ...» لەسەر غەزەلەکەی حافزی شیرازی (١٣٢٥ - ١٣٨٨م) «ألا یاأیها الساقي» هەردووکیان لە گێتی ئەدەب دەنگیان داوەتەوە، زۆرتر لە ناو کۆمەڵی ڕۆشنبیرانی کورد.

ئەمە تەواوی چوارخشتەکییەکەیە:

نەوایا موتریب و چەنگێ فەغان ئاڤێتە خەرچەنگێ
وەرە ساقی حەتا کەنگێ نەشۆیین دل ژ ڤێ ژەنگێ
حەیاتا دل مەیا باقی بنووشین دا ب موشتاقی
(ألا یا ایها الساقي أدر کأساً وناولها)

***

کو کاتیب دێمی جەدوەل کت شکەستە خەت موسەلسەل کت
ژ یەک حەرفان موفەسسەل کت کیە ڤێ موشکلێ حەل کت
دزانێ ڕوودێ عوود ئەووەل چ داڤێتن سروود ئەووەل
(کە عشق آسان نمود أول ولی أفتاد موشکلها)

***

وێ شەفەق ژ مەهرا سەعدێ شرین لەعلێ شەکەر وەعدێ

دنالم شوبهەتی ڕەعدێ عەجیب لێ ژ ڤێ جەعدێ
(کە دل را تاب هر چینش بکفری میبرد دینش
ز تاب جعد مشکینش چه خون أفتاد در دلها)

***

د ڤێ تاقێ د ڤێ خانێ مە عەیش و ئێمنی کانێ؟
کەسێ دەست دت ژ دەورانێ نهالەک ڤێ گولستانێ
(در آغوشش چه می آرد کە از دل جانش بسپارد
جرس فریاد می دارد کە بر بندید محملها)

***

ب قورئانێ ب ئایاتێ ئەگەر پیرێ خەراباتێ
ببێژت سەجدە بن لاتێ موریدێ وی دبن قاتێ
(مرید أر بی بصر نبود ز فرمانش بدر نبود
مو سالک بی خبر نبود ز راه و رسم منزلها)

***

ژ ڤێ زولمات و دەریایێ ژ مەوجان قەت خەبەر نایێ
شکەستی کەشتی یا بایێ عەجاجی وێ شەڤێ دایێ
ژ حەرفا ماه و سالێ ما نەهات در شەکلێ فالێ ما
(کجا دانند حال ماسبک باران ساحلها)

***

مە ڕا ژئەووەل چ بر خامی کشاند ئاخر ب بەد نامی
ژ ڕەنگێ سەعدی و جامی ژ شوهرەت پێ حەسێن عامی
ب دەنگ و بانگ و ئاوازێ دبێژت نەغمەیا سازی
(نهان کی ماند آن رازی کز و سازند محفلها)

***

ژ حافز قوتبێ شیرازێ (مەلا) فەهم ئەر بکی رازێ
ب ئاوازێ نەی و سازێ ببێ بەر چەرخێ پەروازێ
(تزد من حبه الصفوی به أهل الهوی نشوی
متی ماتلق من تهوی دع الدنیا وأهملها)

پارچە غەزەلێکی کورت بەزمانی عەرەبی بەناوی «ألا یا أیها الساقی...» لە مەی و مەیخانەی کۆڕی سەرخۆشانی عەشق دەدوێ دەدرێتە پاڵ یەزیدی کوڕی معاویە (٦٤٦-٦٨٣م). ئەم شیعرە بووە



بەسەرچاوە بۆ حافزی شیرازی و شیعرێکی بەفارسی هۆنیوەتەوە و هەندێ ڕستە و مانای وەکو خۆی لە شیعرە عەرەبییەکە وەرگرتووە و لە شیعرەکەی خۆیدا بەکاری هێناون. ئەوەی ئێمە ئاگاداربین مەلای جزیری یەکەمین شاعیری کوردە غەزەلەکەی حافز کاری لێ کردبێ و لەم چوار خشتەکییەدا ڕەنگی دابێتەوە. لە دوای چوار خشتەکییەکەی مەلای جزیری، گەلێ شاعیری کورد ئیلهامیان لە هەردوو بەرهەمەکەی حافز و مەلای جزیری وەرگرتووە، هەندێ تەزمینیان کردووە، هی دیکە چوار خشتەکی و پێنج خشتەکییان لێ دروست کردووە و ناوبانگیان گەیشتۆتە پلەیێک هیچ کۆڕ و گۆشەیێکی ئەدەبی کوردی نییە ئاگاداری بەسەرهاتی «ألا یاأیها الساقی» نەبێ.

گەلێ بۆچوون و لێکدانەوە لە ئەدەبی کوردی لە گۆڕێیە لە بابەت ئەم غەزەلەوە، بیروڕای پێچەوانە کەوتوونەتە ناوەوە، هەندێ کەس بۆچوونی دڵداری مەجازی و شەرابی سەرزەمینییان هەیە، هی دێکە بەچاوێکی سۆفیزم تەماشای مەسەلەکە دەکەن، بۆچوونی غەزەلەکە بەدڵدارییێکی حەقیقی و سەرخۆشییێکی لاهووتی کردگاری لێک دەدەنەوە.

**ڕەنگدانەوەی سۆفیزم لە شیعری شاعیردا**

پێش هەموو شتێک پێویستە ئێمە سنوورێک لە نێوان ئەم زاراوانە بکێشین، «سۆفیزمی کۆزمۆسی» وەک فەلسەفەیێک «سۆفیزمی ئیسلامی» وەک دیاردەیێک لە «زوهد»ەوە پەیدابووە، «دەروێشیزم» هەندێ لایەنی پراکتیکییە لە «سۆفیزمی گشتی»، ئینجا ڕێکخراوەکان، واتە تەریقەتەکان، لە دواییدا ڕەنگدانەوەی فەلسەفەی سۆفیزم لە ئەدەبدا، ئەمەیان مەبەسی بنچینەیی ئێمەیە.

لە گێتی ئەدەبی کوردیدا مەلای جزیری وەک شاعیرێکی «سۆفی» ناوبانگی دەرکردووە، دیارە ئەم بڕیارە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە بووە لە شیعری شاعیردا. ئینجا پرسیارێک لەم لایەنەوە دروست دەبێ: مەلای جزیری چی سۆفییێک بووە؟

بەلای ئێمەوە ڕەنگدانەوەی سۆفیزمی ئیسلامی لە ئەدەبی عەرەبی و فارسی و تا پلەیێکیش تورکی عوسمانی کاری گەورەی کردۆتە سەر خەملاندنی خەیاڵی ئەدەبی سۆفی لەلای مەلای جزیری، ئەدەبی سۆفیزمی فارسی بەگشتی کاری گەورە بووە، لە هەموویان زیاتر بەرهەمی شیعری جەلالەدینی ڕۆمی (١٢٠٧م-١٢٧٣م).

لەلای مەلای جزیری سۆفیزم لە خزمەت ئایین دایە، ئەم دیاردەیە ئیسلامییە و هەندێ لە سۆفیزمی کۆزمۆسی جیای دەکاتەوە. ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەین مەلای حزیری لەسەر هیچ تەریقەتێکی سۆفیزم نەبووە ئەوانەی لە کوردستاندا باو بوون، لە سەردەمی مەلای جزیری تەریقەکانی دەروێشی لە کوردستاندا وەک ڕێکخراوێک لە ناوەوە نەبوون. ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە لە دوا ساڵانی سەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەم شێخ مارفی نودێ (١٧٥٢-١٨٣٨) و شێخ خالیدی شارەزووری نەقشبەندی (١٧٧٩-١٨٣٠) پەیدا بوون، بۆ یەکەم جار یەکەمیان بەردی بناغەی ڕێکخراوی تەریقەتی قادری (شێخ عەبدولقادری گەیلانی) (١٠٧٧م-١١٦٥م) دانا و دووەمیان ڕێکخراوی تەریقەتی نەقشبەندی (شیخ بەهائەدینی نەقشبەندی) (١٣٨٩م کۆچی دوایی کردووە) دامەزراند. بەم پێیە ئەو دوو تەریقەتە وەک

ڕێکخراوێک لە ناوەوە نەبوون تا مەلای جزیری دەروێش یا سۆفیی یەکێکیان بووبێ، چونکە دەنگ هەیە مەلا نەقشبەندی بووبێ.

مەلای جزیری سەر بەتەریقەتێکی سۆفیزم بووبێ یا نەبووبێ هیچ شتێک لە مەسەلەکە ناگۆڕێ، ئەوەی گرنگ بێ ئەدەبی سۆفیزمی موسڵمانی کاری تێ کردووە و ئەدگاری بەرهەمی شیعری جەلالەدینی ڕۆمی پێیەوە دیارە و لەبەر ڕۆشنایی خەیاڵ و ئەندێشەی سۆفیزم بەرهەمێکی بەرزی بەزمانی کوردی دروست کردووە.

بۆ نموونە لە غەزەلێکیدا دەڵێ:

دل یەکە دێ عیشق یەک بت عاشقان یەک یار بەس
قیبلە دێ یەک بت قولووبان دلبەرەک دلدار بەس
من د بەندا زولفەکێ دل دا ب دەستێ پیری عیشق
لەو د عیشقێ دامە بەست ئیحرام و یەک زوننار بەس
تەرح و تەرزێ بوونە زوننار و چەلیپا یەک بەیەک
لەو م زوننار و چەلیپا یەک تنێ یەکجار بەس
هن ژ نک دێڕێ ڤەتێن قەستا کنشتێ هن دکن
نەی ژ وانم نەی ژ وانم من دەرێ خەممار بەس
گەر چ تێن ڕەقس و سەمایێ هەر سەحەر سەد نەی شەکەر
من د بەزما سوڕ شرینان ئەو شرین ڕەفتار بەس
وەھ چ والا گەوهەرن هاتن لیباسێ جسم و جان
من ژ وان حوور سرشتان ئەو پەری ڕوخسار بەس
حەوجە سیحرێ سامیری نینن کو زولفا ڕەش بکت
چەشم بەندا دلروبایان کاکولا عەییار بەس
بولبولان سەد گول د چاڤن چاڤ ل سەد گول دی دکن
من ژ باغێ گولعوزاران یەک گول و گولنار بەس
من د باغێ گولفرۆشان دی عەجەب ڕەسمەک غەریب
خار تەبعان گول ب دەست و گولپەرستان خار بەس
ئەو جەفا چوو دەر ژ حەد زولما تە بر حەتتا ب چین
ڕەحمەکێ جارەک نەکی هەی زالم ئەڤ ئازار بەس
غەرقێ دەریایێ گوناهین تشنەیێ لوتفا حەقین
ڕەحمەتێ ئامووزگار و شەفقەیێ غەففار بەس
ئەهلێ دونیایێ سەراسەر دژمنین من بن (مەلا)
پشتە مێرێ من عەلی بت حەیدەرێ کەررار بەس

ئەگەر لەناو ئەم غەزەلەدا لەوێنە و مانای داهێنان بگەڕێین لەژێر پەردەی زاراوەکانی سۆفیزمی ئیسلامی گەلێ لە مانا و وێنەکان دەدۆزینەوە بۆ یەکەمین جار لە ئەدەبی کوردیدا، مەبەس ئەوەیە بەرهەمێکی ئەدەبی کوردی بەرامبەر بەرهەمی ئەدەبی نەتەوەکانی عەرەب و فارس و تورکی عوسمانی بوەستێ لەم ڕووەوە.

هەرچەندە شاعیر لەم شیعرەدا مەبەسی لە خۆشەویستی دڵداری ئاسمانی یا حەقیقییە، بەڵام هەندێ جار ئەگەر بۆ ڕوونکردنەوەش بێ ئەو دڵدارییە لە پەیکەرێکدا دەبینێ، واتە گیان دەخاتە قاوغی مادەوە، ئەوەی مەبەسیەتی هەستی گیانییە، بەڵام دەیکاتە هەستی مەتریاڵی کە بەچاو دەبینرێ، مەبەسی شاعیر لەمەدا ئەوەیە دیاردە مادییەکە بۆ دیاردە گیانییەکە بەکاربێنێ.

شاعیر گەشتی ناوگێتیی دڵداری دەکا. دڵ کە لانەی دڵدارییە یەکێکە، دەبێ دڵداریش یەکێک بێ. دلبەر کە تاقە کەسێکی دانیشتووی ناو دڵە، تەنیا خۆیەتی، ئەویش بووە بە قیبلە.

شاعیر گیرۆدەی داوی بەند بووە، پرچی کۆت و پێوەندیەتی، حاجیان بۆ تەواف دوو پارچە پەڕۆ دەکەن بەئیحرام، بەڵام شاعیر لە قژی یار زوننارێک دروست دەکا. کەزی یار دەبێتە زوننارى کەمەری شاعیر. تەلێ داوی قژ وێنەی خاچ دروست دەکەن، زوننار و خاچ (چەلیپا) یەک شتن.

یار (کردگار) لە هەموو جێیێک هەیە. گاور دەچنە دێر و جوولەکە دەچنە کەنشتە، شاعیر دەڵێ من نە لەوانەم، نە لەمانەم، دەرگای مەیخانە قیبلەگای منە. بەلای مەلای جزیرییەوە بەڵام دڵی ئەو لای یەکێک لەو جوانانەیە. خووبان و جوانان زۆرن، ئەو گیانانەی لە قالبی لەشدا خۆیان دەنوێنن، لەناو ئەم هەموو حۆری و پەری و فرشتانەدا چاوم لەیەک یارە، لە دەرەوەی ئەو شتێکی دیکە نییە. ڕەشی زولفی ئەو یارە لە ئەنجامی سیحر و جادووی سامیری دروست نەبووە.

شاعیر بولبول بەدڵداری ڕاست دانانێ چونکە چاوی لە سەدان گوڵە، بەڵام خۆی لەناو گوڵعوزاراندا یەک گوڵی بەسە. هەر وەهای سەری سوڕماوە لەو دیمەنە غەریب و بیانییەی لەبەرچاوە. ئەو کەسانەی لە دڕک دەکەن دەسکەگوڵیان بەدەستەوەیە، کەچی ئەوانەی گوڵپەرستن بەشیان دڕکە.

مەلای جزیری ئاوڕ لە یار دەداتەوە و دەڵێ ئازاری دلبەر بێ سنوورە بۆی، هیچ نەبێ با جارێک دڵی پێی بسووتێ، چونکە لە زەریای گوناهدا خنکاوە، پێویستی بەلێبووردنی خودا هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی بەکەسێکی بەهێز دەخاتە ڕوو و دەڵێ: ئەی (مەلا) هەموو گێتی بەربەرەکانی من بکەن، باکم نییە. ئیمامی عەلی کە حەیدەری کەرارە، ئەمەم بەسە.

ئەم وشە و ڕستە جوانانەی شاعیر لە داهێنانی ئەم شیعرەدا بوون بەمایەی بەرزکردنەوەی شیعری کلاسیکی کوردی، وەک سامانێکی نەتەوەیی جێی ڕاستەقینەی کورد لەناو نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی

ناوەڕاستدا دیار دەکەن.

لە قەسیدەییێکیدا مەلای جزیری حیکایەتی دروستکردنی «گەردوون» و بەسەرهاتی «بوون» دەگێڕێتەوە، ئیلهامی لە گێڕانەوەی کتێبە پیرۆزەکانی ئایینی ئاسمانی تەورات و ئینجیل و قورئان وەرگرتووە و بەهەندێ لایەنی فەلسەفە میتافیزیکییەکەی سۆفیزم قانگی داوە و دەڵێ:

هێ د بەر (قالوا بلی)یێ بەلکو ئەڤ عالەم نەبوو
چەرخێ دەوران دەورێ گەردوون گونبەدێ مینا نەبوو
عەرش و کورسی هێژ د مەخفی بوون د کەنزا قودرەتێ
حوسنێ حەق بوو د ئیستوائێ لامیعا عیشقێ هەبوو
نەهتبوو حوکمێ سیفاتان ئەو ژ زاتێ (لم یزل)
عاشق و مەعشووق یەک بوون شەمع و هەم پەروانە بوو
حوسن و حوب زاتێ قەدیمن لێ جودا بوون ئەو ژ یەک
لێ نها ئیسمێ حودووسێ حیکمەت و تەفسیل وەبوو
یەک دزانێ سوڕشرینان بوو جەمال و حوسن و سوڕ
یەک د قەلبێ ئەهلێ دل نار و جەلال و جەزبە بوو

بەلای شاعیرەوە بنج و بناوانی هۆی دروستکردنی «گەردوون» پێوەندی بەسۆفیزمەوە هەیە، واتە مەبەس لە بوون قانوون و ڕێکخراو نییە بۆ پاراستنی «گەردوون»، بەڵکو دڵدارییە کە هەموو «شت»ێکە و لە یەک شتیشدا کۆدەبێتەوە و لە دەرەوەی ئەو شتی تر نییە.

حوسنێ حوب ئانی زوهوورێ عیشقە ئەسلێ عالەمێ
ئەسلێ ئەشیادا بزانی وان چ ئەسل و مادده بوو
عاشق و مەعشووقێ ئەلحەق هەر دوو مرئاتێ یەکن
بوو د عەینی جەمعێدا ئەسلی قەدیم ئایینە بوو
جەزبە و سەیرا سولووکێ بێ مەحەبەت نابتن
جەهدە یا بێ عیشق و حوب چەندی کو کر بێ فەیدە بوو
سالیکێن عیشقێ یەکا یەک حەوجە نینن ئەز ببێم
جامەیا پیرێ تەریقێ سەر ژنک شەهزادە بوو
ڕەنگ ڕەنگ ئەهلێ مەقاماتێ تەریقێ چوونە سەیر
هن جەلال و هن جەمال و سەرمەیان ئەڤ بادە بوو
ئێ بری عەینی بەقایێ بادەنووشێ عیشقێ بوو
ئێ بوویێ مەحوێ فەنایێ عاشیقێ بێ چارە بوو

هەرچییێکی کردگار دروستی کردبێ، نەمر نەبووە و دوایی هاتووە، هەموو دیاردەکان تواونەتەوە، ئەمە



پەروانە (پەپوولە) بێ کە بەبڵێسە سووتاوە یا عاشق و مەعشووق بێ بەتوانەوە لەناو یەکتریدا بوون بەیەک.

ئێک ژ وان پەروانە بوو سوهت و فەغانەک ژێ نەهات
ئێک ژ وان تەشبیهی گۆیینێ ب ئاه و نالە بوو
ئاوڕێن ئەسوەد عویوونان عاقلان سەودا دکن
گەزمەیا عاشق ڤ دل کەفتی ژ چەهڤێن شەهلە بوو
عاشق و مەعشووق دا واسیل ب یەک بن بێ حیجاب
مەحوو بوو (بالذات) عاشق لەو د عیشقێ پەردە بوو
لەو د عیشقێدا فەنابوو دا ببت باقی ب دۆست
عاشقێ فانی نەبوو واسیل حەتا باقی نەبوو
نوقتە وو عیلم و سەوادێ حەرف و نەقشێ عالەمی
سەر ددن مەعنایەکێ ئەسلێ سەوادێ نوقتە بوو
هەریەکە و دێ یەک بمینت ئەووەل و ئاخیر یەکە
(لاجرم) نابت دو بن ئێ دێ بمینت هەر هەبوو
هەر چ دەعوایێ د عیشقێدا (مەلێ) سابیت کری
عەینی دەعوایێ د (نفس الأمر) دیسا شەهدە بوو

شاعیر کۆمەڵێک زاراوەی تیۆریی سۆفیزمی بەکارهێناوە، نەژادی ئەم زاراوانە وشەی فەرهەنگین، سەر بەهەر زمانێک بن گرنگ نییە، چونکە بوون بەزاراوەی شیعری لە بەرهەمی شیعری سەر بەسۆفیزمی ئیسلامی.

***

لە گێتیی سۆفیزمدا مەڵبەندی بوون لە ئادەمزاددا (دڵ)ە، هەروەکو چۆن لە داناییدا مێشکە. لەبەر ئەوەیە لە داهێنانی هونەریدا دەڵێن دڵ کارەکە دەسووڕێنێ و ملکەچی هیچ جۆرە یاسا و دەستوورێک نییە. بۆ ئەم مەبەسە مەلای جزیری وشەی (دڵ)ی کردووە بەپاش قافیە، لە پێناوی ئەوەی بەئارەزووی خۆی دووبارە و سێ بارەی بکاتەوە، چونکە لەو شیعرەدا پێویستی بەوە هەیە وشەی (دڵ) زۆر بەکاربێنێ، دیارە ئەگەر بیکا بەپاش قافیە لە کێشەی ناشیرینی بەکارهێنانی زۆری وشەکە ڕزگاری دەبێ و هەناسەییێکی جوانیش دەداتە وشەی (دڵ).

لەم شیعرەدا شاعیر بەڵگە و ڕەمزەکانی سۆفیزمی ئیسلامی و پێش ئیسلام تێکەڵ بەیەکتری دەکا، زۆربەی بەڵگە کۆنەکانی پێش ئیسلامیشی لە قورئان وەرگرتووە. بەمە ئەم بڕە شیعرەی دەبێتە داهێنانی هونەری لە گێتی سۆفیزمدا، هەروەها وەسفی سۆفیزم وەکو لە مێژووی مەسەلەکە و بەسەرهاتی سۆفییە گەورەکان هاتووە دەخاتەڕوو.

له شیعرەکەیدا دەڵێ:

ئیرۆ ژ ڕەمزا دێم دوڕێ
مینەت کو من مەسروورە دل
دلبەر ب فنجانا سوڕێ
مەی دامە و و مەخموورە دل
ڕەمزەک نهێن ئاڤێتە دل
میهری ژ باتین مێهتە دل
شەهزادەیێ سوڕ ڕێهتە دل
شەهکاسەیا فەرفوورە دل
هۆستایێ عیشقێ دل هەڤۆت
سەر تا قەدەم هنگی دەسۆت
ڕەمزا (أنا الحق) هەر دەگۆت
باوەڕ بکن مەنسوورە دل
دل لێ بدت نوورا مەیێ
وەقتێ سەواش و هەی هەیێ
فەهم ئەر بکی وەحیا نەیێ
ژێ دت خەبەر مەئموور دل
نوورا ژ قودرەت لێ دو نوون
ژێرا دنالن ئەرغەنوون
وەر ئایەتا عیشقێ بخوون
خوەش نوسخەیەک مەستوورە دل
تەفسیرێ سیرڕا ئایەتێ
عارف دڤێتن گوه دەتێ
ڕازا رموزێن قودرەتێ
گەر دەین بکین مەعزوورە دل
دل کەعبەیە مەولایەلێ
ناری کەلیم ئیسایەلێ
بانگێ (أنا اللە) دایەلێ



هەم کەعبە وو هەم توورە دل
سەد جۆ و سەد جۆبارە تێ
سەد گولشەن و گولزارە تێ
چەندان ژ عیشقێ نارە تێ
سافی نەزەر دی نوورە دل
سوحبەت کو کامیل بوو برێ
جارەک ب جایی عەنبەرێ
قەلبێ مە باقێ مەجمەرێ
خوەش عەنبەر و کافوورە دل
شۆخ و شەپالا لەب ژ قەند
ئەو نازکا وێ قەنج و ڕەند
وێ دل ژ دل دلدا و خوەند
ئیرۆ یەقین فەغفوورە دل
ئەو دل ژ تە مەسروور بتن
من ژ (مەلێ) دەستوور بتن
دێ کت جەهان پور نوور بتن
لێ دائیمەن ڕەنجوورە دل

وەک چۆن لەم شیعرەدا پاش قافیە وشەی «دڵ»ە، قافیەی بنچینەیی (ر)یە، وشەکان لەسەر کێشی «مەسروور، مەخموور...»ن. لە مانادا وشەکانی قافیەی بنچینەیی بۆ مەبەسی ڕوونکردنەوەی جێگەی پاش قافیە هاتوون – واتە وشەی «دڵ» – لەلایەنی ڕەوانبێژییەوە. بەم جۆرە «دڵ» وەکو قاووغێک یا لانەییێک یا گەنجینەییێکی شارراوە جێی هەموو شتێکی لێ دەبێتەوە، زۆر جار ئەو شتانە بەپێچەوانەی یەکتریش دەبن.

لەلای مەلای جزیری لەناو «دڵ»دا گەلێ دیاردە دەبینرێ وەکو: خۆشی و سەرخۆشی و زۆرداری و فەرمانڕەوایی و کوشتن و لێ خۆش بوون و گەلێ شتی تریش. ئەمە وەک ئاژاوە و بێ سەروبەرییێک دەکەوێتە بەرچاو، بەڵام لە ڕاستیدا بەڵگەی ئازادی و سەربەستییە، ڕەمزی گۆڕان و بزووتنەوەیە، چونکە بەڕێگەی قانوونی هەمیشەیی نەگۆڕاوی دەست لێ نەدراو ڕاستی (حەقیقەت) نادۆزێتەوە.

مەنسووڕی هەلاج بەشوێن کردگار (مامۆستای عیشق) دەگەڕا لەبەر ئەوە لەناویان برد. بەڵام شاعیری ئێمەی کورد پەنا بۆ کێوی توورِ (حۆریب) و کەعبە دەبا لە یەکەمیاندا خودا لەگەڵ حەزرەتی مووسا قسەی دەکرد و لە دووەمیاندا ماڵی خۆی بوو لە کۆنی کۆنەوە تا دەوری موسوڵمانەتی ئەمانەش کەعبەیان

هەر بەماڵی خوا بەخەڵکی ناساند.

***

لە پارچە شیعرێکیدا مەلای جزیری دەڵێ:

ژ مابەینا دو ئەبرۆیان دبینم قابە قەوسەینێ
(تعالی الله) بنێ ڕەمزێ چ ڕەنگ ئاڤێتە مابەینێ
بنێ نوونێن ل سەر (صادان) کو کاتیب گۆشە لێ بادان
سەراسەر قاف تا قافە رومووزا (حکمة العین)ێ
بە قا نینن ل بۆ تشتێ حەتا کەنگێ بکین پشتی
د عیشقا وان پەری ڕوویان وەرن دونیایێ دادەینێ
ب بەرقا شیر و ئەڵماسان ب تیرێژێن د شەهکاسان
سەراسەر ئەهلێ دونیایێ د سۆژێ (طرفە العین)ێ
(مەلا) (باللە) دڤێ دەورێ ب ڤێ ڕەنگێ ب ڤێ تەورێ
نیشان دا وەک نیشانی کەس دەرانین دورِ ژ بەحرەینێ

شاعیر لەم پارچە شیعرەدا هەندێ زاراوەی سۆفیزم و قالبی شیعری ڕەمزی (سیمبۆلی) بەکار هێناوە بۆ دروستکردنی وێنەکانی. بەڵام ئەوەی گرنگ و سەرنج ڕاکێشەر بێ لەم ماوەیەدا ئەوەیە شاعیر پەنا دەباتە بەر وێنەی تیپی ئەلفوبێی نووسین لە ڕووی ئەندازیارییەوە وەکو ئەوەی هەندێ ئەندامی «یار» بەوێنەی ئەو تیپانە دەچوێنێ. بۆ بەڵگە تیپەکانی «ن» و «ص» و «ق»ی بەکارهێناوە، لێرەدا «نوون» و «صاد» بۆ چاو و برۆ کارێکی بەجێ و شیاوەیە، هەرچی تیپی «قاف»یشە ئەمەیان دیاری کردنی ئەو جێگە جوگرافییەیە کە پێ دەڵێن، لە ئەفسانەی ڕۆژهەڵاتدا بۆ کیشوەر و کۆنتینێت و شاخ بەکارهاتووە، دوور نییە مەبەس شاخەکانی قەفقاس بێ بەتایبەتی ئەلبورز.

ئەم کارەی شاعیری ئێمە واتە بەکارهێنانی تیپەکانی ئەلفوبێ لە ڕووی وێنەی ئەندازیارییەوە، جیاوازە لەگەڵ بۆچوونی تەریقەتی حورووفییەکانی سۆفیزمی ئیسلامی چونکە ئەمانە مامەڵە لەگەڵ تیپەکانی ئەلفوبێ دەکەن لە ڕووی نرخی ژمارە و وەکو ڕەمزێک بۆ هەندێ نهێنیی گێتیی سۆفیزم.

***

لە پارچە شیعرێکی کورتیدا مەلای جزیری هەندێ دیاردەی هەست پێکراوی سروشت بەکار دەهێنێ بۆ ئەوەی لەگەڵ چەند ئەندامێکی «یار» بەراوردیان بکا. هەروەها شەعائیرەکانی نوێژ و حەجی ئیسلامی لە قاڵبی خۆیان دەریان دێنێ و بەشێوەیێکی دیکە دەیانگەیەنەتە ئەنجام:

دەرێ مەیخانەیا عیشقێ سەحەر عارف زیارەت کر
ب ئابێ چەشم و خوونێ دل ووزوو بەست و تەهارەت کر



وەرین جاما هیلالی دا ژ عەکسێ ماهێ نەوبینی
کۆ خانێ میهر و جەرگێ چەرخ و خوانی رووزەه غارەت کر
ب میزان قەوسێ ماهێ نەو ب وەجهێ دلبەرێ من دی
ژ چەشم و گۆشەیێ ئەبروو ب دۆر جامی ئیشارەت کر
ب ئەبساران نەزەر من چوو ژ چەرخێ قەوسێ ئەبروویان
شوکور خوازین کو چەڤان کار بەرعەینێ بەسارەت کر
ژ بەر دێمی نیقاب ئاڤێهت و دەستوورا تەوافێ دا
د سەعیێ بەیت و ئیحرامێ و من ئەسوەد زیارەت کر
د دیدارێ هەزاران جان نسارێ مەقدەمێ یارن
کەسێ جانان ب جان بینت ب عیشقێ وی تیجارەت کر
ب دینارێ دەنی زینهاردا یاری خوە تو نەفرۆشی
کەسێ یووسف فرۆتی وی د عالەمدا خەسارەت کر
تنێ ئەو سەجدە یا شوکرێ تە بت میحرابێ قەوسەینان
کو دەلق و شەمل و سوججادە ب ڤێ ئاڤێ قەسارەت کر
د بەحسێ لەعلێ لەب هەر خام نارت تەبعێ ئەلماسی
وەلێ تەئسیرێ فەیزێ میهرە تەدبیرێ حەرارەت کر
د ئیعجازا بەیانێ دا سوخەن گەر بێتە ئینسافێ
دزانت موختەسەر هەر کەس (مەلێ) سیحرێ عیبارەت کر

شاعیر هونەروەرانە گێتیی سۆفیزم و ئایینی تێکەڵ بەیەکتری دەکا. مەیخانە ڕەمزی یەکەمیانە، مزگەوت هی دووەمیانە. وەکو سۆفییێک بەیانی زوو ڕوو دەکاتە مەیخانە لە باتی ئاو بەخوێنی دڵ خۆی دەشوا و بەفرمێسک دەسنوێژ هەڵدەگرێ.

لە مەیخانەدا مەیگێڕ دەگەیەنێتە پلەی موتلەق و دەیکا بەڕەمزی کردگار. ئەو مەیگێڕە پێویستە بەڵگەی جوانی هەمیشەیی بێ. ئەو جوانییە لە برۆی کەوانی دلبەر و مانگی نوێدا دەبینێ.

شاعیر دەچێتە ناو گێتی تەماوی سۆفیزم، وەسفێکی «شیعر» بەجۆرێک دەکا دەبێتە داهێنانێکی جوانکاری کە دەڵێ: مەلا ئەو شیعرەی کە دەینووسێتەوە لە قسەی کەس ناکا، کەس نەیوتووە و کەسیش نایڵێ چونکە حەقیقەت نییە و کارێکی جادووگەرانەیە.

***

لە قەسیدەیێکی دیکەیدا مەلای جزیری هەوای داهێنانی جوانکاری گێتیی سۆفیزم تێکەڵ بەڕەمزەکانی دڵداری سەرزەمینی دەکا. خۆشەویستەکەی کچێکی شۆخ و شەنگە، بۆ خۆی قارەمانی

دڵداریی سۆفیزمە، بۆ خوێنەر نموونەی ئەو جوانییە مێینەیییەیە کە هەموو کەسێک حەزی لێ دەکا:

فەلەکا ئەتلەسێ سەرگەشتە د جاما مەحەبابە
مەوج ددت قولزومێ عیشقێ مە ل سەر دەست غورابە
دل کە مەر بەستەیێ عیشقە و ب خوە زوننار پەرستین
مەی و مەعشووقە دوعایێ مەو سەججادە قیبابە
ژ حیجابێ وەرە دەر نازک و مەستانە بمەش تو
تە جەهان زیر و زەبەر کر ب خودێ ئەڤ چ حیجابە؟
دەستێ جبریل هلاڤێت ژ بەژنا تە نیقاب
ب یەقین قافە ل ڕۆژێ وەرە دەر سینە نیقابە
مە ب ئیشرافی سوئالەک ژ لەبێ غونچە گوشا کر
گۆ ب ئیلهامێ دزانی د سوئالا مە جەوابە

لەلای شاعیر دڵداری ئەوەندە فراوانە هەموو «بوون»ی گرتۆتەوە، ئەو دڵدارییە لە جوانی یار و سەرخۆشی مەیدا دەبینێ. جوانی و سەرخۆشی وەک جەوهەرێک لە یاردا خۆیان دەنوێنن، ئەو جەوهەرە لە زەریا و فەلەکی ئەتلەس فراوانترە. زەریا لەسەر ڕووی زەوی فەلەکی ئەتلەس ئەو ئاسمانە بێ دواییییەی لە پاش ئاسمانەکان دێ و ئەستێرەی لێ نییە.

مەلای جزیری پەنجە بۆ فەلسەفەی پرتەوی (ئیشراق) دەرێژ دەکا، ئەو ڕێبازە سۆفیزمەی شێخ شەهابەدینی سوهرەوەردی (لەساڵی ١١٩١م کوژراوە) دایهێناوە بەو مانایەی زانستی ڕاست لەو ڕووناکییە هەڵدەقوڵێ کە لە ناخی دڵدا پەیدا دەبێ. لێرەدا شاعیر زاراوەی سۆفیزم بەکاردێنێ بۆ دەربڕینی ئەو هەستەی کە شیعر دروست دەکا.

لە بەشێکی دیکەی قەسیدەکەیدا دەڵێ:

کەسک و سۆران تو بنێ چەرخ ل دۆرا دو هیلالان
دو قران مانە بەرابەر شەفەقێ پەردە عیسابە
عەرعەران تا د شەپالن وەرەقان جەزبەیە ڤێرا
نێرگزان سەر د گرانن ل بە نەخشان خەم و تابە
چیچەکێن قەوس و قوزەح ڕەنگ هەزار ڕەنگ سەمایە
سونبولان گرتی خوناڤ و ل گولان تازە گولابە
مەست و هشیار هەمی کەچ کولەهن ڕەقس و سەماتێن
ئەز نزانم چ نەسەق کەیفە نزانم چ شەرابە؟

شاعیر وێنەی گیانی ناوەوەی سۆفیزم کە لە تاکە یارێکدا بەدی دەکرێ دەگوازێتەوە و وێنەی پۆلەپەری و فرشتەیێک دروست دەکا، هەموویان لە یەکتری دەکەن و بەدیمەن جوانی مەتریالی دەخەنە بەرچاو. ئیتر



هەرچی جوانێکی لە سروشتدا هەیە بەتایبەتی گوڵ و موڵ بەکار دێنێ بۆ وەسفی ئەندامە جوانەکانی ئەو کیژە پەری ئامێزە نازدارانە.

مەلای حزیری بەم دێڕە شیعرانە کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

تە دڤێ بەرق و برووسکان بڕەشینی تو نەزەر دە
تە دڤێ ڕۆژ خویا بت ژ شوباکێ تو خویا بە
تە دڤێ زیر و زەبەر کی مە دوو زولفان بدە بەر با
تە دەڤێ قەنج قیامەت ل مە ڕابت ب خوە رابە
قەسدێ سەرچەشمەیێ حەیوان حەقیقەت کە نیشانی
ب جەهانی مەبە مەغروور کو جەهان عەینێ سەرابە
سەرکەشی شیوەیێ ئەربابێ وەفا نینە ڕحێ من
نە ژ دل سوهت (مەلا) بەس ب مەلێ ڕا ب جەفابە

دووبارە شاعیر دەگەڕێتەوە لای یار و گفتوگۆی لەگەڵدا دەکا. هەندێ دیاردەی سروشت هەڵدەبژێرێ بۆ ئەوەی لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە بەراوردیان بکا لەگەڵ هەڵسوکەوت و بزووتنەوەی یار. وەکو ئەوەی نیگای دلبەر وەکو برووسک وایە. ئەگەر سەر لە پەنجەرە دەربێنی وەکو ئەوەیە خۆر هەڵبێ، یا کە هەڵسێتە سەرپێ، هەڵسانی قیامەتە.

لە دواییدا مەلای جزیری گلەیی لە یار دەکا و هەموو ئەو ئازارانە دەخاتەڕوو کە لە ئەنجامی خۆشەویستییەوە چێشتوویەتی، بەو ئازارە بەختیارە بەڵام دەڵێ با بەس بێ.

***

لە پارچە شیعرێکی دیکەیدا مەلای جزیری خودای تاک و تەنیا لە کردەوەکانی جیا ناکاتەوە، هەموو «بوون» لە کردگارەوە هاتووە و هەمووشی هەر یەکێکە، لەم لایەنەوە دەڵێ:

سیڕڕی وەحدەت ژ ئەزەل گرتییە حەتتا بەئەبەد
واحید و فەردە ب زاتێ خوە وی نینن چو عەدەد
د قیدەمدا ئەزەل و عەینی ئەبەد هەردوو یەکن
سەرمەدییەت وە دخوازت نە ئەزەل بت نە ئەبەد
فەرقە واحید ژ ئەحەد لێ د مەقامێ سەمەدی
ب حەقیقەت کو یەکن هەر دوو چ واحید چ ئەحەد
یەکە دەریا تو بزان قەنج چ مەوج و چ حەباب
د ئەسلدا کو حەمی ئاڤە چ ئاڤ و چ جەمەد
ئافتابێ ئەحەدییەت د خوەدا گرتییە کەون

نەکو عەورەک هەیە لێ گرتییە چەهڤێن مە ڕەمەد
حوسنێ زاتێ بوت و لاتان ژ جەمالا سەمەدە
ژ میسالێ سەنەمی وەه کو تەجەللایا سەمەد!

هەموو دیار و نادیارێک وێنەی کردگارە و لە کردگارەوەیە. بتپەرستان جوانی لە بتەکانیاندا دەبینن، ئەمەش لە جوانی خوداوە هاتووە، کردگار لە بتانیشدا وێنەی ئاشکرایە.

شاعیر بەم دێڕە شیعرانە کۆتایی بەپارچە شیعرەکەی دێنێ:

چ زەمان و چ مەکان و جیهاتن چ حودوود
چ مەقادیر و تەفاسیل و حیسابن چ عەدەد
چ مونافات و لوزوومن چ قیاس و چ میسال
ئەڤ چ تەولید چ تەرکیبە چ ڕووحن چ جەسەد
سەر ب عەجزێ د درت قووەتێ دەر راکەیێ ما
(رَجَعَ القَلْبُ کَلیلاً و متی قامَ قَعَدْ)
حیرەت و عەجزە سەرەنجام د بابێ نەزەرێ
(کَیْ بخالقْ نظرِ قاصرِ مخلوق رسدْ؟)
گوفتوگووی مەعریفەت چەندی (مەلا) پەیدا بکی
گەوهەرا مەعریفەتێ ناگهتێ کەس ب خیرەد

شاعیر لەم پارچە شیعرەیدا لە تەڕایی و وشکایی گۆی زەوی (ئاو و خاک) دەدوێ. کردگار لە پێشانا ئاوی داهێناوە، ئینجا خاک و لەدواییدا ئەوانی دیکەی دروست کردووە. مەلای جزیری لە سەرانسەری ئەم شیعرەدا بەشێوەییێکی ناڕاستەوخۆ و نادیار باس لە «یەکێتیی بوون» دەکا. کردگار هەر خۆی هەمیشەییە و هەرچی دروستیشی کردووە لەخۆیەوەیە و لە خۆی دەکا.

ئەم شیعرەی مەلای جزیری لە ڕووی زمانەوە وەک جۆرە مولەممەعێک خۆی دەنوێنێ، چونکە شاعیر لە داڕشتنی شیعرەکەدا مانای هەندێ نیوەدێڕی بەزمانی عەرەبی و فارسی دەربڕیوە.

***

مەلای جزیری لە قەسیدەییێکیدا ئاوڕی لە بەسەرهاتی دڵداری شێخی سەنعان داوەتەوە. ئەمە یەکێکە لەو گێڕانەوە ئەڤینییانەی ئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان داگیر کردووە، کۆنترین بەرهەمی ئەدەبی لەم ڕووەوە چیرۆکی «منطق الطیر»ی عەتتاری نیشابوورییە (١٢٢٩م کوژراوە).

لە ئەدەبی کوردی خۆشماندا چیرۆکی «شێخی سەنعان»ی فەقێ تەیران جێگەی دیار و بڵندی خۆی هەیە.

مەلای جزیری بەم جۆرە قەسیدەکەی دەست پێدەکا:

مەی نەنووشی شەیخێ سەنعانێ غەلەت



ئەو نەچوو نێڤ ئەرمەنستانێ غەلەت
میسلی مووسا وی تەجەللایا تە دی
ئێ تو دی کانێ خەتا کانێ غەلەت
وی نەدی بەژنا تە وو دایێ قیاس
حیکمەتێ لەو چوویە بورهانێ غەلەت
سەتوەتا لەیلێ یەقین مەجنوون تەپاند
وەرنە قەیس ناکەت بیابانێ غەلەت
وەک (نیشانی) نەقش و نیشانەک تە دی
ئێ کو نیشانەک تە دی کانێ غەلەت
ئەز گەهام ئاڤا حەیاتێ خەڤ ژ دل
خزر ڤا ژی چوویە حەیوانێ غەلەت

شاعیر وەک سۆفییێک لەسەر ئەو باوەڕەیە شێخی سەنعان بەهەڵە نەچووە لەو کاتەی ڕووی کردۆتە وڵاتی گاووران و بووە بەمەسیحی چونکە کردەوەی کردگاری لەو کچە مەسیحییەدا دیوە، هەر وەک چۆن مووسا لەسەر شاخی توور (حۆریب) پرتەوی خوداوەندی چاوپێکەوتووە لەو کاتەی قسەی لەگەڵدا کردووە. هەروەها هەستکردن بەدڵداری لە لەیلاوە هەڵقوڵاوە، ئەمە شەقڵی کردگاری پێوەیە لەبەر ئەوەیە قەیس شێت بووە و ناوی بە«مەجنوون» دەرچووە، بێ گومان شاعیر خۆشی یەکێکە لەو عاشقانەی نازناوی خۆی بە«نیشانی» بردووە، ئەویش وەکو مەجنوون ئەدگاری کردگاری لە لەیلا بینیوە، لەبەر ئەوە بەهەڵە نەچووە.

شاعیر درێژە بەقەسیدەکەی دەدا و دەڵێ:

پەهنیا ڤێ چەرخ و دۆلابێ دنێ
نیسبەتا دەر بابێ عیرفانی غەلەت
نوسخەیێ عالەم هەمی عینوانەکە
نوقتەیەک نابت د عینوانێ غەلەت
قولزوم و بایێن موخالیف تێ پوڕن
دا نەکەلشین دارێ سوککانێ غەلەت
دابزانی پەهلەوانی مەوویەکە
دەست نەدی (للە) میزانی غەلەت

لێرەدا مەبەسی مەلای جزیری لەوە ئاشکرا دەبێ کە دەڵێ توانای کردگار لەوەدانییە ئەوەی ئێمە بەچاو دەیبینین دروستی کردووە، بەڵکو بەتێکڕایی هەموو (بوون) دروشمێکی بچووکی توانایی کردگارە. نابێ

دەست لەکاری هەڵسووڕانی «بوون» بدەین، ئەو کەشتییەی ئامێری هەڵسووڕانی بەدەست خودایە هیچ جۆرە هەڵەییەکی تێدا نییە، وا زان مەکە دەتوانی دەسکاری بکەی.

لە دواییدا شاعیر قەسیدەکەی بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

مەشرەبێ تورکان فورات و نیل کر
تشنە لەب چوو تەرفێ عوممانێ غەلەت
پیرێ حیکمەت بێن ل ویفقا مەشرەبان
کەس نەدی مەی ڕێهتە فینجانێ غەلەت
ڕاستە یەک قانوون سەراسەر نینە تێ
خوەهری و پێچێن پەریشانی غەلەت
پاک تەبع و قووەتەک مەوزوون دڤێت
دا ژ سەنعەت دت ب ئیدمانێ غەلەت
مەردومێن چەهڤێن (مەلێ) عەکسا خوەدی
وەک (نیشانی)ما ل نیشانێ غەلەت

لێرەدا شاعیر دەڵێ تورکان، واتە یاران، جوانان ئارەزووی خواردنەوەی ئاوی شیرینی ڕووباری فوڕات و نیل دەکەن، بەڵام تینوو ناچارە ئاوی تاڵ و سوێری زەریای عوممان بخواتەوە.

دەستووری بەڕێوەبردنی گێتیی مەیخانە لەلایەن پیری مەیخانە (پیری حیکمەت، پیری موغان) بێ کەموکووڕییە، قانوون و دەستووری یەکسانییە، لەو کۆمەڵەدا هەموو خەڵک و کەسان وەک یەکن.

مەلای جزیری وەک عاشقێک لە ڕوخساردا، یا لە یاردا، یا لە ئاوێنەی جوانیدا وێنەی خۆی دەبینێ، ئیتر «نیشانی» واتە شاعیر وایزانی نیشانەی (خاڵی) سەرگۆنا بەهەڵە چووە.

***

ڕینیسانسی ئەدەبی کوردی لە دوای جەنگی چاڵدیران (١٥١٤) کە لە جزیری بۆتان سەری هەڵدا، کۆمەڵێک بابەتی تازەی هێنایە ناو ئەدەبی کوردییەوە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە، ڕوخسارەکە لە کێشی عەرووز و یەکێتیی قافیە و ڕەوانبێژی شیعری ئیسلامەوی (عەرەبی – فارسی – تورکی عوسمانی) خۆی دەنوێنی و لەناوەڕۆکیشدا مەلای جزیری دەوری باڵا و دیاری هەبوو لە داهێنانی هونەری لە ڕووی جوانکارییەوە لە چوارچێوەی گێتیی سۆفیزمی کۆزمۆسی و ئیسلامیدا و سامانێکی بەنرخی بەجێ هێشت.

## دڵداری بەشێوازی ڕۆژهەڵات

ئێمە لێرەدا کە بەپێی بابەت و ناوەرۆکی شیعر گەشتێک بەناو دیوانی مەلای جزیری دەکەین، ئەوی



ڕاستی بێ سنوورێکی دیاریکراومان نییە بۆ مەبەسی دابەشکردنی شیعرەکان بەپێی بابەت و ناوەرۆکەوە. واتە شیعری وامان دەست ناکەوێ سەرتاسەری شیعرەکە دڵداری یا وەسف یا هەر مەبەستێکی دیکە بێ. لە شیعرێکدا گەلێ بابەت کۆ دەکرێنەوە، بەڵام ئەوە هەیە دابەشکردنەکە بەو پێیە دەبێ کە مەبەسێک بەسەر مەبەسەکانی دیکەدا زاڵ دەبێ، لەبەر ئەوە دەتوانین بەگشتی شناسنامەی شیعرەکە دیاری بکەین لە پێناوی ڕوونکردنەوە بۆ شیعرخوازان و بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی.

بەڕووکەش ڕەنگدانەوەی ئەڤین و خۆشەویستی لە شیعری نەتەوەی کورد و هاوسێکانی ئێش و ئازار و بەندیخانە و قەسابخانەییێکە ئەوپەڕی دیاری نەبێ. دلبەر زۆرداره و دڵدار دەچەوسێنێتەوە، وەک دوو کەسی دوژمنی یەکتری بن دەکەونە بەرچاو، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لایەنی سۆز و جوانکاری تێدا هەیە، چونکە شاعیر دەیەوێ ئەوە بخاتە بەرچاو کە خۆشەویستییەکەی بەرامبەر بەدلبەر گەیشتۆتە ڕادەییێک گەورەییە بۆ ئەو ئەگەر خۆی بەکۆیلەی دلبەر دابنێ، بێگومان بۆ خاوەن کۆیلە مافی خۆیەتی هەرچی لە کۆیلەکەی خۆی بکا، ئیتر بەم جۆرە مەلای جزیری باس لە دەستدرێژییەکانی دلبەر دەکا:

دلبەرێ ئیرۆ سەحەر ئاڤێتە جەرگی من دو دۆخ
یەک ل سینە یەک ل دل دا لەو ژ من تێن ئاخ و ئۆخ
ئاخ و ئۆخێن من ژ دل تێن لێ ژ بەر تیرا قزل تێن
یان ژ کۆڤانێن د کول تێن ژێ دزێت هەر خوون و زۆخ
خوون ژ دل جۆ جۆڕەوان تێ وەک عەقیق و ئەرغەوان تێ
لێ ژ دەست سەلوا جوان تێ ئەوشەپالا شەنگ و شۆخ
ئەو شەپالا شۆخ و شەنگە کافرا ڕۆم و فەڕەنگە
دامە بەرجەوهەتەک خەدەنگە زالمێ کوشتم ب دۆخ

لێرەدا شاعیر باسی جەنگە چەکدارییەکە دەکا، دلبەر بەنیگای چاوی دوو تیری ئاراستەی سنگ و دڵی کردووە بۆیە ئاخ و ئۆخی لێ هەڵساوە چونکە تیرەکە خوێناوی بووە بەخوێنی دڵ، لافاوی خوێن چەند جۆگەلەییێکی دروست کردووە. ئەم کارە مایەی خۆشییە، ئێش و ئازار نییە، ئارامی دڵە چونکە سەلوا یا سەلما نیشانی لە دڵم گرتووە. سەلما و سەلوا جوانانی نادیار و بووکی شیعری دڵداری کورد و نەتەوەکانی هاوسێیانن وەکو: هیند و دەعد و لەیلا و شیرین و عەزرا و زین و ئەسلێ و هی دیکە. ئەو دلبەرە شۆخ و شەنگە، جوانە، بێ بەزەییە، باکی بەهەموو کەسی گێتیدا نییە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، ڕۆم و فەڕەنگ، ئاسیا و ئەورووپا، بۆیە بەسەرشۆڕی کوشتمی.

شاعیر بەم دێڕانە کۆتایی بەغەزەلەکەی دێنێ:

لەو هەڕفتم ئەز ژ مەیلێ شوبهەتی سەهل و سوهەیلێ
موحبەت و عیشقا د لەیلێ ئەز کرم یەکسەر پلۆخ
دەست نەهێلم ئەز ژ دینێ شوبهی فەرهاد و شرینێ

وەر ژ بەر عیشق و ئەڤینێ من درێ چت ئەڤ کلۆخ
سوحبەتا چەرخ و سەما تێ وەک (مەلا) سەد موبتەلا تێ
زەمزەم و ئاڤا حەیاتێ موشتەری سەد شەیخ و شۆخ

شاعیر لەگەڵ ئەم هەموو چەوساندنەوە و زۆرداریییەی لەگەڵیدا دەکرێ دڵی نارەنجێ بەڵکو زیاتر هۆگری ئەم یارە دەبێ و خۆی لەگەڵ فەرهادی شیرین و قەیسی لەیلا بەراورد دەکا و وا دەخاتەڕوو مەیلی بۆ سەلمای خۆی لە هی ئەوان کەمتر نییە بۆ شیرین و لەیلای خۆیان، هەروەها هەمیشە ئامادەیە ئازاری زیاتر بچێژی لە دلبەر چونکە لەسەر ڕووی زەوی لەو خۆشەویستتری نییە.

***

لە غەزەلێکی تریدا مەلای جزیری یاری لە تاییێکی ترازوو دادەنێ و هەموو «بوون»یش لە تاکەی تری دادەنێ، بەڵام بێگومان ئەو تایەی یاری تێدایە لە ئەویتر قورسترە، لە غەزەلەکەدا دەڵێ:

شەربەتا لام و بێ یان ئەز ب حەیاتێ نادم
بادەیا لەعلێ ب ئاڤا زولوماتی نادم
حوور و ویلدان و پەری جوملە جەما بن ئیرۆ
موویەکێ پێ ژ خەتێ وێ بوت ولاتێ نادم
گەر بدت دەست تەوافا پێ و دەستان بگرم
وێ مەجالێ ب وقووفا عەرەفاتێ نادم
ئەز و یار گەر شەڤەکێ هەرد و هەم ئاغووش ببین
(لَیلَةُ القَدْرَ) مە ئەو شەڤ ب بەراتێ نادم
جانێ شیرین کو ژ یار ڕا ب خودان ئەز دکرم
نە ب یارێ خوە د وەختێ سەکەراتێ نادم
نە ب قانوون کو ئیشارەت ب شیفایێ بکرت
ئەز هەلاکا خوە د عیشقێ ب نەجاتێ نادم
شەربەتا زەهری هەلاهیل کو حەبیبێ مە بدت
ب گولاب و شەکەر و قەند و نەباتێ نادم
تەلبەکر وەسل ژ دلبەر م ب عینوانێ زەکات
گۆ: تو عەبدی ب عەبدێ خوە زەکاتێ نادم
دێ ب پەیکی بکرین مات ڕەقیبی دیسا
ب ڕوخ و فیل و فەرەس ئەز شەهـ ماتێ نادم



د سەمایا سەحەرێ دەست ب کەس دی ئیرۆ
غەیری شیرین قەد و مەوزوون حەرەکاتێ نادم
هاتە دەستێ مە د ڕەقسێ و دگۆ: بل ژ (مەلێ)
دەست ب کەس دی د سەمایا کو مەلاتێ نادم

شاعیر هەموو شتێکی خۆشەویستی بە هەموو شتێکی دەرەوەی ئەو نادا، شەربەتی لێوی لە ئاوی ژیان خۆشترە، تاڵێک لە مووی لە هەموو حۆری و غیلمان و پەری بەهەشت جوانترە، ئەگەر لە حوزووری یار بم و دەستم بە دەستی بکەوێ لە لام لە ماچکردنی بەردی ڕەشی کەعبە و ڕاوەستانی چیای عەرەفات باشترە. ئەگەر شەوێک لەگەڵ یار بکەوینە لای یەک، ئەو شەوە شەوی قەدرە و من بەشەوی بەراتی نادەم. ئەگەر لە دەستی یار بادەی زەهری هەلاهیل وەربگرم، ئەمە لە گولاو و شەکر و نەبات خۆشترە. شاعیر داوای زەکاتی جوانی لە یار دەکا، خۆشەویست لە وەرامدا دەڵێ: تۆ کۆیلەی زەکاتت پێ ناشێ. ئەمە و شاعیر گەلێ وێنەی ڕەوانبێژی خستۆتە ڕوو و وەستایانە مامەڵەی لەگەڵ وشە و تەعبیر کردووە، ئەمە بۆتە ئەوەی هەستی ئادەمزاد ببزوێ و شنەبای جوانی ببەخشێتە مێشک و دڵ.

## وەسفی دلبەر و سروشت

مەلای جزیری وەک قانگدراوێک بەهەستی گیانیی ناوەوەی ئادەمزاد، بە گشتی شیعرەکانی لە بیروباوەڕێک هەڵقولاون لە سێ کوچکەی کردگار و یار و تەبیعەت دروستبوون، هەر یەکە لەمانە بوونی خۆی هەیە، هەمووشیان پێکەوە هەر تەنیا بوونێکن. لەبەر ئەوە وەسف لەلای شاعیر وەک بابەتێک پێداهەڵدانیش دەگرێتە خۆی (مەدح) و هەرسێ جەوهەرەکە دەور دەکاتەوە. ئێمە لێرەدا تەنیا بە مەبەسی ڕوون کردنەوە ئەم دابەشانە دەکەین، ئەگەر نا هەموو بابەت و ناوەڕۆکەکان یەکتری دەگرنەوە و دەچنە ناو یەکترییەوە، لەبەر ئەوەیە گێتی مەلای جزیری لەم ڕووەوە گەلێ فراوانە.

لێرەدا هەوڵ دەدەین گەشتێکی جوانکاری بەناو بەرهەمە شیعرییە بەرز و بڵندەکانی دیوانی شاعیر بکەین و ڕەنگینترین دەستەگوڵی بۆنخۆش بچنین.

لە شیعرێکیدا مەلای جزیری دەڵێ:

من دی سەحەر شاهێ مەجەر لیبسێ دبەر مەخموور بوو
ئەو دێم زەری سوڕ موشتەری یارەب پەری یا حوور بوو
حوور وەشە شیرین مەشە کاکول ڕەشە خال حەبەشە
خالێن د قەر مسکێ تەتەر نازک بەشەر کافوور بوو
نازک لەتیف گەردەن زەریف لیبسێ شەریف کەمخەو قەدیف
من دی ب وەخت ئەونیک بەخت ئیرۆ ل تەخت فەغفوور بوو
فەغفوور سوڕە سیما دوڕە هەیبەت پوڕە دل کر گوڕە

ئەو ها تە مەش من چوونە هەش دل من ژ عیشقێ فوور بوو
دل بوو کەری زایا بەری لازم هەڕی دێ ئەو زەری
من دی گەلەک ئەو سوڕمەلەک وەک مەشعەلەک پوڕ نوور بوو
دێم فەنەرە خال عەنبەرە بووماوەرە لەب شەککەرە
ئەو مەی پەرست مەشها و مەست جاما د دەست فەرفوور بوو

بەزۆری شاعیر دڵدارییە گیانییەکەی لە قاڵبی پەیکەری مەتریالی کچێکی شۆخی جواندا دەنوێنێ، لەبەر ئەوە ئەم جۆرە شیعرانەی دەبن بەو غەزەلەی کە ئێمە بە «وەسفی دلبەر» ناوی دەبەین. لێرەدا شاعیر بەهەستێکی ناسک و سۆزێکی گەرم و بیرێکی تیژ وێنەی مەتریالی لە سروشت وەردەگرێ لە پێناوی ئەوەی ئەندامە جوانەکانی لەش و لاری دلبەر لەگەڵ ئەم وێنانەدا بەراورد بکا.

مەلای جزیری بەم دێڕە شیعرانە غەزەلەکە دەگەیەنێتە ئەنجام.

پاش فورقەتێ زۆر موحبەتێ م ژ تەلعەتێ چووم حەزرەتێ
وەسلا حەبیب من بوو نەسیب مەلعوون ڕەقیب ڕەنجوور بوو
جاما زەلال خەمرا حەلال یارێ شەپال دا من ب حال
عیشقا غەدار سوهتی ستار نێڤ مەویار سەد سوور بوو
شاهێ جەڤین غەم ژێ ڕەڤین مارێ شەڤین ئیساند ئەڤین
دەرد و بەلا وێن چوون هەلا عومرەک مەلا مەهجوور بوو
پوڕ من زەجر دیتن هەجر مابوو ئەجر سوبح و فەجر
شەمامەهل بوو سەد عەمل میننەت مەدل مەسروور بوو
ئیحرام مەبەست ئەسوەد ب قەست یار هاتە مەست ئەز چوومە دەست
جوهتێ حەبەش تیر دان ب وەش حەجحجا مەخوەش مەبروور بوو
یار وەعدەدا ب لەعلێن خوەدا وەربا مەدا چین پەردەدا
د سپێدەیێ چوم وەعدەیی کو ژ بادەیێ مەخموور بوو
وێ کاکۆلێ چینێن دلێ قەلبێ (مەلێ) داڤ دانەلێ
داڤا دلان نێڤ سونبولان سەرسۆر گولان مەنقوور بوو

لەم دێڕانەدا مەلای جزیری لە وەسفی ئەندامی یارەوە دێتە سەر باسکردنی هەستی ناوەوەی خۆی بەرامبەر بەیار، پێوەندی دڵداری کە دوو دڵ کۆ دەکاتەوە، جارێک ڕاز و گلەیی، جارێک بۆنکردن و لە ئامێزکردن، جارێ دڵدار و دلبەر شاد دەبن، جارێ ڕەقیب هەناسەی خۆشی دەکێشێ.

لە ڕووی ڕوخسارەوە ئەم شیعرە جۆرە نەغمە و تەنتەنەییێکی تێدایە بەهۆی ئەو کێشە عەرووزییەی شاعیر بەکاری هێناوە. شیعرەکە لەسەر کێشی ڕەجەز (ئورجووزە)ی تەواوی هەشت جار (مستفعلن)



هۆنراوەتەوە. ئەم کێشە لە شیعری عەرەبیدا لە کێشە هەرە سووکەکانە، زیاتر بۆ شیعری پەروەردەیی (دیداکتیکی) و شیعری ڕاوشکار و گۆرانی بەکاردەهێنرێ.

کێشی (مستفعلن) بە پەنجە و بڕگە (سیلاب) دەکاتە چوار بڕگە سێیانی درێژ و یەکێکی کورت (-- ب -).

هەر دێڕە شیعرێکی قەسیدەکە بریتییە لە هەشت جار (مستفعلن) واتە هەشت ڕستەی تەواوی پڕ مانا کە بەحسێبی کێشی خۆماڵی دەکاتە ڕستەیێک لە چوار بڕگە پێکهاتووە. هەموو ڕستەکان قافیەیان وەکو یەکە:

«نازک لەتیف، گەردەن زەریف، لیبسێ شەریف، کەمخەو قەدیف». ئەم یارییە بە وشە و دروستکردنی ڕیتمێک جۆرە هارمۆنییێک دەبەخشێتە کێشی ڕەجەزەکە کە خۆی لەخۆیدا لە کێشە سووکەکانە. بەڵام ئەم یاریکردنەی شاعیر کێشەکە سووکتر دەکا. دووبارە و سێ بارەکردنەوەی ڕستە قافیەدارەکانی لەسەر کێشی (مستفعلن) شیعرەکە وەک تابلۆییێکی مۆزاییێک ئامێزی ڕەنگین خۆی دەنوێنێ دەست و پەنجەی هونەروەرێکی بەتوانا و داهێنەر ڕەنگڕێژی کردبێ.

## بڕۆی دلبەر

مەلای جزیری پارچە شیعرێک و قەسیدەییێکی تەرخان کردووە بۆ وەسفی بڕۆی یار. بڕۆ لە جوانکاری شیعری کلاسیکیدا بەچەند مەبەستێک بەکار دەهێنرێ، لەوانە بەراوردی وێنەیی. بڕۆی خۆشەویست هەندێ جار لە مانگی نوێی یەکشەو دەکا، جاری دیکە لە کەوان دەکا ئەوەی بەتیرەکەی دڵی خاوە دڵان دەسمێ. مانگ بەڵگەی نوێیی و ژیان و تازە لەدایک بوونە: تیر ڕەمزی برینداری و ئازار و لەناوچوونە. دڵدار هەمیشە دوچاری جوانییە، ئەگەر ئازاریش لە پێناوی ئەو جوانییە بکێشێ خۆشییە لەلای ئەو.

هەر بۆ ئەم مەبەستە مەلای جزیری ڕستەی «ماهی نەو» واتە (مانگی نوێ) بەکاردێنێ بەمانای بڕۆی خۆشەویست و مانگی یەک شەوە. لە دوو شیعرەکەی پێشوودا «ئەبروو» دەکاتە پاش قافیە و لە شیعری سێیەمدا «ماهێ نەو» دەکاتە پاش قافیە. ئەوەی لێرەدا پێویستە بوترێ هەر دوو شیعری یەکەم و دووەم لەسەر کێشی عەرووزی (هەزەجی هەشتی سالم) دانراون. هەرچی شیعری سێیەمیشە لەسەر کێشی (ڕەمەلی هەشتی مەحزووف) دانراوە.

١- مەلای جزیری شیعری یەکەم بەم جۆرە دەست پێدەکا:

مە لەو فینجان ل سەر دەستە کو مەهتابا هیلال ئەبروو
نومایین من د میرئاتێ مەیا سافا زەلال ئەبروو
ب شیرینی ب زیبایی ب ڕەفتاری ب بالایی
بنێ نوونێن د توغرایی ل بالا هەردو خال ئەبروو
بلابێت (صائم الدهر) و بلا ئیڤار جارەک بت
کەسێ زانی ژ دلبەر وێ خویا بن هەر دو سال ئەبروو

مەشی مەستانە ڕەیحانێ دلێ من دی د ئامانجێ
ڕەشاندی سینەیێ تیران ب قەوسێ هەر دو مال ئەبروو

شاعیر لێرەدا ڕوخساری دلبەر بەمانگ و برۆی بەمانگی یەکشەوە دەچوێنێ، مانگی یەکشەوە بەڵگەی ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان و ڕۆژوو شکاندن و گێڕانی ئاهەنگی جەژنە. شاعیر دیاردەی سروشت لە ڕەنگ و ڕووی دلبەردا دەبینێ بەهۆی ئەوەی پێوەندییێکی لە یەکچوون لە نێوان مانگی یەکشەوە و برۆدا هەیە لە ڕووی قالبی مەتریالی دروستبوونیانەوە، بەوەی وێنەی دیاریان لەیەکتری دەکەن.

مەلای جزیری لەم شیعرەدا لە پێوەندی مەتریالییەوە لە نێوان برۆی دلبەر و مانگی نوێ خۆی دەرباز دەکا و لە پێوەندیی گیانیدا دەگەڕێ، لەم لایەنەوە دەڵێ:

د باتێن سەجدەگاها من ژ بۆ وێ هەردوو ئەبروونە
ب عەینی تاقێ میحرابن عیلمێ ئەهلێ حال ئەبروو
ئەگەر دەعوایێ مووسایی د عیشقێدا بکم جائیز
(مەلا) دائیم تەجەللایە ژ وێ تەرحا شەلال ئەبروو
ب شیرینی ب زیبایی، چ کاتیب بوو وەکێشایی؟
(تعالى الله) نیشان دانە وەشیرین ئەڤ میسال ئەبروو
ب شیرینا ل دەربەندێ نە مەحبووبێ سەمەرقەندێ
نەکێشاین ب ڤێ ڕەنگی ل نەقشێ بێ زەوال ئەبروو
نیشانا قابە قەوسەینێ کو قەوس ئاڤێهتە ئەبساران
د تەقویما تەجەللایێ ب سەر لێ بوون هیلال ئەبروو

پێوەندی شاعیر بەدلبەرەوە گیانییە، لە گێتی سۆفیزمدا سەجدەگاییێک دروست دەکا لە دوو تاقی برۆی خۆشەویست، لێرەدا لە یەکچوون لە وێنەی مەتریالییەوە دەگوێزرێتەوە وێنەی میتافیزیکی، بەوەی شاعیر زۆر بەختیارە کە گەیشتۆتە پلەی مووسا پێغەمبەر. مووسا پێغەمبەر بەهەزار و یەک وشە قسەی لەگەڵ خودادا کردووە، بەڵام شاعیر هەموو دەمێک ڕوخساری کردگار لە خۆشەویستدا دەبینێ.

٢- شاعیر لە پارچەی دووەمدا بەم جۆرە هەست و نەستی دەردەبڕێ:

د دەستدا یەنگییەک نووبار من دی ئەو کەمان ئەبروو
لە بالا جەدوەلەک جەببباری تێدا هەمقران ئەبروو
کو حەق ئەڤ حەرف و خەت کێشان ل تالایی مە دەرویشان
دو قەوسان گۆشە لێ بادان و سەر پەیوەستەمان ئەبروو
تە دیداری تە ڕفتاری تە ئەلماسێن شەکەر باری
ب عەینی ڕێ ل سەر (صادان) دو نوون ڕەیحان نومان ئەبروو



(بحمدالله) ب فیرووزی ل وەجهێ دلبەرێ من دی
کو ماهی نەو نیشان من دان ل تاقێ ئاسمان ئەبروو
(تعالى الله) نیشان دانە ب حوسنێ ئەڤ نەسەق دانە
ژ نەقش و سەنعەتێ حەق ئەڤ نیشان جەشم ئەڤ نیشان ئەبروو
ژ ڕەعنا نێرگزێن شەهلا مەجالێ هەمقران بینم
هەزار ڕەمز و ئیشاراتن ژ وان قەوسێن چەڤان ئەبروو
(مەلا) دل تێک تە پەیکانن ژ مەحبووبان مە نیشانن
کەمەندارێن د غەدداران د بورجا ئەسمەران ئەبروو

لەو پارچە شیعرەدا مەلای جزیری وێنەی هەستپێکراو دەستنیشان دەکا، ڕاستە مەبەسی بنچینەیی «برۆ»یە، بەڵام وێنەی ئەندامانی دیکەی خۆشەویستیش دەگرێ. بەژن و باڵای دلبەر جغزی هێلکاری کردگارە، هەمووی هەر جوانە، ڕەمزی هەموو ئەو جوانییە بێ پایانە چاو و برۆیە، برۆی وەک مانگی یەکشەوە، برۆی وەک حەرفی (ن)، چاوی وەک حەرفی (ص)، هەردوو حەرف یەکتری دەپارێزن، بزووتنەوەیان هێمای نهێنییە، هەموو کەس لە مانای بزووتنەوەکانی چاو و برۆ ناگەن چونکە جادوو و ئەفسانە و سیحریان تێدایە.

٣- شاعیر لە پارچەی سێیەم دەڵێ:

وەی سپێدە ژ بورجێ قەوس ئەبروو نوماندن ماهێ نەو
خوەش ژ قەوسێ ئەبرووان ڤێڕا کشاندن ماهێ نەو
گۆشەییێن نوونان ب سەر بادان ژ قەوسێ بێ وەتەر
میسلی ئەنگوشتا نەبی سەد سەر بەیاندن ماهێ نەو
کەششفی بەدرا تەمام ئەحسەن ژ بالا تەلعەتێ
ژ ئیستیوا دا گەزمەیان چەرخێ ڕەشاندن ماهێ نەو
وێ ل وەجهێ ئافتابێ گاهێ کفش گاهێ خەف
عارفێن ساحێب بەسارەت حەییراندن ماهێ نەو
مل دزانم دانە بەر قەوسێ هیلالی گۆشە زەر
لەو ژ بالا گۆشەییێن نوونان لڤاندن ماهێ نەو
ئەز دبێژم دێ ل من دیسا جەگەر سەد پارە کن
وێ ب میزان هەر دو شیرازی چەڤاندن ماهێ نەو
داخیلی مەجلیس بوویی ئیشەڤ نیشانی لەو کو خەف
جامێ ڕووحانی ل ئەهلێ دل نیشاندن ماهێ نەو

شاعیر لە دوو شیعرەکەی پێشوودا «ئەبروو = برۆ»ی کردووە بەپاش قافیە بۆ ئەوەی بە مانگی یەک شەوەی بچوێنێ، یا ئەم دوو شتە بەراورد و بەرامبەر بەیەکتریان بکا. لەم شیعرەدا ڕستەی «ماهی نەو»ی کردووە بەقافیە، ئەمە مانگی یەکشەوەیە، لێرەدا گومان لەوەدا نییە کە بە پێچەوانەی دوو شیعرەکەی پێشوو مانگی نوێ یا یەکشەوە دەکاتە بنج و بناوان بۆ ئەوەی لەگەڵ برۆ بەراوردی بکا.

لەبەر ئەوەی مەلای جزیری مانگی یەکشەوەی کردووە بەڕەمز بۆیە بەقەدەر دێڕە شیعرەکان دووبارە بووەتەوە، ئەمەی بەرامبەر بەو کەوانە داناوە کە تیرەندازی پێدەکرێ، هەروەها بەرامبەر بورجی کەوان و برۆی دلبەر و شتی تریش. بەلای شاعیرەوە ئەم هەموو دیاردانە بەوێنە و ڕوخسار لە یەکتری دەکەن، بەڵام لە هەموویان باڵاتر برۆی دلبەرە، چونکە دیاردە بنچینەییەکە ئەوە و ئەوانی دیکە وێنەیان لەو وەرگرتووە.

## ڕەوانبێژی ڕۆژهەڵات

مەلای جزیری یەکێکە لە شاعیرە گەورەکانی شیعری کلاسیکی کوردی کە بایەخێکی زۆریان بەڕەوانبێژی داوە لە هەردوو لایەنی مانا و وشەوە. لێرەدا مەبەسمان ئەوەیە زیاتر باس لە وشە و ڕستە بکەین لە ڕووی تەبایی لە نێوان تیپەکان و ڕیتم و ئاواز و مۆسیقاوە. بێگومان بۆ ئەم مەبەسە شاعیر کێشە سووکەکانی عەرووز هەڵدەبژێرێ و ئەگەر لەگەڵ کێشی خۆماڵیش بەراوردیان بکەین ئەوانەی ئێمەش هەر لە کێشی سووکی خۆماڵی دەژمێردرێن.

لە شیعرێکیدا مەلای جزیری وەستایی دەنوێنێ لەو کاتەی بایەخ بەڕیتم و ئاواز دەدا، ناچاریش دەبێ کێشێکی سووکی وەکو ڕەمەل هەڵبژێرێ. لەکاتی خوێندنەوەی ئەم جۆرە شیعرەدا گوێ زیاتر خەریک دەبێ، زەین دەورێکی ئەوتۆی نابێ.

شاعیر قەسیدەکەی بەم شیعرانە دەست پێ دەکا:

شۆخ و شەنگێ زوهرە ڕەنگێ دل ژ من بر دل ژ من
ئاوڕێن هەیبەت پەلەنگی دل ژ من بر دل ژ من
وێ شەپالێ میسک خالێ دێم دوڕێ گەردەن شەمالێ
جەبهەتا بسکان سەمالێ دل ژ من بر دل ژ من
زولف و خالان نوون و دالان وان ژ من بر دل بەتالان
گۆشەیێ قەوسێ هیلالان دل ژ من بر دل ژ من
دێم نەدیرێ بوو عەبیرێ خەمری و گیسوو حەریرێ
سینە کر ئامانجێ تیرێ دل ژ من بر دل ژ من
سوڕ شیرنێ نازەنینێ کوشتم و ناکت یەقینێ
وێ ب چەنگالا ئەڤینێ دل ژ من بر دل ژ من



لەو بڕە شیعرەدا شاعیر بەڕستەی کورتی پڕ ئاوازی قافیەدار وەسفی خۆشەویستەکەی دەکا، ئەم ڕستانە وەکو ئیدیۆمێک یا ڕستەیێکی دروستکراوی هونەراوی دەچنە ناو داهێنانی ئەدەبی کوردییەوە، خەڵکی بۆیان هەیە لە قسەکردندا بەکاری بێنن، یا پەخشانی کوردی ڕۆمانتیکی ئامێزی پێ بڕازێننەوە.

مەلای جزیری بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

(سروناز)ێ سەرفرازێ شوبهی زێڕ ڕەمزا مەجازێ
دامە بەرچاکووچ و گازێ دل ژ من بر دل ژ من
بەژن و بالا تۆخ و عالا من کرن ڤێکرا متالا
چیچەکا تەرحین والا دل ژ من بر دل ژ من
مێرێ غازی شێرێ تازی ڤێکڕا من دین ب بازی
کر ل م ژ غەفلەت ڤەگازی دل ژ من بر دل ژ من
شیر و خشتن زولف و قشتن هن وەشارن هن وەهشتن
پەهلەوانان دەست ڤە مشتن دل ژ من بر دل ژ من
ڕوهنیا چەهڤێن (مەلا)یی ئەو تەجەللایا تە دایی
یا ژ (ئەحمەد) دل ڕەڤایی دل ژ من بر دل ژ من

خوێنەر لەکاتی خوێندنەوەی ئەم قەسیدەیە خەیاڵی بۆ گێتییێکی سیمبۆلی تەلیسماوی دەچی، دیمەنێک لە ڕوویدا دەکرێتەوە: جەنگەی بەهارە، لە ئاسمانەوە تیپێک پەری یا پۆلێک فریشتە دێنە خوارەوە، بۆ ناو مێرگ و مێرغوزاری تەڕ و ئاودار، لەژێر وردە باران و بەرامبەر پەلکەزێڕینە و چاوشارکێی سێبەر و هەتاو دەکەونە سەما و هەڵپەڕکێ، نازەنینانی ڕازاوەی گوڵ لە سەمایاندا شایی حێولانێیان لەبیر ناچێتەوە، سەرچۆپی جوانی جوانان سەلمایە یا سەلوا دێڕە شیعرەکانی مەلای جزیری بەئاوازی پڕ سۆزەوە دەچڕێ، سەماکەران بۆی دەگێڕنەوە، ئەمانە کۆرسی زەماوەندەکەن، ڕستەی «دل ژ من بر دل ژ من» دەڵێن و دەڵێنەوە.

زەبری ئاواز لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە لەم شیعرەی مەلای جزیری دیار و ئاشکرا بوو، بەڵام شاعیر لە لایەکی دیکەشدا وەستاییێکی بێ هاوتایە، مەبەس لووتکەی نموونەی جوانی ڕەوانبێژییە لە ڕووی ماناوە، بەڵگە بۆ ئەم جۆرە داهێنانە لە شیعری کلاسیکیدا، ئەم پارچە شیعرەی مەلای جزیری دێنینەوە:

سەنەمێ ژ قەوسێ ئەبروو دو هیلالی نەونوماندن
دو کەمان ل بورجێ میزان ب غەزەب ل من کشاندن
نە دو نوون قەلەم موقابیل ب بەدیع خەت نڤیسین
دو هیلالێ دەستێ قودرەت ب قرانێ یەک کشاندن
چ بەراتێ حوسنە یارەب ب نیشانێ پادشاهی

ب تەرەف دو توورڕە، توغرا وە ب ماوەرێ ڕشاندن
ئەلیف و دو لام و هێ دین مە د ئایەتا جەمالێ
ژ جەگەر مە کر تەسەللی و ژ سینە دەست ڤەشاندن
نە تنێ قشت و زولفان مە د سینە سەد کولابن
ل جەگەر سیەه کەمانان دو هەزار تیر ڕەشاندن
ژ جەگەر (مەلا) پلنگان ب کولابێ پەنس کەر کر
ئەسەدان ژ پەنجە ڤێران دل و سینە هەرڕشاندن

شاعیر بەمەبەسی لێکچواندن لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە، سێ شتی بینراوی هەست پێکراوی وەکو کەوان و مانگی یەکشەوە و برۆ کۆ دەکاتەوە، بۆ ئەوەی برۆی دلبەر بەکەوان و مانگی یەکشەوە بچوێنێ، یا بەپێچەوانە. ئەم وێنانە لەوانەن خەڵکی دەیانبینێ و هەستیان پێدەکا.

لە وێنەییێکی دیکەدا بەراورد لە نێوان توغرای (ئیمزای) پاشایان دەکا بۆ ئەو فەرمانەی دەری دەکەن بۆ پێشکێشکردنی خەڵات و پاداش، ئەو توغرایە تەنیا یەکێکە بەڵام بسکی دلبەر دوانن، لەم لاو ئەولای بناگوێی وێنەییێکی جوانی توغرا ئامێز دەنەخشێنن.

ئینجا ڕووی یار بەلاپەڕەی قورئان دەچوێنێ، لەوێدا تیپی ئەلف (أ) لووتی دلبەرە و دوو کونە لووتی چاویلکەیە، دوو بسکی خوار و خێچی پێچ خواردوو لە تیپی لام (ل) دەکەن، پیاو نووسینەکە بە(اله) دەخوێنێتەوە. لە دواییدا شاعیر دەڵێ نیگای چاوی دلبەر لە هێرشی شێر و پڵنگ تیژترە، برژانگ چڕنووکیان لە دڵی گیرکردووە و لەت لەتیان کردووە.

ئەمە وێنەییێکە لە مانای داهێنان لە ئەدەبی کلاسیکیی ڕۆژهەڵاتدا، بەڵام ئەگەر بەمەفهوومی ئەوروپاییان لۆجێکییانە تەماشای ئەم داهێنانە هونەرییە بکەین موبالەغەییێکی زۆری تێدا دەبینین.

**بەهار و سروشت و دلبەر**

وەسفی بەهار و سروشت و دلبەر و بلبل و شتومەک و دیمەنی دیکە سەرانسەری دیوانی جزیری گرتۆتەوە، ئێمە لەم ماوەیەدا سێ پارچە شیعر دەخەینە پێش چاو تا پلەییێک تینوویەتی هۆگرانی ئەدەبی کوردی دەشکێنن.

١- شیعری «چوومە تەماشا چەمەن» لە حەوت بەند (کووپلە) پێکهاتووە، بەندی یەکەمی شیعرەکە:

چوومە تەماشا چەمەن
تازە گوڵ و نەستەرەن
غونچە و پشکۆ ب کەن
چیچەک و نەسرین سەمەن

***



تێک سەحەر مەست بوون
موحبەتەکێ خوەست بوون
زولفەکی ئەو بەست بوون
عەقرەبییان گەست بوون

***

یەک بەیەک ئەو خەمملین
بوغچە ب وان کەمملین
بولبولێ سوهتی دلین
تێک ژ وان دەست بلین

***

بەندی دوایی:

دل ب شەپالان بدە
ب ئاسک و غەزالان بدە
سینەب تالان بدە
ڕووحێ ب خالان بدە

***

نووریّ چرایێ دلن
چهرەگوسایێ دلن
شەیخ و مەلایی دلن
قیبلەنەمایی دلن

***

کەعبە و ئەسوەد حەجەر
پەردە هلینن ژ بەر
لازمە یەک سەجدە فەر
سەجدەیێ شوکرێ ببەر

شیعرەکە بەم بەندە کۆتایی دێ کە وەک کلیل و کلۆم یا خەرجە وایە بۆی:

داتو ببی سەرفراز
ڕەوزەیێ باغێ مەجاز

مەست و خەرامان ب ساز
لێ د مەشن سی و قاز

دەتوانین ئەم شیعرە بەجۆرە موەششەحێکی ئەندەلوسی لە قەڵەم بدەین، هەروەها لە بابەتەکانی تەرجیع بەندیش دەکا چونکە لە حەوت بەند پێکهاتووە، هەر بەندی بریتییە لە چوار دووبەیت (چوارین). قافیەی نیوەدێڕەکانی سێ دوو بەیتی سەرەتا هەموویان وەکو یەکن (ا ا ا ا)، (ب ب ب ب)، (ج ج ج ج)، قافیەی دوو بەیتی چوارەم لە هەموو بەندەکاندا یەکێکە (از).

دوو بەیتی چوارەمی هەموو بەندەکان سێ نیوە دێڕی دووەم و سێیەم و چوارەم لە هەموو بەندەکاندا دووبارە دەبێتەوە تەنیا نیوە دێڕی یەکەم دەگۆڕێ، قافیەکانیان دووبارە نابنەوە و ئەمانەن (ساز، ناز، ئیحتیراز، گاز، بخواز، دلنەواز، سەرفراز).

لەڕووی کێشەوە پەنا دەبەینە بەر کێشی عەرووز لەبەر ڕۆشنایی ئەو تیۆرییەی دەڵێ کێشی شیعری کلاسیکی ئیسلامەوی لە ئەدەبی کوردیدا بە عەرووز دەکێشرێ، بەم پێیە کێشی شیعرەکە بەسیتی چوارگۆشەیی مەتوییە بەعەرەبی (الوزن البسيط المشطور المطوى) (مفتعلن فاعلن)، بەهەموو جۆرێکیش لەم هەڵوێستەدا نابێ خۆمان لە کێشی خۆماڵی لابدەین. ئەم کێشە عەرووزییە لەگەڵ هەندێ کێشی سیلابی خۆماڵی یەکتری دەگرنەوە. ئەم بابەتە شیعرە لە شیعری میللی کوردیدا زۆر باوە بۆ مەتەڵ و شیعری منداڵان و بەیتی ئەفسانەیی بەکاردەهێنرێ.

ئەمە لەبارەی ئاواز و مۆسیقا و ڕیتمی ئەم شیعرەوە، هەرچی وێنە شیعرییەکانیشە، دیمەن چیمەنە، شانۆی ڕووداوە، قارەمان هەمیشە دلبەرە، هەموو دیاردەی سروشت لەپێناوی ڕشتنی قالبی جوانی ئەو جوانەیە: گوڵ بەهەموو بابەتەکانیەوە باڵندە بەهەموو چەشنەکانیەوە.

٢- لە شیعرێکی تریدا جزیری لە پێوەندی گیانی خۆی دەدوێ لەگەڵ پەیکەری خۆشەویستییەکەی، هەرچەندە هەناسەیێکی سۆفیزم فەزای شیعرەکەی گوڵاوپڕژێن کردووە وەکو زۆربەی بەرهەمی شاعیر، بەڵام وێنەکانی بەچاو دەبینرێن، بەدڵ هەستیان پێدەکرێ، سەرەتای شیعرەکەی بەم جۆرە دەست پێدەکا:

ڕەمزێن تە د جانان نە ب ئەندازە درازن
هەر یەک ب هەزار ڕەنگ ڕەوانێ مە دخوازن
وان دربە ل جانێ مە وەکی بەرق و برووسکان
ڕەمزێن تە د جانان نە تنێ سینە گودازن
جانا ژ جەفایا تەو زولمێ چ خەبەر دین
کو تیر ژ جەورا تە د دلدا مە ب گازن
پەروانە و بولبول ب دلن شوعلەیێ عیشقێ
لێ گەر تو نەزەر دی ب خوە ئەو گولشەنی ڕازن



پەیوەستە د وەسلێ کو دمینن ب سەراسەر
بشکۆژ و تەلیسم و وەرەق و نەترەک و بازن
سوببووحی و قودددووسی و حوورێن د بهشتێ
پەیوەستە شەبێ قەدرێ لیقایا تە دخوازن

ڕاز و نیاز و موناجاتی دڵداری تیرێکی ئەوەندە بەهێزن وێنەی برووسکەی ئاسمان خۆیان پیشان دەدەن. ناڵەی من لە زامی تیری نیگای تۆوەیە، تیریش گلەیی لەبەدبەختی خۆی دەکا، چونکە لە خۆت دوور خستۆتەوە و ناخی دڵمت کردووە بەجێگەی ژیانی. دەبینی چیرۆکی عەشقی من و تۆ وەک چیرۆکی بلبل و پەپوولە وایە. بەسەرهاتێکە لە کتێبی گوڵشەنی ڕازدا (باغچەی نهێنی) تۆمارکراوە. ئەم کتێبە یەکێکە لە دانراوەکانی شێخ سەعدەدین مەحموودی شەبستەری (١٢٨٦ - ١٣٢١م). ناوەڕۆکی بریتییە لە وەرامدانەوەی پازدە پرسیار لە گێتیی عیرفانی سۆفیزمەوە، بەرهەمێکی ئەدەبی بەنرخە بەشیعری مەسنەوی خۆی دەنوێنێ.

شاعیر شانۆییێکی ڕۆمانتیکی دروست دەکا، دوو تیپ لە فریشەی بەهەشت یەکەمیان هەر دەڵێ: سوببووح... سوببووح... دووەمیان هەر دەڵێ: قودووس... قودووس... ئەمانە هەتا هەتایە بەتەهلیلەوە حاڵیان گرتووە و ئەم وشانە دەڵێن و دەڵێنەوە. دیارە هەردوو وشەی «سوببووح» و «قودووس» لە ناوەکانی خواوەندن. ئەمانە چاوەنۆڕی شەوی قەدرن بۆ ئەوەی بگەن بەیار.

جزیری شیعرەکەی بەم دێڕانە دوایی پێ دێنێ:

سونبول ب سەما تێن و گولان پەردە دڕاندن
بشکفتنە ئالال و هشین بوونە تەرازن
جۆبار د ڕەوانن چەمەنان تەرح جوانن
مەستانە ب ڕەف ڕەف ل کناران سی و قازن
هەریەک ب تەماشا گەهێ حوسنا تە ژ هەر جا
تەشبیهی نیگاران ب جەمالا تە دنازن
تیران ل مە دت دۆست مە تێ سینە هەدەف کر
نازان ل مە کت یارێ مە زاری و نیازن
میحرابێ دو ئەبروو کو ژ بالا ڤە خویا بن
دەر سەجدەگەهێ عیشقێ نیازی مە نەمازن
گەر حوسن و مەحەببەت ب سەراپەردەیێ جان بن
گەه شاه و گەدا، گەه ب خوە مەحموود و ئەیازن
ئەڤ حوور و پەری چهرە بوت ولاتێ جەمالێ

دەر سووڕەتێ تەحقیق (مەلا) عەینی مەجازن

یەکێک شارەزای ئەو مەڵبەند و ئاقار و مێرغوزار و شاخ و دەرەی مەڵبەندی ژیانی مەلای جزیری نەبێ بەخەیاڵ ناتوانی نەخشی ئەو دیمەنانە بکێشی بەتایبەتی لە جەنگەی بەهاری کوردستانی ڕەنگین، بەڵام مەلای جزیری بەخەیاڵیش بێ، ئیلهام لەو بەهارە ڕەنگاوڕەنگە وەردەگرێ، ئەوجا ئەگەر بەهارەکەی شاعیر لە بەهارە ئەسڵییەکە جوانتر بێ ئەویان زیانێکی ئەوتۆی لێ نەکەوتووە چونکە بووە بەهۆی ئەوەی ئەو داهێنانە جوان و بەرزە بێنێتە ناو لاپەڕەی ئەدەبی کوردییەوە.

ئەم هەموو جوانکارییەی سروشت لە پێناوی نزیکبوونەوەیە لە دلبەر، چونکە سروشت جوانی لە دلبەر وەرگرتووە و لەناو ئەودا تواوەتەوە. ئەگەر یەکێکیان سوڵتان و ئەویتریان گەدا بێ لە گێتیی وردبوونەوەی سۆفیزمدا گەورەیی و بچووکی نامێنێ، ئەوەتە سوڵتان مەحموودی غەزنەوی و ئەیازی یاوەری پەردەی ئەتیکێتی کۆمەڵایەتی لە نێوانیاندا لاچووە و هەردووکیان یەک سەنگیان هەیە و بوون بەیەک. لە کوردەواری لای خۆماندا ئەیاز بە «هەیاسی خاس» ناوی دەبرێ.

٣- مەلای جزیری شیعرێکی تەرخان کردووە بۆ وەسفی گوڵ و بلبل و پێوەندی لەنێوانیاندا، وەکو ئاشکرایە نزیکی گوڵ و بلبل لە یەکترییەوە ڕەنگی لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی داوەتەوە. باسی گوڵ و بلبل لە دیوانی مەلای جزیریدا جێگەیێکی تایبەتی هەیە، ئەمە نموونەیێکە لەوانە:

گەر چ بولبول جەوهەرێ زاتی گولە
لێ گولێ ڕەونەق ژ عیشقا بولبولە
گوهدە زیکرێ حال و جووشا بادەیێ
وێ ب بولبول ڕا دەخوونت بولبولە
سووسنان سەد ڕەنگ ئاڤێهتن کەمەند
وان نەگۆ دل بەندێ تایەک سونبولە
سونبولان سەیوان ل دێمی تازە کر
ئافتاب ئیرۆ د بورجا سونبولە
قەت ڤەرێکی ڤی دەمێ حازر دبت
قیسەیا فەسڵی نەکارێ سونبولە
عەرعەرا ڕەنگین ژ تایێ سۆر و زەر
قومرییان سەد ڕەنگی شیرین غولغولە
ڕەمزیا عیشقێ ژ بالا هاتە خوار
قودسییان ئاڤێهتە چەرخێ غولغولە
من ژ دل ناسوورەکێدا هەستییان



(لاجرم) هێژ نەشئەیا داغا کولە
بولبول و پەروانە و فەسل و دەمن
جینسێ عیشقا من تنێ دەردێ کولە
نێرگزا نازک قەدا شەهلایە مەست
دین کرم ئەز بولبولان سەودا گولە
تەبعێ لامیع وەش ز مننەت بولحەسەن
من د دەستدا زولفەقار و دولدولە
هەشقەرێ بەد فیعلێ چی هیکر عەجەب
(بارک الله) خوەش بەزی هەسپێ قولە
زولف و بسکان پوڕ ژ من دل بر بەلێ
ڕشتەیا جانێ (مەلێ) ئەو کاکولە

جزیری لەم شیعرەدا پێوەندیی گوڵ و بلبل دەخاتە بەرچاو، دەڵێ: بلبل عاشقی جوانی گوڵە، ئەگەر گوڵ نەبوایە، بلبل ئەو سرووده پڕ ئاوازە خۆشانەی بەسەریدا هەڵنەدەوت، گوڵیش زیاتر لەبەر ئەوە لە خۆی باییبە چونکە بلبل عاشقیەتی و گۆرانیی ئەڤینی بۆ دەچڕێ.

بلبل و گوڵ وێنەی دڵدار و دلبەرن، ڕەمزی خۆشەویستی و هۆگرین، بلبل دڵدارە و گوڵ دلبەرە، هەروەها وەکو چۆن پەپوولە «مەعشووق»ە و چرا «مەعشووقە»یە.

شاعیر خۆی دەکا بەبلبل، یارەکەی گوڵە. دوو چاوی دلبەر نێرگسی کاڵن، کەزی و بسک و کاکۆڵی وێنەیان لە گوڵی سمڵ (سونبول) وەرگرتووە، گەلێ مانای داهێنراوی دیکە لەو شیعرەیدا دەخاتەڕوو.

مەلای جزیری وەکو هەموو شاعیرێکی دیکە سەرکەوتنی لە دانانی شیعری جواندا دەگەڕێنێتەوە بۆ سەرچاوە بنچینەیییەکە کە دلبەرە. ئەسپی ئیلهامی شیعرم ڕەوان و ڕەهوەن بوو، مەبەس لەو ڕۆژگارەیە کە هێشتا گرفتاری دڵداری نەبوو بوو، بەڵام لە کاتێکدا ئەسپی ڕەسەن و ئازا و خۆشڕەو کەوتە دەستی هی وەکو ولاغەکە و شمشێرەکەی ئیمامی عەلی، دولدول و زولفەقار، لەو کاتەوە کانی شیعری تەقییەوە و توانایی ئەوەی پەیداکرد شیعری پڕ مانا بڵێ.

**جزیری یادی نیشتمانی دەکاتەوە**

دڵداری هەرچەندە سنووری ئایینی و نەتەوەیی بۆ نییە بەڵام نزیکترین بەڵگەی دڵداری لەناو هەموو کۆمەڵێکدا کیژی نەتەوەیە. واتە خاوەن هەست لە کۆمەڵەکەی خۆیدا تووشی ئەو نازەنینانە دەبێ بەزمانێک قسە دەکەن زمانی دایکی هەردووکیانە. مەلای جزیری لە بڕە شیعرێکیدا لە وەسفی خۆشەویستەکەیدا دەڵێ:

لاتێ حوسنی و شەهێ خووبانی

ب خوه هەم خانی و هەم خاقانی
یووسفی سانی تو ئیرۆ خانم
کو ب حوسنا خوه نەدیری سانی
ب سورِ و هەیبەت و سەهمێ خوه پەری
ب تە شێتن ل بۆتان سولْتانی
ب تەبلخانەیێ شاهی وەرە تەخت
کو تو ئیرۆ شەهێ کوردستانی
کاکولێ بەردە ب سەر خال و خەتان
کو موسەلسەل بنومت ڕەیحانی
ئیسمێ ئەعزەم مە دڤێ چل ئیسمی
ژ دو حەرفان ب موعەمما زانی

لێرەدا شاعیر ئەوە دەردەخا خۆشەویستەکەی جوانی جوانانە لەو جوانتر نییە، یا جوانی وەک ئەویش نییە یووسفی کوڕی یەعقووب نەبێ، جا ئەگەر یووسف یەکەم بێ، یاری جزیری دووەمە، بەڵام ئەگەر یووسف دووەمی هەبێ خۆشەویستی شاعیر دووەمی نییە و هەر خۆیەتی.

یاری جزیری جوانی جوانانە، واتە کچانی کورد هەموویان جوانن، بۆیە دەبێتە سولْتانی هەرێمی بۆتان، شاعیر تەنیا بەوەش ناوەستێ بەڵکو گەورەتری دەکا و دەیکا بەشاهی هەموو کوردستان. ئەمەش بێگومان بەسۆزترین بەڵگەی ئەڤینییە بەرامبەر بەنیشتمان و ڕۆڵەکانی نیشتمان.

جگە لەمە جزیری قەسیدەیێکی بیست و دوو دێڕە شیعری هەیە بەناوی «ئەی شەهەنشاهێ موعەززەم» بۆ پێداهەڵگوتن و ستایشی میری بۆتانی وتووە، لەوێدا گەورەی دەکا و دەیگەیەنێتە پلەیێک وەکو ئەوەی شاهنشاهی هەموو گێتی بێ نەک تەنیا نیشتمانی خۆی کە «کوردستان»ە، لە شیعرەکەدا دەڵێ:

ڕایەتا فەتحێ ب نەسرا (لم یزل) مەنشوور بوو
شەهسوارێ فەردێ سوبحانی عەلەمداری تە بی
نەی تنێ تەبریز و کوردستان ل بەر حوکمێ تە بن
سەد وەکی شەهێ خوراسانێ د فەرواری تە بی
گەر چ دەر ئیقلیمێ رابیع هاتی تەختێ سەلتەنەت
پادشاهێ هەفت ئیقلیمان سەلامکارێ تە بی
چیمەنا سولْتانییێ یەک لا لە یەک باغێ تە بت
گولْشەنا خاقانییێ خارەک ژ گولْزارێ تە بی

لەم شیعرەدا شاعیر قسە لەگەڵ میری بۆتان دەکا لە هەموو مەدحەکانی پەنجە بۆ ئەو درێژ دەکا و پێی



دەڵێ ئاڵای سەرکەوتن هەمیشە بەدەست تۆیە، تۆ لەلایەن کردگارەوە تەنیا تەورێز و کوردستانت پێ نەبەخشراوە، بەڵکو شای خوراسانیش ملکەچی تۆیە، تۆ ئەگەرچی لە ئیقلیمی چوارەم تەختی سەڵتەنەتت دراوەتێ، بەڵام پاشاکانی هەر حەوت ئیقلیم دەستی ڕێزیان خستۆتە سەر سنگ بۆ تۆ.

ئەوەی جێی خۆیەتی لێرەدا بوترێ ئەوەیە، بەپێی دابەشکردنی گۆی زەوی ئێمە لەلایەن جوگرافییە کۆنە کلاسیکییەکانی ڕۆژهەڵاتەوە هەموو زەوی کرابوو بەحەوت ئیقلیم (هەرێم)، خاکی کوردستان بەناوچەی بۆتانەوە لە ئیقلیمی چوارەمدا بوو.

**سروودی بەیانی باش (صباح الخیر)**

ئەم شیعرە جۆرە تەرجیع بەندێکە لە نۆ پارچە (کوپلە) پێکهاتووە. هەر پارچەی لە سێ دوو بەیت خۆی دەنوێنێ، دوو بەیتی یەکەم و دووەم هەر چوار نیوە دێڕی لەسەر یەک قافیەن (ا ا ا ا)، (ب ب ب ب) هتد... دوو بەیتی سێیەم بەحسێب تەرجیعەکەیەتی، نیوە دێڕی یەکەم قافیەی (انم)ە، نیوە دێڕەکانی دووەم و سێیەم و چوارەم لە هەر نۆ کۆپلەدا دووبارە دەبنەوە، نیوە دێڕەکان ئەمانەن:

(صباح الخیر یا خانم)
وەرە بیناهییا چەهڤان
ببینم بەژن و بالایێ

ئەم سرووده ڕەوان و پڕ ئاوازە سووکەی شاعیر لەسەر کێشی عەرووزی «هەزەجی چواری سالم» (مفاعیلن مفاعیلن) هۆنراوەتەوە، ئەمە هەندێ لە بەندەکانی تەرجیع بەندەکەیە:

(صباح الخیر) خانێ من
شەهێ شیرین زەبانێ من
تویی ڕووح و ڕەوانێ من
ببت قوربان تە جانێ من
(تعالی اللە) چ زاتی تو
چ وەی شیرین سیفاتی تو
نەوەک قەند و نەباتی تو
یەقین ڕووح و حەیاتی تو
حەیات و راحەتا جانم
(صباح الخیر یا خانم)
وەرە بیناهییا چەهڤان
ببینم بەژن و بالایێ

***

(صباح الخیر) مەستا من
لەتیفا جام ب دەستا من
خومار و مەی پەرستا من
تویی مەقسوود و قەستا من
ژ مەقسوودان تویی بەس من
ببێ بەر چەرخێ ئەتلەس من
ژ غەیری تە نەڤێت كەس من
ب ڕەشتۆ زێن موقەووەس من
د بەندا زولفێ چەوگانم
(صباح الخیر یا خانم)
وەرە بیناهییا چەهڤان
ببینم بەژن و بالایێ

***

ژ شەهكاسا كو قەرقەف تێ
مەیا نوورین موشەررەف تێ
نیشانەک دلبەرێ كەفتێ
ژ بۆ من هەر سەحەر خەف تێ
ژ وی جامی دنووشم ئەز
سەحەر لەو نەی ل هووشم ئەز
ژ عامێ لێ دپووشم ئەز
ب جان هەر لێ دوكووشم ئەز
كو غالیب مەست و سەكرانم
(صباح الخیر یا خانم)
وەرە بیناهییا چەهڤان
ببینم بەژن و بالایێ

***

وەرە پێشبەر (مەلایێ) خوە
شەهید و موبتەلایێ خوە
ب شەفقەت كە لیقایێ خوە



(مەلا) نەمرت ب دایێ خوە
مەسیحایی ل بیماران
كەسێ گەزتی دو ڕەشماران
شەهیدێن شیر و مووكاران
كری ئامانجێ نووباران
ل دیدارا تە حەیرانم
(صباح الخیر یا خانم)
وەرە بیناهییا چەهڤان
ببینم بەژن و بالایێ

ئەم بڕە شیعرە مۆنۆلۆجێکە شاعیر بەرەو ڕووی یاری نازداری دەکاتەوە، خۆشەویستەکەی تەنیا گوێ دەگرێ و وەرام ناداتەوە، جزیری دەمێک بەبەژن و باڵای هەڵدەڵێ، دەمێکیش قسەجوانەکانی دەبن بەموناجات لە خوارەوە بۆ سەرەوە. شاعیر بەرامبەر پەیکەرێکی ئەڤینی گۆرانیی پڕ ئاوازی خۆشی دەچڕێ. یاری نیگارین کیژۆڵەیێک نییە لە چواردە بەهاری تەمەنی وەستابێ، بەڵکو ژنێکی قەیرەی خانومانە، دنیا دیتەیە، هەموو هەرزەبێێک و مێردمنداڵی تازە سمێڵیان سەوز بووە ئەوانیش گرفتاری ئەفسانەی دەبن و خۆیان بەحەیرانی دەکەن.

**مەدح و ستایشی خانی خانان**

یەکێ لە شیعری مەدح و ستایشەکانی مەلای جزیری ئەو قەسیدە ناودارەیەتی کە بۆ میری بۆتان شەرەفخانی وتووە بەنازناوی خانی خانان بەخەڵکی دەناسێنێ:

خانێ خانان لامیعێ نەجما تە هەر پوڕ نوور بی
كەشتییا بەختێ تە ئەز بایێ موخالیف دوور بی
كەوكەبا سەعدا شەرەف تالیع دنێڤ بورجا تە بت
داتنێ ژ چەرخێ بەلا شوبهێ مەهێ مەنزوور بی
ئەنجومێ چەرخێ موحەددەب هەر ژ زاتێ تەی شەریف
كەسبێ ئەنواری بكن حەتتا كو نەفخا سوور بی

بەلای شاعیرەوە میری بۆتان لە شاری جزیرە لە هەموو گەورەیێکی گێتی گەورەترە، لەبەر ئەوە دوعای بۆ دەکا هەمیشە ئەستێرەی دواڕۆژی لە گەشەکردندا بێ و کەشتیی بەختی لە ڕەشەبا بەدووربێ. ڕۆژگاری پڕ لە بەختیاری و ژیانی سەربڵندی و دەسەڵاتی فراوانی تا ڕۆژی مەحشەر بێ.

ئینجا شاعیر میر دەخاتە تای تەرازوو و لەگەڵ گەورە پیاوانی مێژوو بەراوردی دەکا و دەڵێ:

پاشی نەوشیروان، دبێم دێ حاكیمێ عادیل تویی

میسلی حاتەم دێ ب دانێ دەر جەهان مەشهوور بی
ما جزیرێ شوبهی دارێ تەختێ هەفت ئیقلیم بت
هەم ب حوکم و سەلتەنەت ئەسکەندەر و فەغفوور بی
میسلی جەم جاما زەرین خالی نەبت تە ژ بادەیێ
دا ژ خەمرا شادمانی دائیمەن مەخموور بی
ما دباغێ عەیش و نووشێ هەر ب ساز و ئەرغەوان
کامران و کام بەخش و دل خوەش و مەسروور بی

لێرەدا جزیری دەڵێ: بۆتان لە فەرمانڕەواییدا گیانی یەکسانی لەلای وەکو ئەوەی نەوشیروان وایە، لە دەستبڵاوی و چاوتێری حاتەمی تایی بەناوبانگی ناو عەرەبانە، دەسەڵاتی لە شاری جزیرە نموونەی دەسەڵاتی هەر حەوت ئیقلیمە لە وڵاتی گریکەوە تا چین، میر خۆی لە شێوەی ئەسکەندەری مەکدۆنی و فەغفوور (خاقان)ی چین دەنوێنێ، وەکو جەمشیدی جەم با جامی زێڕینی بە مەیی بەختیاری شادمانی بکا، هەردەم ژیانی ئاواز و بەختیاری و خۆشی بێ.

شاعیر لە دوعایدا بەردەوامە و تەمەنی هەمیشە زیندوویی بۆ دەخوازی:

ما تە عومرێ خزر و نووح و مولکێ زولقەرنەین بتن
گونبەدا چەرخێ مولەممەع هەر ب تە مەعموور بی
خاسێ تەشریفێ تە بن دەریا و دەربەندێ عەجەم
داخەلاتێن هەر سەحەر سەد زەرکەش و مەخموور بی

شاعیر تەمەن درێژی خدری زیندە و نووح پێغەمبەر و دەسەڵاتی ئەسکەندەری مەکدۆنی بۆ میری بۆتان دەخوازێ بۆ ئەوەی ڕۆژگاری واڵا بەو ئاوەدان بێ، کە دەسەڵاتی میر ئەوەندە فراوان بێ پێویستە فەرمانڕەوایی زەریا و خاکی عەجەم بکەوێتە بەردەستی بۆ ئەوەی هەموو ڕۆژێ بەسەدان پارچەی ئاوریشم و قوماشی مەخمەل و زەڕین داو بەخەڵات بداتە نزیکەکانی.

جزیری بەم دێڕانە دوایی بەشیعرەکەی دێنێ:

ما لیسانێ من دوعا گوویێ ل دەرحەق وەسفێ خان
مەزهەرێ سیڕرا کەلامی وەک درەختا توور بی
هەر د مەدحێ تە و سەنا ئێ سینە و قەلبێ (مەلێ)
بێ تەفاوت قولزوما پوڕ لوئلوئێ مەنسوور بی (منشور)
ژ ئاستانێ دەولەتی غائیب نەبی جارەک (مەلا)
دا ژ فەرمانێ موکەررەم دەم ب دەم مەئموور بی

لە سەرانسەری ئەم قەسیدەیەدا وەکو بڵێی مەلای جزیری وێنە و ڕستە و مانای ڕەوانبێژی داهێنراوی



ئامادەکرا و بەکار دێنێ، واتە ڕەنگە ئەم وێنە و ڕستانە لەبەر چاومان شتێکی نامۆ نەبن و لە گوێماندا وەک ئاوازێکی بیستراو بزرنگێنەوە. ئەمە ڕاستە ئەگەر مەسەلەکە بە بیروڕای ڕۆشنبیری کوردی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و هەموو سەدەی بیستەم وەربگرین، واتە ڕۆژگارانی دوای دروستبوونی قوتابخانەی شیعری نالی، بەڵام ئەگەر بیرمان بۆ نیوەی دووەمی سەدەی شازدەم و نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەم بڕوا کە مەلای جزیری تیایاندا ژیاوە، ئەو کاتە بۆمان ئاشکرا دەبێ هەندێ لەم وێنە و ڕستە و مانا داهێنراوە جوانکارییانە بۆ یەکەمین جار مەلای جزیری لە بەرهەمی ئەدەبی ئیسلامەوی (عەرەبی و فارسی و تورکی عوسمانی)یەوە هێناویەتییە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

**تەرجیع بەندی شاعیر**

دیوانی مەلای جزیری دوو تەرجیع بەند دەور دەکاتەوە:

١- تەرجیع بەندی یەکەم بریتییە لە پێنج پارچە غەزەل، هەر پارچەی لە دە نیوە دێڕ شیعر پێکهاتووە، لەمانە نۆ نیوە دێڕ شیعر لەسەر یەک قافیەن (ا ا ا ا ا...)، (ب ب ب ب ب ...) هتد. نیوە دێڕی دەیەم لەهەر پێنج پارچەکەدا ئەوانیش لەسەر یەک قافیەن (...وودێ).

تەرجیعەکە لە دوای هەر پارچەیێک دووبارە دەبێتەوە، هەروەها سەرەتای پارچەی یەکەمیش بەتەرجیعەکە دەست پێدەکا، واتە شەش جار لە تەرجیع بەندەکەدا دووبارە دەبێتەوە.

ئەمە دوو نیوی دێڕە تەرجیعەکەیە:

سەنەما سوڕ ژ سەمەد شەوقێ ژ حەق دایە وجوودێ
گەر عەزازیلی بدیتا نە دبر غەیری سووجوودێ

لە غەزەلی یەکەمی تەرجیع بەندەکەدا جزیری دەڵێ:

غەرقی بووم ئەز د غەما عیشقێ د وەقتێ سەحەری بوو
کو تەجەللایێ جەمالێ ژ میسالێ بەشەری بوو
نە ژ لەونێ بەشەران من دییە لێ دێم زەری بوو
ئەز دبێم ڕووحێ قودس بوو ب خوە یا حوور و پەری بوو
لەو ب حوسن و نەزەرێ ڕەمزەک ژ سڕا قەدەری بوو
خەمری یێن سەیر ل دێم حەلقە ل دۆرا قەمەری بوو
سەد خەدەنگ دانە جەگەر سینە ژ زەربێ ب کەری بوو
ل مە ئێش و ئەلەمان زێدە ژ تیرا قەجەری بوو
دل ژ مە بوویە پەلەک جان و جەسەد تێک سەقەری بوو
لەو مە شەب تا ب سەحەر نالەیە وەک موغنی و عوودێ
(سەنەما سوڕ ژ سەمەد شەوقێ ژ حەق دایە ووجوودێ

گەر عەزازیلی بدیتا نە دبر غەیری سووجوودێ)
لە غەزەلی پێنجەم کە دوایی تەرجیع بەندەکەیە، شاعیر دەڵێ:
بێ حیساب شۆخ و شەپالێ ل (مەلێ) قەهر و غەدەر کر
نە ئەم ئانینە خەیالێ نە ل حالێ مەنەزەر کر
قەت نەکر شەفقە، لیباسێ غەزەبێ زێدە د بەر کر
عیللەتا جەور و جەفا و ئەلەمێ جە ل جەگەر کر
عەللاندین د فیراقێ ستەمێ سینە بکەر کر
ئاه حەتتا مرنێ ئەڤ ژ مە ڕا داغ و کەسەر کر
سەفەرا شام و عیراقێ ل مەخوەش لازم و فەر کر
ب مەدا ژەهر و ڕەقیبان د دەڤی شەهد و شەکەر کر
ئەم بوویین پێت و پەڕەنگ لەو ژ ویسالێ مە حەزەر کر
نازک و نەی شەکەر و خووب و شرین قەدد و حودوودێ
(سەنەما سوڕ ژ سەمەد شەوقێ ژ حەق دایە ووجوودێ
گەر عەزازیلی بدیتا نەدبر غەیری سوجوودێ)

٢- تەرجیع بەندی دووەم بریتییە لە پێنج پارچە غەزەل، هەر پارچەی لە دوازدە نیوە دێڕ شیعر پێکهاتووە، یەکێتیی قافیە لەهەر دوازدە نیوە دێڕ شیعری هەر پارچەیێک دیار و ئاشکرایە (ااااا ا...)، (ب ب ب ب ب...) هتد.

تەرجیعەکە لە دوای هەر پارچەیێک دووبارە دەبێتەوە، لە سێ نیوە دێڕ شیعر پێکهاتووە، قافیەی بەم جۆرەیە (اا ب).

ئەمە سێ نیوە دێڕی تەرجیعەکەیە:
ئەوە من رووح و حەیات و ئەوە من قیبلەیی زات
سەنەما سوڕ ژ سەمەد نەی شەکەرا لەب ژ نەبات
(أحسن اللە تبارک) ژ سورا وێ سەنەمێ

لە غەزەلی یەکەمی تەرجیع بەندەکەدا جزیری دەڵێ:
ئەنورا ڕەنگ فریشتە بەشەرا حوور سروشت
یا ژ مسکێ خوتەنی خال و خەت و کاکول و ڤشت
گەر خوە نیشان سەقەرێ دت دکرت حوور بهشت
کەعبەیا تێ نەبت ئەو بوتکەدەیە و دێڕ و کنشت



کو نەسیب دان ژ ئەزەل حەق ژ مەڕا عیشق نوشت
فایدە ناکن ل مە ئیسم و نە تلسم و نە نڤشت
زاهیری دا مە عەزابەک وەه کو باتین ڤە بهشت
سوهتنێ دایە هناڤان و جەگەر تێک برشت
قەسدێ وەسلێ مە ب جان کر کو ڤەداین و نەهشت
دەست نەهلین ژ تەلەب ئەرمە درێ چت سەروتشت
پشتێ نادین دو هەزار خەنجەر و تیر و ڕم و خشت
مە سەرێ دانییە ڕێ و ب خو دێ بەستییە پشت
ئەوە من رووح و حەیات و ئەوە من قیبلەیێ زات
سەنەما سوڕ ژ سەمەد نەی شەکەرا لەب ژ نەبات
(أحسن اللە تبارک) ژ سورا وێ سەنەمێ

لە غەزەلی پێنجەم کە دوایی تەرجیع بەندەکەیە، شاعیر دەڵێ:
د ڕییا دۆستێ (مەلا) یەک جەهەت و سادە دلین
مە حەتا جان هەیە حاشا ژ تەلەب دەست بهلین
یا درێ سەر بدرین یا ب مورادێ وەسلین
مە چ پەروایێ ڕمێن پەڕوەش و شیرین قزلین
تا ئەبەد مەست و هەلاکین ژ شەرابا ئەزەلین
ژ جەفا و ستەما وێ ژ جەگەر پوڕ د کولین
پەردەیا گۆشە قەسەب بێ تو ژ سەر دێمی هلین
کو د شەرقێ مەه و خورشید ژ شەوقێ بەتتلین
لەو ژ سوڕ سورمە د دیرین و نە موحتاجی کلین
مەست د نێڤ تۆڕ و لەفان مار ل سەلوێ فتلین
سورمەدارین ژ سوڕێ مەستێ ژ قودرەت کەمملین
مە ژ غەفلەت دو ژها دین و ژ سەهمێ خەجلین
عیشوەگەر شیوە نوما یا مە ژ وێ رووح و حەیات
سەنەما سوڕ ژ سەمەد نەی شەکەرا لەب ژ نەبات
(أحسن اللە تبارک) ژ سورا وێ سەنەمێ

هونەری تەرجیع بەند لە ئەدەبی کلاسیکیدا کەمە، هەموو شاعیرێک پەنای بۆ نەبردووە، لە شیعری

عەرەبیدا نەبووە، لە شیعری نەتەوە موسوڵمانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەیە، زیاتر بۆ مەبەسی گۆرانی بەکاردەهێنرێ، بەتایبەتی لە کۆبوونەوەی ئایینی وەکو مەولوودی پێغەمبەر لە کۆمەڵی کوردەواریدا، لە ڕووی ناوەڕۆکیشەوە تەرجیع بەند هەموو بابەتەکانی موناجات و نەعت و وەسف و پێداهەڵگوتن و ئەوانی دیکە دەگرێتەوە.

## چوارینی جزیری

دیوانی جزیری حەڤدە چوارینی گرتۆتە خۆ. چوارین لە ئەدەبی کوردیدا لە چوارنیوە دێڕ شیعر پێکهاتووە، واتە ئەگەر دێڕی یەکەم و دووەمی هەموو غەزەل و قەسیدەیێکی شیعری عەرووزی کلاسیکی وەربگرین، دەتوانین ناوی بنێین «چوارین»، بەم پێیە لە ڕووی قافیەوە نیوە دێڕی یەکەم و دووەم و چوارەم یەک دەبێ، بەڵام نیوە دێڕی سێیەم دەگۆڕێ (ا ا ب ا). هەروەها چوارینی یەکێتی قافیەش دەبینرێ، واتە هەر چوار نیوە دێڕ شیعر لەسەر یەک قافیە دەبن (ا ا ا ا). چوارینەکانی مەلای جزیری هەموویان نیوە دێڕی شیعرەکانیان لەسەر یەک قافیەن.

لە چوارینێکدا جزیری دەڵێ:

قــــەوسێ تە هیـــلالی ب دەلالی کـــەشـــــهـــا
بەژنا تە ژ شــــەنگی ب درەنگی مــــەشــــهــــا
مـــارێ ژ حـــەریرێ د عـــەبیـــرێ خـــوەشـــهـــا
مـــــاوەر بـوو ژ وان زولفێ د زەنگی وەشــــهــــا

لەم چوارینەدا شاعیر زانیارییێک وەک لە برووسکەییێکی کورتدا هاتبێ وەسفی دوو برۆی دەلال و بەژنی شۆخ و شەنگ و بسکی ئاوریشمین دەکا، لەناو قالبی مەتریالی یارە خۆشەویستەکەی.

لە چوارینێکی دیکەدا دەڵێ:

سـەر دەفـتـەرێ وەسـفـێن تەیە دیبـاجـەیێ دل
یەک قـەترە ژ لوتفـا تەیە سـیـراجـەیێ دل
زیـکـرێ تـە دکـت دوڕ و زیا لـەهـجـــــەیێ دل
تـەیرێ نەفـەسـا های و هوویا لەهجـەیێ دل

لەم چوارینەدا جزیری موناجات لەگەڵ یاری دەکا و پێی دەڵێ: دیباجەی بەسەرهاتی دڵ و ڕووناکی ناو دڵ لە وەسفی جوانی تۆ و دڵۆپێک لە سۆزی تۆ وەرگیراون. زمانی حاڵی لە زیکری تۆ دایە، حاڵ و های و هووی دەروێشان بۆ یادی تۆیە.

لە چوارینی سێیەمدا دەڵێ:

پەردە حـەبابی ب حـیـجـابێ تە ڤـەدائین
سـەروی د چەمـەندا و دبـەندا هـەوە دائین



هەرچەندە تو مـیـری مـە فـەقـیـر و گـەدائین
زانی ژ گـیـانێ خـوە ب خـانێ خـوە فـیـدائین

لەم چوارینەدا شاعیر دیسانەوە لەگەڵ یاری قسە دەکا و ئەوە دەردەخا کە گەورەیە، کەسانی وەک شاعیر لەژێر باڵی ئەون، لەناو بەندی ئەودا دەژین، هەرچەند یار میرە و ئەوان گەدا و هەژارن، بەڵام گیانیان بەقوربانی گەورەی خۆیان دەکەن.

چوارینەکانی مەلای جزیری لەگەڵ ئەوەی وێنە و مانای ڕووکەشیان وەسفی کچێکی زەمینی دەنوێنێ و بووە بەیاری نازداری شاعیر بەڵام هەناسەیێکی سۆفیزمی ئیسلامی تێدا بەدی دەکرێ، ئەو جوانە دەبێتە وێنەیێکی ماقووڵ لای ئەو سۆفییانەی باوەڕیان بە«یەکێتی بوون» هەیە.

## دیالۆجی نێوان مەلای جزیری
## و میر عیمادەدینی جزیری

دیالۆجێکی شیعرییە لە نێوان مەلای جزیری و میر عیمادەدینی جزیری. قسەکانی هەردوولایان هەریەکەی لە شەش نیوە دێڕ شیعر پێکهاتووە، کێشی عەرووزییەکەی هەزەجی تەواوە (مفاعیلن مفاعیلن). لە ڕووی قافیەشەوە نیوە دێڕی یەکەم و سێیەم و پێنجەم یەکێکە، دووەم و چوارەم و شەشەم یەکێکی دیکەیە (ا ب ا ب ا ب)، ئەگەر هەمووی بەسەریەکەوە بخوێنرێتەوە وەکو قەسیدەیێک دەکەوێتە بەر چاو لە سی و نۆ بەند پێکهاتووە، نیوە دێڕی هەموو دیالۆجەکە بخرێنە پاڵ یەکترییەوە ژمارەی نیوە دێڕەکان دەبێتە (٢٣٤) نیوە دێڕ شیعر.

بیست بەند لە دیالۆجەکە قسەی مەلای جزیرییە و نۆزدە بەندی قسەی میر عیمادەدینە، چونکە دیالۆجەکە بەقسەی مەلای جزیری دەستی پێکردووە و کۆتاییەکەشی هەر قسەی ئەوە.

بەڵام پرسیارێکی سەرەکی لە ناوەوەیە، ئایا دەکرێ دوو شاعیر بەرامبەر بەیەکتری دابنیشن، یەکەمیان شیعرێک بڵێ و ئەوی دیکەیان وەرامی بداتەوە، بەمەرجێ قسەکانیان شیعرێکی ڕێکوپێک بێ لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە؟ ئێمە لامان وایە ئەمە کارێکی قورسە، بیروڕا لەم لایەنەوە زیاتر بۆ ئەوە دەچێ مەلای جزیری خۆی خاوەنی هەموو شیعرەکەبێ، بەخەیاڵ بۆچوون و وێنە شیعرییەکانی خستبێتە ناو بابەتێکی دیالۆج لە نێوان دوو کەسدا بێ. ئەم دیاردەیە لە ئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواش هەیە.

دەمێنێتەوە سەر ئەوەی ناوونیشانی میر عیمادەدین بەتەواوی لە مێژووی نەتەوەی کورددا ئاشکرا نییە. بێگومان ئەگەر ئەم مەسەلەیە ساغ بکرێتەوە کەڵکێکی زۆری دەبێ بۆ مێژووی میللەت. بەڵام لە ڕووی ئەدەبییەوە بۆ ئێمە گەلێک گرنگە جێگەی ئەو کەسەی لەگەڵ مەلای جزیریدا بەشداری کردووە لە ڕێکخستنی ئەم دیالۆجە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا دیاری بکرێ. بەپێی ئەو زانیارییانەی لە ناوەوەن ئێمە بۆ ئەوە دەچین شیعرەکە هەمووی لەلایەن مەلای جزیرییەوە هۆنرابێتەوە.

لە سەرەتای دیالۆجەکەدا مەلای جزیری دەڵێ:

سەلاما من سەنا خوانی
سەرحەر گەه کەوهەر ئەفشان بت
ب خدمەت عەرزێ سولتانی
عەبیر و عەنبەر ئەفشان بت
ب سوورەت ئەمرێ سوبحانی
سەر ئەلقابێ زەرئەفشان بت

میر بەم شێوەیە وەرامی دەداتەوە:

سەلاما سانیعێ قادر
(مەلا)دا پێ موعەتتەر بی
موفەررەح بت مەلێ خاتر
پەیاپەی لێ موکەررەر بی
ژ جاما خاترێ عاتر
مە ژێ ئایینە ئەنوەر بی

لە قسەیێکی دیکەیدا لە دیالۆجەکە مەلای جزیری دەڵێ:

میسالا سوورەتا چینێ
غەلەت مانی خەتا کێشا
کو من دی بوو د ئایینێ
ژ بەر زولفا دو تا کێشا
مەدی بوو شەکلێ شیرینێ
تو ئوستادان وە ناکێشا

لە وەرامدا میر دەڵێ:

کو کێشا کاتبێ غەیبێ
خەتێ ڕەیحان ل کافوورێ
چ ئایەت بوو ژ (لاریب)ێ
ڕەشاندی زوڵمەت و نوورێ
د یاقووتا مە دێ مەی بێ
ژ دەستێ وێ سیفەت حوورێ

لە کۆتایی دیالۆجەکەدا میر دەڵێ:



د باغێ لەفز و مەعنایێ
مە کێشا شانە شمشادە
ژ ڤێ ئیملائو ئینشایێ
مە لەوحێ دل نوما سادە
ژ حوسنێ ڕەونەقەک دایێ
کو شەیخ ئەحمەد مە ئوستادە

لە وەرامدا مەلای جزیری بەم ڕەنگە کۆتایی بەدیالۆجەکە دێنێ:

د بەحرا قولزوما میران
ب غەوواسی گوهەر چینم
د بەحسا شەرح و تەفسیران
تو دەریایان وە نابینم
ژ میر و بەگلەر و چیران
غولامێ میر عیمادینم

لە دوای خوێندنەوەی ئەم دیالۆجە لە هەموو دێڕە شیعرەکاندا یەک شێوازی دەبینرێ، ئەوەی مەلای جزیری وتوویەتی دیارە شێوازی خۆیەتی، ئەوەی بەناوی میرەوە تۆمارکراوە ئەویش شێوازی مەلای جزیری پێوە دیارە، ئەگەر میر شاعیر بووایە و شیعری دیکە بەناوی ئەوەوە لە ناوەوە بوایە بێگومان شیعرەکانی ئەومان لەم دیالۆجەدا بۆ خۆی دادەنا. مەسەلەکە هەرچۆنێ ئەم دیالۆجە شیعرییە لە بەرهەمە جوان و ڕەنگینەکانی ئەدەبی کۆنی کوردییە.

## دیالۆجی مەلا و فەقێ

ئەگەر دوو شاعیر بکەونە گێتیی خەیاڵەوە ڕاز و نیازی دڵی خۆیان بۆ یەکتری هەڵبڕێژن هەروا بەقسەی ڕووت، بێگومان ئەو قسانە دەچنە ناو ئەدەبی داهێنان با مەرجە ڕووکەشییەکانی شیعریشیان تێدا نەبێ، خۆ ئەگەر بە ماقوولیش نەزانرێ وا کتوپڕ دوو شاعیر بەرامبەر یەکتری دابنیشن و وەکو کۆتری هاقوو بۆ یەکتری بخوێنن، خۆ هەر شاعیرێک لەم دووانە کۆمەڵێک «شتی» خۆی هەیە، لە خەڵکی تر جیای دەکاتەوە، ئا لەم گفتوگۆیەدا ڕەچاوی ئەوە کراوە، ئەوەی مەلا وتوویەتی شەقلی شاعیرییەتی مەلای پێوەیە، بەتایبەتی لە ڕووی ناوەرۆکەوە، ئەوەی فەقێش وتوویەتی ئەدگاری شاعیرییەتی خۆی پێوەیە. ئەمە بێگومان پێش ئەوەی ببێتە شیعر هەر قسەی ڕووتە خەیاڵبازییەکەی ئەم دوو شاعیرەیە لە پاشانا بۆتە شیعر. خۆ ئەگەر بیریش بۆ ئەوە بڕوا شاعیرێک لەم دووانە بەناوی هەردووکیانەوە ئەم گفتوگۆیەی دروست کردبێ، لەو کاتەدا هەر کامەیان بووبێ ڕەچاوی «شتی» شاعیرەکەی تری کردووە. بەڵام هەرچۆنێ بێ ئەم گفتوگۆیە بەرهەمی دوو شاعیری گەورەی کوردە، ئەمانە

ڕەنگە مامۆستا و قوتابیش بووبن.

ئەم دیالۆجە شیعرییە لە شاری جزیرێ لە ساڵی ١٦٢١م لەلایەن مەلای جزیری و فەقێ تەیرانەوە ڕێکخراوە. وتەکانی هەر شاعیرێک لەم دیالۆجەدا خراونەتە ناو چوارچێوەی شەش نیوە دێڕ شیعر، قافیەیان (ا ب ا ب)یە.

هەردوو شاعیر کە دەکەونە گفتوگۆی شیعرییەوە لە پێشانا سڵاو لەیەکتری دەکەن:

فەقێ: سەلاما من حەقیرێ
سەدەفەک دڤێ تێکن
ئیرۆکە ل جزیرێ
حەققە کو ل (مەلێ) کن
هەلا کە ژ دەربا تیرێ
دەرمان هەیە کو لێکن.
مەلا: سەلامێن مەلایکەتان
بی حەدد و بێ حسێبن
شوبهەتی ئاڤێن شەتان
ژ (مەلا) ل (میم و حێ) بن
هەلاکێن ژ زەحمەتان
دەرمان ژ لام و بێ بن

ئینجا دەکەونە ڕەمز و داخراو و مەستوور و نهێنییەوە، هەندێ زاراوەی سۆفیزم بەکاردێنن (نەک داهێنانی سۆفیزم) بۆ ئەوە پەنا دەبەنە بەر ئەو تیپانەی لە سەرەتای هەندێ لە سوورەتەکانی قورئانا هاتوون. ئەم تیپانە دەکەنە ڕەمز نەک بۆ کردنەوەی نهێنییەکان بەڵکو پتر خەستکردنی نهێنییەکان کە ئەمە لە دوا جاردا دەبێ بەهەوێنی داهێنان لە گێتیی پڕ لە تەمومژی شەوقی نادیار کە تەنیا دڵ هەستی پێدەکا نەوەکو چاو. هەندێ جاریش بەشێوەییێک ئەم تیپە (حەرف)ە دروشمییانە بەکاردێنن پیاو بیر و خەیاڵی دەڕوا بۆ لای پێڕەوانی تەریقەتی حورووفی لە سۆفیزمی ئیسلامیدا کە مەلا پەرێشانی کورد نوێنەری ئەم ڕێکخراوە سۆفیزمە بووە لە ئەدەبی کوردیدا:

فەقێ: شەربەتا لام و بێیان
ئەز نادم ب حەیاتێ
مەعدەنا دال ڕێیان
دبارێن نەباتێ
زاهیر دکن مەعنێیان



ز حوسنا بوت ولاتێ
مەلا: ژ نەقشێ بوت ولاتان
مە سینە بوتخانەیە
تەعەییونا سیفاتان
تەجەللا قەلبێ مەیە
د عید و شەڤ بەراتان
ژوان را مە سەجدەیە
فەقێ: سەجدەیا شوکرێ جارەک
مە فەرزە د ویسالێ
نەپەردە نە ستارەک
ل بەر وەجهێ هیلالێ
(أحسن الله تبارک)
ژ سوورڕا وێ جەمالێ
مەلا: جەمالا نوورێن سافە
د وەجهێ تەجەللایێ
ب حەرفێن خوە کەششافە
زەمیر ددن مەعنایێ
حا میم عەین سین قافە
د ڕەمزا موعەممایێ
فەقێ: حێ یێن د حەفت حامیمان
نوقتەیان لێ پەیدا کن
ئیسمێ دو تاسێن میمان
دو میمان ژێ جوداکن
باڤێنە جەم دو جیمان
عیشقێ کو ژێ پەیداکن
مەلا: حەفت خومێ تەژی بادە
د مەیکەدا قیدەمێ
ژ خوما کو مەی ئرادە

عیشق ڕهته جاما جهمێ
لهوحێ لێ نوون و ساده
لهو فهیزێ دا قهلهمێ
فهقێ: ساقی ژ خهمرا ئهزهلێ
نوون و قهلهم ژێ ئهفراندن
دارێت لهوحا ئهووهلێ
ڕزق و نهسیب قهددراندن
ئهو بوو موراد مهسئهلێ
نهقشێ مهجاز سهووراندن
مهلا: نهقشێ مهجاز تلسمه
مهزههر ژ ڕهنگ میرئاتێ
سوورهت ل بال مه ئیسمه
مهعنا ب تهجهللاتێ
حهرفێن د نوورین جیسمه
کاف هایه د ئایاتێ
فهقێ: کاف هایه ئیسمێ کووره
توغرایه د تهنزیلێ
ب جیسمی کووهێ تووره
ئیجماله د تهفسیلێ
جهمال ژ عهینی نووره
کهوکهبه د قهندیلێ

ئینجا دێنه سهر «وێنه» و «جوانیی ڕاستهقینه». جوانیی ڕاستهقینه له ههموو وێنهیێکدا دهبینن، بهڵام وهکو ههموو سۆفییێک سهریان لێ دهشێوێ، دهکهونه بیابانی بێ پایان، ناچار پهنا دهبهنه بهر کردگار که کارگهری ههموو شتێکه و خاوهنی ههموو شتێکیشه.

مهلا: کهوکهبه دێم بهشهره
نوورهکه مونهززهه تێ
چ حوسنهک موسهووهره
ئیسمهکه ژ (الله) تێ



یهقین ب خوه مهزههره
چهرخهکه سهد حهرگهه تێ
فهقێ: خهرگهه ب من حیجابه
ستار دکت جهمالێ
عهورێ ڕهش و نیقابه
ل بهر وهجهێ هیلالێ
پهروانه لهو د عهزابه
مهحجووبه ژ شهمالێ
مهلا: شهمال تهعینی نووره
شهفهق کو لێ ستار تێ
پهروانه بێ دهستووره
ل چهرخی سهمادار تێ
حهیران سیڕرا غهفووره
ل جانفیدایێ یار تێ
فهقێ: یارێ حهقیقی خالیقه
چێن جانفیدا داڤێ کهڤین
ڕاست و دروست و سادیقه
چ ڕهنگ ب شووناڕێ کهڤین
قهنج و لهتیف و لائیقه
د باغێ ئیرهمدا ڤێککهڤین
مهلا: باغێ ژ نوو وهرق لێ
یار دێ ل وی زوهوور بت
سپێده یا شهفهق لێ
مهزههر ژ عهینی نوور بت
پرتهو ژ حوسنا حهق لێ
دا عهکس بێ قوسوور بت
فهقێ: عهکسێ ژ حهق دبینین
له دۆر وهجهێ مهحبووبان

ل حالەکێ نامینێن
ژ سیڕڕا وان مەتلووبان
گەھ دنالین گەھ دخوینین
دوورین ژ وەسلا خووبان
مەلا: فەریاد ژ دەستێ فەرقێ
د دوورین ژ سولتانان
تیرە ژ لەونێ بەرقێ
هەیبەتا وان خاقانان
ڕۆژە هاتییە شەرقێ
دنالین ژ کۆڤانان
فەقێ: کۆڤانێن میهرداران
بێ حەدد و بێ ئژمارن
تیرێن د وان هەساران
سەد جاران سەد هەزاران
خەدەنگێن وان نوو باران
نهێن و خەف دبارن
مەلا: نهێن دل د ڕەشیێن
تیرێن ژ سیاه گووشان
دو میر ب غەزەب دکشیێن
ل قەتلا مە بێ هووشان
ژ قاف و واو و سیێن
خەدەنگێن ئەسوەد پووشان
فەقێ: دوو نوون د سیەھ ڕەنگن
وان سەر ل مە دکێشان
دەربێن د وان خەدەنگن
ل قەلبێ مە دەروێشان
عاشق ژ دەست ب هەنگن
ز داغ و زەجر و ئێشان



مەلا: داغێن مە پوڕ د کولن
خەبەر ژێ نایێ گۆتن
یەنگیان چەرب ل دلن
هناڤ ژ بەر دسۆتن
کەمەندار ڕەش قاتیلن
گەز مە ل دل ب جۆتن
فەقێ: گەزمێن عەین و سادان
ب ئیشارەت ڕەمز و سڕڕن
کشاندن گۆشە بادان
مەحبووب د تیژ ئاوڕن
تیرێ د وان جەللادان
باتین د دل دفڕن

ئەوجا هەوڵی ئەوە دەدەن گێتیی نهێنی لە هەستی دڵ دەبینرێ لەگەڵ گێتیی ئاشکرا کە بەچاو دەبینرێ لە یەکتری نزیک بکەنەوە، جا ئەمە ئەگەر لە پەیکەری «پەری» و «دلبەر»دا ببینن بەلای هەردوو شاعیرەوە «نهێنی» و «ئاشکرا»، «پەری» و «دلبەر» هەموویان دەبن بەیەک «شت»:

مەلا: ئاوڕێن چۆتێ بەلەک
بەرقەکە ژ سەماواتێ
خورشیدە چەرخا فەلەک
هاتییە نێڤ میرئاتێ
ئینسانە ب سوورەت مەلەک
یان حوورە د جەنناتێ
فەقێ: حووری کو تێک جەمابن
پەری هەم د وێ گاڤێ
هەمو ژ ڕەنگ چرابن
تێزیکی شەمس و تاڤێ
ژ شەرما خویا نابن
ژ حوسناوێ گولباڤێ
مەلا: وان شەرمە ژ دێمێ زەری

عەقرەبان دەرب ل دل دان
خورشید ماه و موشتەری
پێرۆ د موقابیل دان
ئینسە ب شەکلێ پەری
یان حوورە سیفەت ویلدان
فەقێ: پێرۆ یەقین کو خالن
د عیقدا سورەییایێ
دو ڕۆژ و دو هیلالن
ل دێمی وێ لەیلایێ
بێ وەسف و بێ میسالن
د ڕەمزا شەکەر خایێ
مەلا: ب ڕەمز و گوفت و سوڕان
نەباتێ ئەو درێژن
عیشوەییێن لەعل و دەوڕان
لوئلوء شەکەر ب هێژن
خەدەنگێن د ئاوڕان
عاشقان د برێژن
فەقێ: عاشقێن لەب و لێڤان
شاباشە ژ خودێ ڕا
سەلوا و بەهـ و سێڤان
بەلچم ژ زیڤ و زێڕا
حەرامن خەوێد شێڤان
ل کەسێ موحبەت ڤێڕا
مەلا: کەسێ کو یەک دڤێتن
سوهتییە ب ئولفەتێ
شەڤان کوو وی خەو تێتن
ژ تیرا مەحەببەتێ
عاشق ل پەی وی تێتن



ژ جەزب و ژ فورقەتێ
فەقێ: فیراق تێک حەرقەتە
بەعیدە ژ خەیالێ
توو تاکە ب زەحمەتە
بولبول ژ بەر جەمالێ
گۆیین خەو قەت ناکەتە
کو دوورە ژ ویسالێ

مەسەلە بەلای هەردوو شاعیرەوە گەیشتنە بەیەکتری (ویسال = وصال). پەپوولە ناسووتێ بەڵکو لەپاش سووتان دەگاتە ژیانی جاویدانی.

مەلا: زەحمەت ب من ویسالە
عاشق ژ بەر جەزبەیێ
لەو تێت ب دەرد و حالە
ژ بەرقا شەعشەعەیێ
دەما کو تێت شەمالە
نەزەر دا پەروانەیێ
فەقێ: پەروانە لەو دمرت
خوەش نینە ئەو ب ژینێ
زەعیفە خوە ناگرت
تیژە بەرقا ئەڤینێ
ب پەردێ ناسەبرت
پەردە کەمالا دینێ
مەلا: پەروانە لەو سۆژی
ژ لەمعەیا جەزبا تێ
فیداکرن عومر و ژی
د کەشفا سەبەحاتێ
کو دا ژ نووڤە ڤەژی
باقی بت د حەیاتێ
فەقێ: حەیات ب من هەر وەسلە

دولات گەر بن لاتەک
موراد ب خوە هەر ئەسلە
تێکدا ببنە سیفاتەک
ژ هەڤ ئێک نینە فەسلە
واحید بمینت زاتەک
مەلا: واحید زاتەکی فەردە
تەجەللا ددا سیفاتان
ل عەینی دل نەزەر دە
ل جوملەی تەعیناتان
تەوەهوم بوویە پەردە
ب ئیسمێ بوت ولاتان

لە پاشانا هەردوو شاعیر لە دیالۆجە شیعرییەکەیاندا دێنە سەر پێداهەڵدانی دیمەنی شێخ و مورید و پیر و سۆفی و دەروێشان، وێنەیێکی خەیاڵاوی و ئەفسانەیی ڕۆمانتیکییانە دەگرن لە کۆڕی نهێنیی مەی نۆشانی خوداییدا.

فەقێ: لات سوورەتەکی حەقە
ژ ئەسمائێن حەققانی
ل بال من موحەققەقە
د نێف کەشفا سوبحانی
لاهووتە هەر موتلەقە
د ناسووتا ئینسانی
مەلا: ئینسان ب من ناسووتە
گەوهەر د نێڤ سەدەفێ
عالەما جەبەرووتە
شەمسە هاتی شەرەفێ
تەنەززول ژ لاهووتە
مەحبووبە جام د کەفێ
فەقێ: کەفا کوو کووز و تاس تێ
نازک و سپی زەندن



جاما کو مەیا خاس تێ
بنێرن تالیب چەندن
ڤەخۆن ژ دەستێ ڕاستێ
ب مەدحان مەحبووب خوەندن

ئەم دوو شاعیرەش وەکو هەموو شاعیرانی دیکەمان نایانەوێ لە ڕاست چیرۆکی هەمیشەیی «گوڵ و بلبل» یا «پەپوولە و چرا»ی گێتی چاو بنووقێنن، هەروەها گوڵزاریش لەبیر ناکەن چونکە نیشتمانی بلبلە و وێنەی بەهەشتی جاویدانییە لەسەر ڕووی زەویی ئێمە با نەمریش نەبێ.

مەلا: وەسفێن د مەحبووبان
ل داغێن کو ل حەیاتن
قووتە ژ بۆ قولووبان
گولاڤ قەند و نەباتن
ژ نەغما مەدحا خووبان
عاشق ب جەزبە هاتن
فەقێ: عاشق ب وەسف و مەدحان
د فیراقێ سەبری
نەسیم بێت ژ وان تەرحان
بولبول خوەهێ بگری
خوون دێ دەربت ژ جەرحان
ب داغێن کول بمری
مەلا: بولبولێ وێ گولشەنێ
ژ ئەزەل ئەو د بێژن
حەتتا ئەبەد ژ مەعدەنێ
گەوهەراندا برێژن
حەرفەک ژ وەسفان تەنێ
عالەم تێک ناپەرێژن
فەقێ: جەماکن تێک عالەمێ
هەموان ب ئوستادکن
حەرفەک لەوحێ قیدەمێ

بینن ب شەرح سەودا کن
نائێتە بەر قەلەمێ
بەحران ئەر ب میدادکن
مەلا: نەسرین و گول تەبەقەک
سەحەر ژ باغێ گولان
ژ نەستەران وەرەقەک
بەسە مە ساحیب دلان
عوروفخواهی سەبەقەک
چێتر ژ سەد سیجلان
فەقێ: ئەحسەن ژ نەو سەبەقان
قەلەم ژ قەند و نەباتێ
ل سەحیفا وەرەقان
درێژن ئاڤا حەیاتێ
دەست ب دەست ژ تەبەقان
مەلەک تێنە جەنناتێ
مەلا: نەفەسا تە ژ عەنبەرە
زەباد و میسک درێژن
چ شاخێ نەی شەککەرە
نەبات و قەند درێژن
نوقتا تە خوە گەوهەرە
سەد بار گەوهەر درێژن
فەقێ: گولم د دەستی خاران
ب ئیسمێ (موحەممەد) ناڤم
بولبولم د گولزاران
ژ عیشقێ لەو زەر باڤم
د ڕەمزا میهرداران
تو ڕۆژی ئەز هەتاڤم
مەلا: دوورم ژ گولێن ب خوناڤ
لەو زەر شوبهەتی بهم
سووسنا عرق ژ گولاڤ



د فورقەتێ دبژهم
ژ میهرداران تەڤاڤ
تو هەتاڤی ئەز سهم

هەردوو شاعیر بەدەربڕین و خستنەڕوو سۆزێکی قوول و خۆشەویستییێکی بێ سنوور بەرامبەر بەیەکتری دەنوێنن و بەم دێڕانە دوایی بەدیالۆجە شیعرییە بەرزەکەیان دێنن.

فەقێ: بریندارێ عیشقێمە
دوورم ژ سها بهان
دزانن مەدداحێ کێمە
د هەزار و یەک و سهان
(١٠٣١ه)
سەناخوانێ (مەلێ) مە
ل هەموو عەرد و جهان
مەلا: چەندی کو د گەڕهم
دکێشم سەبر و حیرێ
شوبهەتی چەنگ و ژەهم
هەلاکم ژ دەربا تیرێ
سەناخوانێ (فەقە)هم
ئیرۆکە د جزیرێ

مەلای جزیری بەهەردوو بەرهەمە دیالۆجە شیعرییەکەی «دیالۆجی لەگەڵ میری بۆتان» و «دیالۆجی لەگەڵ فەقێ تەیران» کەلێنێکی یەکجار گرنگی لە مێژووی ئەدەبی کوردی پڕ کردۆتەوە، ناوەرۆکی جیاوازی هەڵبژاردووە بۆ دیالۆجەکان، ئەوەی لەگەڵ فەقێ تەیران ڕەنگدانەوەی لایەنی خەیاڵی سۆفیزمە بێ پایانەکەی هەردووکیانە، کۆن نابێ لەبەر ئەوە لەسەر زاری خوێنەری کورد ناکەوی و هەمیشە زیندووە.

***

مەلای جزیری یەکەمین کەس نییە لە کوردستانی باکووردا شیعری بەرزی بەزمانی کوردی داهێنابێ، بەڵکو یەکێکە لە سێ کوچکەکە، دوانەکەی دیکەیان عەلی هەریری (١٥٣٠ - ١٦٠٠) و فەقێ تەیران (١٥٦٣ - ١٦٤١)ن. ئەم سێ شاعیرە ژیانی شیعرایەتییان کەوتۆتە نیوەی دووەمی سەدەی شازدەم و نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەم. عەلی هەریری شیعری کەمە، زانیاری لەبابەت ژیانیەوە کەمترە، هەرچی فەقێ تەیرانیشە وەک شاعیرێکی گەورە و خاوەن قوتابخانەییێکی تایبەتی دامەزرێنەری لایەنی شیعری میللییە لە ئەدەبی کوردیدا، لەلایەنی هونەرییەوە دەچێتەوە سەر جەوهەرەکانی خۆماڵی بەتایبەتی

لەڕووی کێش و قافیە و ڕیتم و زمان و تەعبیرەوە لەبەر ئەوە مەلای جزیری بەداهێنەرێکی گەورە دادەنرێ چونکە لە ڕووی ڕوخسارەوە شیعری ئیسلامەوی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە بەکێشی عەرووز و یەکێتی قافیە و ڕەوانبێژی تایبەت بەو شیعرانەی بەئیسلامەوی ناویان دەبەین. ئینجا بابەتەکانی شیعر غەزەل و قەسیدە و چوارین و موستەزاد و تەرجیع بەند و هەموو بابەتەکانی دیکە.

لەڕووی ناوەرۆکیشەوە مەلای جزیری داهێنەر موناجات و نەعت و وەسف و پێداهەڵدان بوو، لەمانە لەهەموویان گرنگتر ئەدەبی سۆفیزمە ئەمەیان بەڕوونی لە بەرهەمە داهێنراوەکانی مەلای جزیری بەرچاو دەکەون، بەمە دەبێتە شاعیرێک لە شاعیرە هەرە گەورەکانی نەتەوەی کورد.

## بەشی سێزدەم

# خانی

**١٦٥٠ - ١٧٠٧**

### مێژووی ژیان

شاعیر و ڕۆشنبیری گەورەی کورد خانی ناوی ئەحمەد بووە، کوڕی ئەلیاس کوڕی ڕۆستەم نازناوی شیعری لە هۆزی «خانیان» وەرگرتووە. بەشێکی ئەم هۆزە لە دەوروبەری ناوچەی بۆتان بوون، بەڵام بنەماڵەی شاعیر باریان کردووە بۆ شاری بایەزید.

ئەحمەدی خانی لە ساڵی ١٦٥٠ لە شاری بایەزید لەدایک بووە. وەک لە سەرچاوەکانی ژیان و کردەوە ئەدەبییەکانی شاعیر دەردەکەوێ باب و باپیرانی لە ڕووی داراییەوە ژیانیان ئاسان بووە و بە بەختیاری ژیاون.

مەڵبەندی ڕۆشنبیری لەو سەردەمانەدا حوجرەی مزگەوت بووە، شوێنێکی وەکو بایەزید مزگەوتی گەورە و جێگەی خوێندنی بەرچاوی لێ بووە. ئەحمەدی منداڵ لە یەکێ لە حوجرەی ئەم مزگەوتانە کە مزگەوتی مرادییەیە دەخرێتە بەر خوێندن. پرۆگرامەکانی خوێندنی بەرایی و ناوەندی لە بایەزید دەگەیەنێتە ئەنجام، ئینجا وەکو ڕەوشتێکی کوردەواری لە قۆناغی خوێندنی سوختەییدا ڕوو دەکاتە ئەو شارانەی مزگەوت و حوجرەی بەناوبانگیان لێ بووە و زانایانی ئایینی زیرەک و ناودار وانەیان تێدا وتووتەوە. لەمانە لە شارانی وەکو ئورفە و ئەخلات و بدلیس لای زانا گەورەکان زانستیی ئایینی وەرگرتووە.

لە دوای ئەم گەشت و گەڕانەی فەقێیەتیدا ڕووی کردۆتەوە بایەزیدی زێدی لەدایکبوونی، لە پاش ماوەیێک بەرەو شاری جزیرە چووە و خوێندنی لەوێ تەواوکردووە و ئیجازەی دوازدە عیلمی مەلایەتی بەپێی بەرنامەی خوێندنی ناو کوردایەتی وەرگرتووە.

لەپاش تەواوکردنی خوێندن مامۆستایی هەڵبژاردووە وەک پیشەیێک، ئیتر بووە بەمامۆستا لەیەکێ لە مزگەوتەکانی شاری بایەزید، ئەمڕۆ مزگەوتی دۆغۆ بایەزید (Dogu Bayezit)ی پێدەڵێن. ئەوەی لێرەدا سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە هەستی کوردایەتی وا شاعیری هاندابوو بەپێچەوانەی مەلایانی ئەو ڕۆژگارە لەسەر دەرگای ئەو مزگەوتەی وانەی تێدا دەوتەوە ناوی مزگەوتەکە لە پاڵ زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی عوسمانی بەزمانی کوردیش بنووسێ.

خانی وەک مامۆستاییێک وانەی لە حوجرەی مزگەوت بەزمانی کوردی بەمنداڵانی کوردی وتۆتەوە، بۆ ئەم ئامانجە «فەرهەنگی نووبهار»ی بەعەرەبی و کوردی نووسیوەتەوە بۆ ئەوەی شاگردانی حوجرە فێری زمانی عەرەبی ببن. لەپاش کۆچی دوایی شاعیر یەکێ لە قوتابییەکانی ناوی ئیسماعیل بووە بۆ ماوەی بیست ساڵ لەجێیی مامۆستای دانیشتووە و وانەی ئایینی وتۆتەوە، بۆ ئەوەی جێیی مامۆستای کوێر نەبێتەوە.



وەک لەو زانیارییانە دەردەکەوێ کە لەبەر دەستماندان، شاعیری ئەم ماوەیەمان ئەحمەدی خانی هەموو ژیانی بۆ خوێندەواری و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری و هۆشیاریی سیاسی خەرج کردووە لە کۆمەڵی کوردەواریدا. ئەمە دوو لایەنی ڕووناکی بووە، یەکەمیان بەرهەمهێنانی داهێنانی ئەدەبی، واتە شیعری، دووەمیان فێرکردن و پێگەیاندنی منداڵان و لاوی کورد لە ڕووی خوێندەوارییەوە.

شاعیر لە مەڵبەندی لەدایکبوونی، شاری بایەزید، لە ساڵی ١٧٠٧م کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە. ئەو زانیارییانەی لە ناوەوەن ئەم مێژووە بەڕاست دەزانن، جگە لەمە بەڵگەیێکی تریشمان بەدەستەوەیە، پشتگیری ئەم ڕایە دەکا ئەویش ڕستەی عەرەبی «طار خانی الی وبه» کە بۆ مردنی شاعیر دانراوە بەحسێبی ئەبجەد دەکاتە ساڵی (١١١٩ھ)، ئەم ساڵە بەرامبەر بەساڵی ١٧٠٧ی مەسیحییە، یا ڕاستتر کەوتۆتە نێوان هەردوو ساڵی (١٧٠٧ و ١٧٠٨)ی مەسیحییەوە.

### دیوانی خانی

تا دوای جەنگی دووەمی گێتی و ناوەڕاستی سەدەی بیستەم خانی تەنیا بەشاعیری «مەم و زین» و «نووبهاری بچووکان» و «عەقیدا ئیمانێ» ناسرابوو، بەتایبەتی لە کوردستانی ئێران و عێراقدا، ئەگەر لە دەسنووسدا شیعری هەبووبێ و لە ڕۆژنامەی «ژین»ی ئەستەموولیش هەندێکی بڵاوکرابێتەوە، خەڵکی ئاگادارییێکی ئەوتۆیان لە شیعرەکانیدا نەبووە، لەبەر ئەوە تەنیا حسێبی «مەم و زین»ی بۆ دەکرا و بەشاعیرێکی گەورە لەقەڵەم دەدرا.

بێگومان لەو سەردەمانەدا ڕۆشنبیرانی کورد هەندێ موبالەغەیان لە شاعیریەتی خانی دا دەکرد، هۆی ئەمە ئەوەبوو لە دیباجەی «مەم و زین»دا خانی جۆرە کوردایەتییێکی سەردەمی خۆی بەشێوەییێک کردووە وەکو شاعیرێکی گەورە بکەوێتە ڕوو. بەڵام لەو کاتەوە کە کۆمەڵە غەزەل و قەسیدەکانی سەر بەقوتابخانەی عەلی هەریری و مەلای جزیری لە کوردستانی سەروودا کەوتنە ناوەوە، هیچ گومانێک لەوەدا نەما کە شاعیرییەتی خانی تەنیا لە «مەم و زین»دا ناکەوێتە ڕوو، بەڵکو غەزەل و قەسیدەکانی لە پلەییێکی جوانکاری کلاسیکی ئەوتۆ دان ئەحمەدی خانی دەخەنە پاڵ شاعیرە کلاسیکییە هەرە گەورەکانی ئەدەبی کوردی. بەڕاستی دیاردەییێکی ماقووڵ و بەجێ نەبوو شاعیرێکی وەکو خانی خاوەنی «مەم و زین» بێ و غەزەل و قەسیدەی مەلای جزیری ئامێزی نەبێ.

ئەم تەلیسمەی شیعری ئەحمەدی خانی لە ساڵی ١٩٦١ لەسەر لاپەڕەکانی کۆواری زانستی ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی لە شاری سانت پیترسبورگ کرایەوە. ئەمە بۆ یەکەمین جار بوو کوردناسی ئەوروپا ئاشنایەتی لەگەڵ غەزەل و قەسیدەکانی خانی پەیدا کرد. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە لەناو لاپەڕەی ئەو دەسنووسانەی ئەلیکساندر ژابا دەستی خستبوون و کۆمەڵێک غەزەل و قەسیدەی خانی پارێزرابوون. کارگەری ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی مارگریت ڕوودێنکۆ ماوەیێک خەریکی ئەو شیعرانە بوو لە پاشانا حەوت پارچە لە غەزەل و قەسیدەی دەسنووسەکانی لە «کۆواری نەتەوەکانی ئاسیا و ئەفریقا» (ژمارە ٣، ساڵی ١٩٦١)ی بڵاوکردەوە. تێکستی شیعرەکان بەتیپی لاتینی و وەرگێڕانی بەزمانی ڕووسی بڵاوکرانەوە، ئەوەی جێگەی سەرنج ڕاکێشانە لەم لایەنەوە ئەوەیە نرخی

وتارەکە لەوەدایە کە کوردی ئاشناکرد بەو بەرهەمە گرنگەی خانی کە تا ئەو کاتە نەناسراو بوو، ئەگینا وەرگێڕانە ڕووسییەکەی باش نییە، چونکە لەگەڵێ لە مانای شیعرەکان نەگەیشتبوو، جگە لەوەی دێڕی تەواو لەناو شیعرەکاندا بەدی دەکرێن خاوەن وتار تێیان نەگەیشتووە و ناچار بووە جێی وەرگێڕانە ڕووسییەکانیان بەبەتاڵی بەجێ بهێڵێ.

هەرچۆنێ بێ ئەمە بووە هۆی ئەوەی لەلای خۆشمان لە نیشتمان هەوڵ بدرێ بۆ دۆزینەوەی بەرهەمی دیکەی غەزەل و قەسیدەی خانی. لە ڕۆژگاری ئێستاماندا دیوانی ئەحمەدی خانی گەیشتۆتە قەوارەیێک دەتوانین شانازی پێوە بکەین و بەیەکێک لە شاعیرە کلاسیکییە گەورەکانمان دەژمێررێ.

بابەتی غەزەل بەمانای پارچە شیعر یا «شیعری لیریکی» لە سەردەمی ئەحمەدی خانیدا زیاتر پێشکەوت، چونکە ئەم جۆرە شیعرە پێوەندی بەرۆشنبیری کوردییەوە هەبوو و هەوڵی پێشکەوتنی دەدا، شیعرەکانی نموونەی ژیری و دانایی و نیشتمانپەروەری بوون، زانستی و زانیاری لەلای شاعیر مایەی پێشکەوتنی کۆمەڵ بوون.

خانی لە غەزەلەکانیدا کەمتر وشەی قورسی پڕ لە نهێنی بەکارهێناوە، بێگومان لە بنجدا مەبەسی لەمە بڵاوکردنەوەی خوێندەواری بووە لەناو کۆمەڵی کوردەواری بە زمانی کوردی، چونکە ئەو زمانە لەڕوو نەبووە، زیاتر بایەخ بەزمانانی عەرەبی و تورکی عوسمانی و فارسی دراوە، لەبەر ئەوەی ئەمانە زمانی ئایین و ئەو فەرمانڕەوایانە بوون کە دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو لە کوردستاندا.

**شیعری دانایی**

شەقڵی بیری قووڵی فەلسەفییانە و ئامۆژگاری پیری دنیادیتەی پڕ لە مانای دانایی لەو بڕە شیعرەی خانی کە لەبەر دەستمان دایە، ڕوون و ئاشکرایە.

لە پارچەیێکی پێنج دێڕە شیعریدا دەڵێ:

مــــیــــرێ مــەجلیس نەکــەنت مــوتریبێ گــوویا چ بکت
غــــونچـــەی خـــەندان نەبتن بولبـــولێ شـــەیدا چ بکت
نەینکا حـــوسنێ بتــــان لازمـــە ســــاحـــێب نەزەرەک
کــــەسێ بینا کـــــو نەبت دلبــــەرێ زیبـــــا چ بکت
بێ کــەرەم ناچیــتــە تیــپــا عــەدووان مــەردێ شــەجیع
تیـــــغێ ئاهێـــــختـــــە بێ دەســـــتی تەواناچ بکت
تالیـــــبی عـــیلم و کـــــەمـــــال نەبتن قـــابیلێ فـــەیز
حـــــیکمـــــەت و تەربیـــــەتا عــــالیـــــمێ دانا چ بکت
تەبعێ (خــانی) ســەدەفــا، گــەوهەرێ عــیــرفــانە وەلێ
مــــەتن خـــوانەک نەبتن ســـاحـــیـــبێ مـــەعنا چ بکت



لەم پارچە شیعرەدا خانی دوو دیاردە لە ژیانی ئادەمزاددا بەرامبەر بەیەکتری دادەنێ، ئەگەر یەکێکیان لە ناوەوە نەبێ ئەویتریشیان بوونی نابێ، بەڵام ئەو دیاردانەی شاعیر هەڵوێستی جوانکارین، ئەو شتانەن دەبنە هەوێنی داهێنانی شیعر و هونەرەکانی دیکەی جوانی. دیاردەکان ئەوەیە ئەگەر خۆشی نەگەیەننە گیانی میر ئەرکی گۆرانیبێژ بەفیرۆ دەڕوا. شاعیر لەم پارچە شیعرەدا ئەگەری زۆرە، ئەگەر غونچەی پشکووتوو لە باغا نەبێ بلبلی شێتی دڵداری دەبێ چی بکا! ئاوێنەی جوانی جوانان لە ناوەوە نەبێ کەسی خاوەن بیر و هۆش چی بکا! ئەگەر کەسی چاو ساغ لە ناوەوە نەبێ، دلبەری جوان چی بکا! کەسی ئازا بێ لە خۆبوردن هەڵمەت بۆ سەر دوژمن نابا، چەک و سیلاح بێ دەستێکی بەتوانا چی بۆ دەکرێ! ئەگەر قوتابی عیلم و مەعریفەت توانای گۆڕان و پەرەسەندنی نەبێ دانایی و تەربیەتی زانای گەورە چی بکا!

لە دواییدا شاعیر لە مەدحی خۆیدا دەڵێ: شیعری خانی بەردی بەنرخ و گەوهەر و عیرفانە، بەڵام ئەگەر کەسێک نەبێ بیخوێنێتەوە و لە ماناکانی بگا، خاوەنی مانا واتا خانی خۆی چی بکا!

خانی شیعرێکی لەسەر شێوەی چوار خشتەکی داناوە، بریتییە لە پێنج بەند (پێنج چوار خشتەکی) قافیەی بەندەکان بەم جۆرەیە:

سێ دێڕی یەکەمی هەموو بەندێک لەسەر یەک قافیەیە (ا ا ا)، دێڕی چوارەم لەهەر پێنج بەندا ئەویش لەسەر یەک قافیەیە (ا ا ا ا ا)، واتە بەندی یەکەم لە ڕووی قافیەوە (ا ا ا ا)یە، بەندەکانی دیکە (ا ا ا ب)یە. لە شیعرەکەدا خانی دەڵێ:

زاهیـــــدێ خـــــەلوەت نشین پابەندێ کــــرداری خــــوەیە
تاجـــــیـــــرێ ڕیحلەت گـــــوزین در بەندێ دیناری خــــوەیە
عــــاشـــــقێ دلبـــــەر حـــــەبین دل ناری دلداری خـــــویە
دا بزانی هەر کــەســەک بێ شــوبهــە غــەمــخــواری خــوەیە
بێ عــەمــەل تو ژ کــەس مــەکــە هیــڤی عــەتا و هیــمــمــەتێ
بێ غــەرەز ناکــێــشتن قــەت کــەس ژ بو کــەس زەحــمــەتێ
کــــەس نەهن قـــەت هەڵگرت بارێ تە ئەوبێ ئوجــــرەتێ
گـــەر چ عــــیـــســـابت ئەوێ فـــیکرا کـــەروباری خــــوەیە
هوشـــیـــار بی دانەکی تو عــومــرێ خــوە بێ حــاســیل تەلەف
لەو کـــو ناکت فــائیـــدە مــال و گــەنج و ئەولاد و خــەلەف
مـــاجـــەرایا (خـــدری) دیواری یەتیـــمـــا بوو ســـەلەف
ڤی زەمــانی هەر کــەســەک مــیــعــمــاری دیواری خــوەیە
جــا نەزەر کــە عــیــبــرەتێ پێــلا کــو واقــیع بت ســەواش

گـەر نەبیتن ئیلتـیـفـات و مـووچە و دەبر و مـەعـاش
جندی یێ ڕمـبـازی فـارس نادەتن جـانی بەلاش
ساعـەتا سـەربازی یێ هیـڤی ژ سـەرداریێ خـوەیە
(خـانی)یا زایع مـەکـە وەختـێ خـۆ ئەی نادان عـەبەس
بێ تەلەب نابی ژ وەسلێ بەهرەمـەند ئەی بولهـەوەس
سـانیـعێ مـوتلەق کـو نینە ئیـحـتـیـاجـەک وی ب کـەس
لوتف و ئیـحـسـانا ژ وی دەرهەق تەلەبکاریێ خـوەیە

لەم شیعرەدا خانی لەسەر ئامۆژگارییە قووڵ و پڕ ماناکانی دەڕوا و ئەوە دەردەخا کە پێشکەوتن و هێنانەدی هیوا و ئامانجی گەل و ئاسایشی خەڵک و هێمنی کۆمەڵ پێوەندی بەکۆشش و هەوڵ و تەقەڵای تاکی کۆمەڵەوە هەیە، ئەمەیە مەدەنیەت دروست دەکا.

ئامۆژگاری گشتی کە وێنەی لە بنج و بناوانی کۆمەڵەکەوە وەرگرتووە ڕەنگە هەندێ سادە بێ و هەموو کەسێک بۆی بچێ، بەڵام ئەحمەدی خانی خستوویەتییە قالبێکی هونەری شیعری ئەوتۆوە وەکو داهێنانێکی شیعری بەرز دێتە بەرچاو. بەلای شاعیرەوە کاری ئادەمزاد لەسەر سوود و قازانجی کەسێتی وەستاوە بەڵام دیاردەیێکی کۆمەڵایەتییە بۆیە دەبێتە هۆی پێشکەوتن، ئەمە بەلای شاعیرەوە لە قاووغی تیۆرییەوە ناچێتە دەرەوە، لایە پراکتیکییەکەی گیروگرفتی دروست کردووە، هەموو شتێکی کۆمەڵ لەجێی خۆی نییە بۆیە دەکەوێتە گێتیی ڕەشبینییەوە بەلایەوە کۆمەڵ بەجۆرێک شێواوە، شێوان بووە بەدەستوور و نەشێوان لە قاعیدە دەردەچێ، ئیتر بەخۆی دەڵێ: ئەی نەزان و شێت وەختی خۆت بەفیڕۆ مەبەسەر، خراپییەکە دەستوورە و چاکییەکەی تۆ لە دەستوور دەرچوونە.

خانی لە قەسیدەیێکی دیکەیدا خۆی وەکو دانایێکی شارەزا لە گێتی سۆفیزم پیشان دەدا. ئەم قەسیدەیە زیاتر خانی وەکو شارەزایێک لە شەریعەت و تەریقەتدا دەخاتەڕوو، نەک داهێنانێکی شیعری بخوڵقێنێ لە شیعری عیرفانیدا وەکو ئەوانەی جەلالەدینی ڕۆمی و ئیبنولفاریز وتوویانە.

شاعیر قەسیدەکەی بەگێڕانەوەی حیکایەتی خەلق (خلق) دەست پێدەکا، لەلایەن کردگارەوە:

نەقـقـاشێ ئەزەل ڕۆژا سـەر لەوحـەیێ ڕەنگیندا
پەرگـاری د دەسـتـان بۆ سـەرسـەفـحـە کـو تەزیینـدا
تەزهیـبێ دەر ئەفـشـان کـر سـەر لەوحێ کـیـتـابا عـیـشق
ڕەسـمـا ئەزەلێ کـێـشـا نەقـشێ خـوە نوالیندا
دیبـاجـە کـو ئینشـا کـر، فـەهرەسـتـە کـو ئیـمـلا کـر
جلدێ ژ عـەناسـیـر بەست نەفـخـەک ب سـەفـالیندا
ئەرواح و مـەلەک هاتن وەسـتـان ل دەبسـتـانێ



(لا علم لنا) گـۆتن ئەبجـەد ب خـوە تەلقـیـندا
وان سـادە ڕوخـان مـەشـقێ عـیـشق کـو تەمـەننا کـر
خـەتتـاتێ ژ (حـسن الخط) سـەر مـەشـقـەکێ زێڕیندا
مـا سـوجـدە تەنێ من بر بەر سـووڕەتێ مـەحـبـووبان
ئیـبلیـسی نەبر سـوجـدە لەو مـایە د نەفـریندا

وەکو لەم بڕە شیعرەدا بەڕوونی دەردەکەوێ خانی دروستکردن (خلق) تەنیا بەپێی بینینی شەریعەت نابینێ، بەڵکو سۆفیزمیش تێکەڵ بەو دەکا. بەڕاستی لەوەدەی باس لە کاری کردگار دەکا بۆ دروستکردنی گەردوون (بوون) لەگەڵ ئەوەدا دڵداری سۆفیزم بەکردەوەی کردگار دەزانێ.

لەکاتێکدا ئایینی سەر نەنواندنی شەیتان بەرامبەر بەخودا چونکە ئەوی لە ئاگر دروست کردووە و ئادەمزادی لە خۆڵ دروست کردووە بەتاوانێکی گەورە دەزانێ، دەبینین خانی ئەمە تێکەڵ بەدڵداری سۆفیزم دەکا بەوەی کردگار کە لە مەشقی دروستکردنی جوانان بووەوە و ئەمانەبوون بەرەمزی کردگار خۆی، ئێمە سوجدەمان بردە بەر ئەو جوانانە، بەڵام شەیتان سوجدەی نەبرد لەبەر ئەوە نەفرەتی لێ کرا.

شاعیر بەم دێڕانە کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

ئەز چـوومـە دەرێ دێـرێ مـن دی کـو (روح اللە)
تەکـاریێ مـوسـەووەر بۆ هەتـتـاکـو نە هالیندا
وان جـوملە (أنا الحق) گـۆت من واحـیـدێ مـوتلەق گـۆت
سـاقی ب خـۆ ئەز گـرتم، جـامـا مـەیێ نۆشـیندا
من نۆشـیی و سـەر خـوەش بووم (في الحال)ی مـوشـەووەش بووم
ئەز چار و نەهـ و شـەش بووم، من تەکـیـە ب بالیندا
هەر چ کـومـە بەر لێ کـر هندی مـە نەزەر لێ کـر
من سـەیرەک ل یەکێ کـر، لەو رامـە دل و دیندا
من دی هەمـە یەک پرتە و سـاری د مـەزاهیـردا
مـومکین هەمـە ژی پور بو ئەمما نە د تەمکیندا
ئەو بو ژ زولەیخـائێ لەو دیتـە د یووسـفـدا
مـەجنوونی د لەیلائی فـەرهادی د شـیـریندا
مـیـسـبـاحی ئەبەد من دی ئیـرۆکـە د قـەندیلێ
کـونجـا ئەزەلێ من دی مـەکنوون د گل و تیندا
مـەعـزوورە ئەگـەر سـۆفی بو مـونکرێ مـەحـبـووبان

گەر دێ چ تەسەووڕ کەت سیڕڕا کو د دوزیندا
شاهید بی تو ئەی زاهید مەحبووبە پەرستم ئەز
بێ شاهید و مەی نابم شێخێ مە ئەڤ ئاییندا
جانا ژ جەمالا تە ئەز دێ کو بکەم سەبرێ
شێخان و (أولو العرفان) جانێ خۆ د کالیندا
جانی ژ تە ئەی (خانی) جانان کو ب خوازیتن
ها نەقدە ل سەر خانی (في الحال)ی د مزگیندا

لەو شیعرانەدا خانی وەستایانە هەندێ هەڵوێست و ئێسگەی گێتی سۆفیزم دەدۆزێتەوە لەوانەیە هەندێکیان بەر گوێی خەڵکی کەوتبن و پێش خانی وترابن، بەڵام خانی بەرگێکی دووراوی دەستی خۆی بۆ دروست کردوون، ئەو بەرگە بەزمانی کوردییە پێش ئەو شاعیری کورد بۆی نەچووە، لەبەر ئەوە شیعرەکە بەوەسفێکی ڕازاوەیی کوردی دەکەوێتە بەرچاو.

هەندێ لە بەسەرهاتی دڵداری لە حیکایەتی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاست هی وەکو «یووسف و زولەیخا» و «لەیلا و مەجنوون» و «شیرین و فەرهاد» و هی دیکە خراونەتە سەر بەرهەمی ئەدەبی سۆفیزم، لەم پارچە شیعرەدا خانی هەرسێ چیرۆکە شیعرییەکەی بۆ یەک مەبەس بەکارهێناوە، ئەویش دڵداریی سۆفیزمییە، بەڵام ئەگەر لای مەجنوون و فەرهاد دوولایی بێ واتە لەیلا و شیرینیش بەشدارن لەم چیرۆکی ئەڤینییەدا، دەبینین مەسەلەی دڵداری یووسف و زولەیخا یەک لاییە، ژنەکە یا کچەکە گرفتاری یووسف بووە، بۆ یووسف دەبوو گیرۆدەی زولەیخا نەبێ چونکە لەناو تاقیکردنەوەی کردگاردا بوو، خودا بەپێغەمبەری خۆی هەڵیبژاردبوو و تووشی جوانێکی وای کردبوو هیچ نێرینەیێک نەتوانێ بەرگری لە خۆی بکا بەرامبەر بەم جوانە ئەفسانەییە، بۆیە ئەگەر بەڕاستیشی نەبووبێ دەبوو خۆی لەو کچە نزیک نەکاتەوە.

کەسایەتی شیعری خانی خۆی لە چوارچێوەی بیری قووڵی فەلسەفی ئامێز و قسە و بۆچوونی دانایانە دەردەخا، وەسفی سۆفیزم بۆ بەهێزکردنی وێنەی شیعری داهێنراو بەکاردێنێ، ئەم دیاردانە لە ئەدگاری هەموو قەسیدە و غەزەلەکانیدا دەردەکەون.

**غەزەل و قەسیدە**

بەشی هەرە زۆری بەرهەمی شیعری خانی وەکو هەموو شاعیرانی دیکەی کلاسیکی لەم بابەتەیە. لە ڕووی ڕوخسارەوە ئەم جۆرە شیعرە لە ژمارەی دێڕە شیعرەکانی ناوی زاراوەیی وەردەگرێ، هەموو غەزەلێک لە پێنج دێڕە شیعر پێکبێ تا دەگاتە هەژدە دێڕ شیعر غەزەلی پێدەڵێن، لە دوای ئەو قەسیدەی پێ دەڵێن. بێگومان هەر غەزەل و قەسیدەیێک لەسەر کێشێکی عەرووزی دەبێ، لە قافیەشدا یەکێتیی قافیە دەبێ.

لە شیعرێکیدا خانی دەڵێ:



ئەی ئاییەنەئێ دل ب جەمالا تە موجەللا
سەد سەفحە ب یەک زەڕڕە ژ نوور تە موتەللا
ئینسان ژ تە بو عالەمێ کوبرا کریە نوسخە
لەو موزفیەکێ ژ تو دکێی عەرشی موعەللا
وەحدەت ب حبێ کیسرەتێ ئەعیانێ مەزاهیر
هەر سەد سیفەتان دکەتن کەشف و تەجەللا
لەو (مختلف القول) و عەمەل بوونە خەلائیق
کافر ژ سەنەم بوونە ب ناڤێ تە تەسەللا
سیڕڕا خوە نیهانی تەکودا (ئەحمەدی خانی)
ئەز غەیری بەری شود ب تو ئاوەر دتەوەللا

لەم شیعرەدا خانی ڕوو دەکاتە دڵ و موناجات لەگەڵ ناوەرۆکیدا دەکا، ئەو ناوەرۆکەی لە ئاوێنەدا ڕەنگی دەبینێ، لەبەر ئەوەیە وەکو بڵێی لەگەڵ ئاوێنەکەدا قسە دەکا، بۆیە بەئاوێنەی دڵ ناوی دەبا چونکە ئەوەی لەناو دڵ دایە وێنەکە پیشانی دەدا.

ئەستووری بۆچوونی خانی کە ئاوڕدانەوەیێکی سۆفیزمی تێدایە لە هەندێ لە بیروڕاکانی شێخ محیەدینی کوڕی عەرەبی (١١٦٣ – ١٢٤٠م) دەکا، چونکە ئەو سۆفییە گەورەیە بت پەرست بەمولحید حسێب ناکا، ئەو لەو باوەڕەدایە بت پەرست لە شێوەی بتەکەیدا وێنەی نادیاری کردگار دەبینێ.

لە غەزەلێکی تریدا خانی دەڵێ:

سەیدێ چەنگالا سەرێ زولفا شەها شەهبازم ئەز
مەستێ جانا عیشوە یا شەهنازێ نازک نازم ئەز
ڕەمز و ئیعجازێ د خووبان بێ عیبادەت سەح دکم
مورشیدێ کامیل ئەزم ئیرۆکە ساحێب ڕازم ئەز
بەیزەیا ئەز تێ عەبەس بوو، ئاشیانا من قەفەس
گەرچی دل پڕ من هەوەس بوو بێ پەڕ و پەروازم ئەز
ڤێ حەیاتا عیبرەتێ چ بکم بەقا نینن ژ بۆ
لەو شەهیدێ غەمزەیا وێ دلبەرا تەننازم ئەز
دەردمەندەک من دڤێتن هەم نەفەس بت (خانی)یا
کو مە هەمدەستەک هەبیتن سازێ خوەش ئاوازم ئەز

لەم شیعرەدا خانی سیفەتی ئادەمزادی تەواو و بێ کەموکوڕی (سوپەرمان) لەخۆیدا کۆدەکاتەوە.

شاعیر شای دڵدارانە، سەرخۆشی نازی دلبەرە، دانای بێ هاوتایە، هەر ئەوە لە ڕەمز و ئیعجازی جوانان دەگا. بەڵام ئەمە هەمووی بێ سوودە، مەڵبەندی ژیانی بەندیخانەیە، بێ پەڕ و باڵە، ژیان وەفای بۆ کەس نییە بۆیە شەهیدی غەمزەی شۆخی جادووگەرە. گەورەیی شاعیر خەیاڵە چونکە خۆی لە خۆی دەگا و خەڵکێکی کەمیش تێی دەگەن واقیعەکە پێچەوانەیە، تێ نەگەیشتن باوە و بووە بەدەستووری ئاسایی کۆمەڵ. شاعیر لە غەمخۆرێک دەگەڕێ وەکو خۆی بێ، ئەگەر ئەو هاودەمە هەبێ سوودی بۆ خۆی دەبێ، چونکە خانی گەورەیە و مۆسیقاییێکی خۆش ئاوازە.

## چوار خشتەکی

خانی لە دیوانی شیعری خۆیدا بابەتی چواخشتەکی فرە بەکارهێناوە، ئەو چوار خشتەکییانەی لەم ماوەیەدا هەڵیان دەبژێرین لە کۆمەڵێک بەند (کوپلە) پێکهاتوون. هەر بەندی چوار نیوە دێڕ شیعرە، بەندی یەکەم لە هەموو شیعرەکاندا لە ڕووی قافیەوە لەسەر (ا ب ا ب) دامەزراوە، کەچی هەموو بەندەکانی دیکە لەسەر (ا ا ا ب) دامەزراون.

نموونەی چوارخشتەکییەکانی خانی ئەمانەی لای خوارەوەن:

١- لە چوارخشتەکییێکیدا شاعیر دەڵێ:

هەرۆ سەد جار ژ ئولفا وێ
دبم کەیفێ ل مەیخانێ
ڤەبیر من تێت زولفاوێ
دنالم ئەز ژ هیجرانێ

ژ سەهما عەقرەب و ماران
دنالم ئەز گەلی یاران
ژ چەهڤان خون دچت باران
وەکی ئەو تێنە لێکدانێ

وەکی ئەو تێنە سەر خالان
ببین نوقتە ئو دالان
بنەفش و تەرح و ئالالان
د سەردا ماهێ تابانێ

د سەردا ئەو مەها ئەنوەر
ژ ڕەیحان سونبولاندا سەر
کرم سەوداو و هەم ئەبتەر
ژ من دل بر ب تالانێ



ژ من دل بر کو ڤێ جارێ
کو من دی قامەتا یارێ
وەکی سەلوێ ل جۆبارێ
ڤەمەشیا هاتە ئەیوانێ

ڤەمەشیایا سیفەت حووری
ژ ڕەنگێ سۆر گولا ژووری
ڕوحا شیرین تکەم گووری
ژ بۆ خالێ ئو نیشانێ

ژ وان خالان تەجەللیێدا
عەتارید بو د برجێدا
دلێ من کێزمەیەک لێدا
بەشیر ئەو هاتە مەیدانی

بەشیر ئەو هات پری پەیکەر
شەقێ ماها تژی ئەنوەر
ل من دا باتینی خەنجەر
دنالم ئەز ژ ئێسانێ

ژ وی دەربێ ئێ گێژم ئەز
شبێ بولبول دبێژم ئەز
ژ چەهڤان خون دڕێژم ئەز
وەکی تاڤێت ب بارانێ

ژ چەهڤان خون دبارینم
ژ عیشقا تە ئەزێ دینم
شبی فەرهاد و جنوینم
دبێم: لەیلا گەلۆکانێ

کو عاشق وێ دەنالیتن
شەق و ڕۆژان دگالیتن
ژ چەهڤان خون دمالیتن
مەجالە بێتە زۆزانێ

مەجالێ مە نکر کارەک
ل سورمە وێ هەبوو مارەک
ڤرێکەم ئایەتێ جارەک
دگەل بایێ شەبستانێ

دگەل بایێ سەحەر خێزێ
ببێژ عومبەرا مێزێ
تەعاشق کوشت بەڤێ رێزێ
بکە لوتفی ئو ئیحسانێ

کو من دیبو ل سەربانی
دبێژیت (ئەحمەدی خانی)
بدە رووحێ دگەل گیانی
دبێژم ئەز: بگر هانێ!

ئەم شیعرەی خانی وەسفێکی رووکەشی سادەی ئەدەبی رۆژهەڵاتییە، لە ئەدەبی میللییەوە نزیکە، شاعیر لەم بابەتە شیعرەی هەیە، پیاو ئەگەر سەرنجێکی سەرپێیی ئەم بابەتە شیعرانەی خانی بدا، بەئاشکرا بۆی دەردەکەوێ کە کاریگەری شیعری فەقێ تەیران پێیەوە دیارە.

شاعیر ئەندامە جوانەکانی دلبەری بەهەندێ لە دیاردەکانی سروشت چواندووە. زولف و روومەت خاڵی لەش و دەموچاوی خۆشەویست بوون بەدووپشک و مار و مانگی چواردە و ئەستێرە و بنەوشە و هەڵاڵە و سونبول و رەیحانی بەهار. خاڵ دەموچاو و لەشی دلبەری رازاندۆتەوە وەک ئەو ئەستێرانەی ئاسمانیان ئارایش کردووە.

لەشی یار نەرم و نۆڵ و نیانە بەڵام هەمیشە تیر و شیری بەدەستەوەیە، ئەگەر ئەو چەکانە بەراستیش نەبن برۆ و برژانگ و نیگا بن لە ئەنجامدا لەگەڵ تیر و شیری بەراستی یەکتری دەگرنەوە، یاری خانی دەبێتە یەکێک لەو ئەمازۆنە جوانانەی رۆمانی کۆن کە هەمیشە تیر و کەوانیان بەدەستەوە بوو.

یاری خانی بەهێزە، بەڵام خۆی هەروەک ئەو بلبلە بێ دەسەڵاتەیە کە لە ناڵین ناکەوێ، فرمێسکی بەرەنگ سوورە، بەسەنگ تاوە بارانە. لە ئەنجامدا شاعیر لە جوانی ئەو یارە شێت دەبێ.

خانی دوایی بەشیعرەکەی دێنی بەرەنگێک کردەوەی کوردانەیە: بەکۆڵانێکدا تێدەپەرێ، لە سەربان چاوی بەنازەنینێک دەکەوێ، ئیتر بەزمانی یارەوە دەڵێ: دڵ و گیانت بدە بەمن، ئەویش لە وەرامدا دەڵێ: فەرموو پێشکێشت بێ!

٢- لە چوار خشتەکییێکی دیکەیدا دەڵێ:

ئەز چوومە باغێ سۆر گولان



وەقتێ سەحەر گاهێ ب خەف
من دی سەدایا بولبولان
داگرتبوون هەر چار تەرەف

سەوتا هەزار و قومرییان
دەنگێ رەباب و موغنییان
تەشبیهی بەزما بەنگیان
هەڤ دەنگی هەڤ بوون چەنک و دەف

مانەندێ مەست و سەرخوەشان
ئەز چوومە بەزما مەهوەشان
ئەبروو کەمان و چاڤ رەشان
جەرگ و دڵی من کر هەدەف

پەیکان د جەرگێ دلبەرێ
تەن بوویە سندووقا بەرێ
سەددەق ژ حوسنا ڤێ پەرێ
هێژا ل من کر کەرب و گەف

هێژا ل من بوو کەرب و کین
زاهیر غەزەب باتین کەنین
لێ غەمزەیەک دا من نهین
عەقلێ مە دیسان کر تەلەف

دیسان حەبیبا چاڤ بەلەک
ئیحسان د گەل من کر گەلەک
لەورا د گەل زولفێن هەلەک
ئالۆز مە بیتن قشت و لەف

خەمریی و قشت و زولف و خال
هەمیان ل سەر روخسارێ ئال
دیگەر هەبوون جەنگ و جیدال
لێک ئالیبا بوون سەف ب سەف

سەف سەف مە دی وێ کریە جەنگ

هندەک حەبەش هندەک فرەنگ
فێکرا براندن وەک خەدەنگ
دیگەر هەبوون وان لاف و لەف
دیگەر هەبوون دەعوا و شەڕ
دەربوون ل من تیپا تەتەر
ژێک راکرن قەلب و جەگەر
ڕەتن ژ دل خوونا ب کەف
ڕەتن ژ دل خوونا دلان
شەهمارە زولفێن سەر ملان
بێ ڕەحم و مەستا قاتیلان
مەی خوار ژ فینجانا سەدەف
وان مەی خوەران ئەبتەر کرین
بێ قووەت و ڕەنگ زەر کرین
وەڵڵا ژ دل کەرکەر کرین
(خانی) بەسە ئاه و ئەسەف

ئەم شیعرەی خانی گۆرانییێکی خۆش ئاوازە، وشەی جوان، تەعبیری ڕەوان، مانای ڕووکەش لەگەڵ بزووتنەوەی ترپەی پێ و لەرزینی لەشی ناسکی فریشتە و پەرییانی بەهەشت چەرخ و فەلەک دێننە سەما ، گەردوون هەمووی لەژیان دایە.

خانی بەیانی لەگەڵ دوا هەناسەی شەو دەچێتە ناو باغی «سۆرگوڵان» ، مێرگ و میرغوزاری نەخشێنراو بەگوڵی سوور و نازدارانی کوڵم سوور، ئەم هەموو سوورانە مایەی سروشتن، بلبل هەزار و قومرییان دەخوێنن و ئاواز دەپڕێنن. خانی وەکو سەرخۆش ڕوودەکاتە کۆڕی سیاچەمانە و ئەبرۆ کەمانان. تیپ تیپ دلبەرانی حەبەشی و فرەنگ و تەتەر لە نازەنینانی ئەسمەری حەبەشی و چاوکاڵانی ئەورووپایی و حۆریانی قازان و سەمەرقەند تێکەڵ یەکتری بوون بۆ ئەوەی ژیان ببەخشنە هەرچی لەسەر ڕووی زەویدا هەیە.

٣- لەم چوار خشتەکییەدا خانی خەریکی بەهارە، چونکە بەهار ئیلهامی گەلێ لە بەرهەمە شیعرییەکانیەتی، جا ئەگەر لە بەرهاردا خۆشەویستەکەی بدۆزێتەوە دەبێ پایەی ئەو بەهارە چەندە بڵند و بە بەها بێ لەناو دڵ و دەروونی شاعیردا.

لە چوارخشتەکییەکەدا خانی دەڵێ:

دلۆ ڕابە خوە دڵ خوەش کە
هلۆ دا بچینە سەیرانێ



جارەک بەسە خوە بێ وەج کە
بچین سەیرا گوڵستانێ
گوڵستان وەکی سۆرگول تێ
چیمەن میسلاکو سونبول تێ
هەزار بولبول ب غولغول تێ
د فەسلا ماهێ نیسانێ
د فەسلا جادەئێ نیسان
مە دیبوو دلبەرەک دیسان
ب دل مەشعەل چرا ئیسان
مەجان دا وەکی پەروانێ
مەجان دا دلبەرەک سادە
شۆخ و لەتیف و بەگزادە
ژ قەیدان کرد مە ئازادە
نیهان خوەندیمە دیوانێ
نیهانی خەلوەتەک دا من
ژ لەعلان شەربەتەک دا من
گوهـ بدن نوکتەیەک دا من
کرم بەندە د فەرمانێ
ژ فەرمانێ کو سادیق بت
ئو ناخوازی موونافیق بت
دڤی هەردەم موافیق بت
وەکی شێخێ د سەنعانێ
وەکی شێخێ دێ هادیر بت
ل فەرمانێ کو نازیر بت
ب ئەمرێ دۆستێ کافر بت
د سۆژت سوحفێ قورئانێ
د سۆژم سوحفێ مەکتووبە
ب ئەمرێ یار و مەحبووبە

دەما دل دم ب مەتلووبە
د دم ئەز دین و ئیمانێ
ئەگەر دلبەر مەجازی بت
ژ ڕەنگێ لەبسێ خازی بت
بلا سۆفییێ ڕازی بت
ب مینە ئەو د هورمانێ
بنێ سۆفی قەوی دینە
وەکی خەففاشێ مسکینە
ل نێک وی ڕۆژ تو ڕەنگ نینە
خوە ناسپێرت ژ ئیمانێ
دلێ وی کۆرە ئەعمایە
ژ وەسلێ دووریێ دا مایە
ل بەر وی دەرگە دادایە
نەهشتە بێتە دیوانێ
ئەزم سەرخوەش ژ وی جامی
ئەزم سەودا نێڤ عامی
ئەزم عەنقا کەتم دامی
ب زولفا سەر ل خال دانێ
ب زولفان هاتە سەرخالان
ب نەفشا تیتەک و ئالان
دلۆ جانی مە عەبدالان
دبت دیسا د تالانێ
د تالانێ کو سەد سەرچوون
هەزاران گەنجێ جەهوەر چوون
دلێ سەد پارە کەرکەر چوون
تو (خانی) بەس کە ئەففانێ

خانی لە گەشتی بەهار و مانگی نیساندا تووشی دلبەرێک دەبێ، بەشێوەیێک دەیەوێ لێی نزیک ببیتەوە، وەکو ئەو دڵدارییەی فەقێ تەیرانی لە کچی گاوور نزیک کردەوە. فەقێ لە ئایین وەرگەڕا و چووە



سەر ئایینی کچە گاوورە خۆشەویستەکەی. ئەم بەسەرهاتە لە ئەدەبی ئیسلامەوی نەتەوە موسڵمانەکان بووە بەسەرچاوەیێکی گرنگ گەلێ بەرهەمی ئەدەبی سۆفیزمی خستۆتە ناوەوە. نویشکی ئەم بەسەرهاتە ئەوەیە عاشیق وێنەی کردگار لە «مەعشووقە»دا دەبینێ، ئەم دیاردەیە لە ئەدەبدا لە قالبی مەتریالی (ماددە) چۆتە دەرەوە و حاڵەتێکی گیانی وەرگرتووە، بۆ خانی زۆر ئاساییبە ناوی فەقێ تەیران بێنی و پێڕەوی بۆچوونەکانی بکا، چونکە بەشانازیییەوە ناوی فەقێی تەیران و مەلای جزیری و عەلی هەریری لە «مەم و زین»دا دەبا.

**تەرجیع بەند**

تەرجیع بەند لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا هەیە، ڕەنگە ئەم تەرجیع بەندەی خانی بەتەواوی تەعریفی ئەو هونەرەی بۆ نەگونجێ، بەڵام لەبەر ئەوەی لە هەموو شتێکیدا لە تەرجیع بەند دەکا تەنیا ژمارەی دێڕە شیعرەکان نەبێ بۆیە لە خانەی تەرجیع بەندمان دانا.

ئەم تەرجیح بەندەی خانی لە حەوت بەند (کوپلە) پێک هاتووە، هەر بەندەی شەش نیوە دێڕ شیعرە. لەم شەش نیوە دێڕ شیعرە چوار نیوە دێڕ شیعری هەر بەندێک لە شێوەی شیعری چوارین دایە، لەسەر یەک قافیەیە (I I I I)، دوو نیوە دێڕ شیعری بەندەکەش یەک قافیەی هەیە (I I)، لە هەموو بەندەکاندا ئەم دوو نیوە دێڕە وەکو خۆیان دووبارە دەبنەوە. دوو نیوە دێڕی شیعرەکە ئەمەیە:

گەر بزانم ئەز د حەشرێ دا نەبینم دلبەرێ
جەننەتێ دێ چ پێ کەم پێوەر بکم خاکستەرێ

لێرەدا پێویستە ئاگاداری ئەوەبین تەنیا هەر شەش نیوە دێڕ شیعری کوپلەی یەکەم لەسەر یەک قافیەیە (I I I I I I)، واتە لەسەر قافیەی ئەو دوو نیوە دێڕەی دووبارە دەبنەوە.

خانی لە تەرجیع بەندەکەیدا دەڵێ:

ئەی درێغا مامە تەنها ئەز ژ شەمسا خاوەری
خان و مان تێک بوونە زولمەت پاشی وێ دێم ئەنوەری
پاشی لێڤێد وێ ڤەناخوم موتلەق ئاڤا کەوسەری
بێ قەرارم شبەە زیبەق بێ ئەوی سیمەن پەری
گەر بزانم ئەز د حەشرێ دا نەبینم دلبەرێ
جەننەتێ دێ چ پێ کەم پێوەر بکم خاکستەرێ
سەد موخابن چوو ژ بال من ئەو حەبیبا چاڤ بەلەک
ئاه و ئەفغانێ د من دائیم د چوون چەرخا فەلەک
وێ ژ فریادێ د من عاجیر د بوون ئینس و مەلەک
مام د قەیدا داغ و دەردان پاش وان زولفێ د هەلەک

گەر بزانم ئەز د حەشرێ دا نەبینم دلبەرێ
جەننەتێ دێ چ پێ کەم پێوەر بکم خاکستەرێ

هیجرەتا یارێ بهارتم شوبهی فندا شوعلەدار
کەتمە حالێ ئیغتیراقێ ژ ئیحتیراقێ بوومە نار
ئەز وجوودەک بێ وجوودم سۆهتم تێکدا بووم غوبار
من ئەڤێ دونیا ب جارەک پاشی وان چاڤێد خومار

گەر بزانم ئەز د حەشرێ دا نەبینم دلبەرێ
جەننەتێ دێ چ پێ کەم پێ وەربکم خاکستەرێ

گەر د حینا ئەز وەفات بم بێتە سەر من عزرەئیل
موژدەیا خولدێ د وێ گاڤێ بدەت من جیرەئیل
خزرێ فەرەخ بێ ژ من رابت دوێ رێ دا دەلیل
دی ببێژم من نەڤێتن خولد و کەوسەر سەلسەبیل

گەر بزانم ئەز د حەشرێ دا نەبینم دلبەرێ
جەننەتێ دێ چ پێ کەم، پێوەر بکم خاکستەرێ

چەرخێ کەچێ رەفتارە و بلا کو ئەز حەیران کرم
سەر ب گەردان بووم ئەز، وەلێکن زێدە سەرگەردان کرم
بێ دل و عەقل و هەوەس جارەک کو بێ ئیزعان کرم
پاش کو دێ بێ مروەتێ ئەڤ رەنگە ئەز تالان کرم

گەر بزانم ئەز د حەشرێ دا نەبینم دلبەرێ
جەننەتێ دێ چ پێ کەم، پێوەر بکم خاکستەرێ

زینهارە ئەی دۆستان وەقتێ دکم ئەز هیجرەتێ
ڤان دو میسراعان کیتابەت ل بەرگێ کاغەتێ
دا د دەستێ من دا سەنەد بیتن د حینا حەزرەتێ
عەرز و حالا من ئەڤ بیتن مەزموون د حینا رۆئیەتێ

گەر بزانم ئەز د حەشرێ دا نەبینم دلبەرێ
جەننەتێ دێ چ پێ کەم پێوەر بکم خاکستەرێ

(خانی)یا! ئەڤ هزرە گۆتی خەتەئو ناسەواب
چەند ژ تە سادیر ب بن ئەی بێ ئەدەب ئەی بێ حیجاب



ئەڤ قەزایا بارییە، پێ رازی ببە ئەی مال خراب
بەلکی بێتە مووجیبێ ناری ژ بۆتە ئەڤ جەواب

گەر بزانم ئەز د حەشرێ دا نەبینم دلبەرێ
جەننەتێ دێ چ پێ کەم پێوەر بکم خاکستەرێ

لەم شیعرەدا خانی لە هەڵوێستی خۆی دەدوێ لەو کاتەی لە یاری دوور دەکەوێتەوە، لێرەدا لەلاییێک لە پەرێشانی خۆی دەدوێ کە گەیشتۆتە پلەیێک شێت و شەیدا بووە، لەلاییێکی ترەوە باس لە جوانی خۆشەویست دەکا: خان و مانە، چاو بەڵەکە، چاو خومارە، لێوی ئاوی کەوسەر دەپژێنێ.

مەبەسی شاعیر لەم پارچە شیعرەدا ئەوەیە بڵێ، ئەو یارەی خۆشی دەوێ بووە بە«موتلەق»، بەبێ ئەو ناژی، بەهەشت و کەوسەریشی دەست بکەوێ ئەمانە جێی ئەو یارە نازدارە ناگرنەوە و پێویستی پێیان نییە.

**موستەزاد**

موستەزاد بابەتێکە لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، هەر دێرە شیعرێکی لە دوو نیوە دێڕ شیعر پێکهاتووە، لەسەر کێشی عەرووز دەهۆنرێتەوە. نیوە دێری یەکەم درێژە، واتە تەفعیلەی زۆرە، نیوە دێری دووەم کورتە، واتە تەفعیلەی کەمە. لە خوێندنەوەدا وا دەکەوێتە بەرچاو وەکو نیوە دێرە کورتەکە وەرامی نیوە دێرە درێژەکە بێ. لە بابەت قافیەوە دێرە درێژەکان لەسەر یەک قافیە دەبن و دێرە کورتەکان لەسەر قافیەییێکی دیکە.

ئەم موستەزادەی خانی لە رووی هونەرییەوە خاسیەتی تایبەتی خۆی هەیە. شیعرەکە لەسەر بنچینەی کوپلە دامەزراوە، هەمووی بریتییە لە شەش کوپلە، هەر یەکەی چوار نیوە دێڕ شیعرە، دوو نیوە دێری درێژە و دوو نیوە دێری کورتە، وەکو چوارین دەکەوێتە بەرچاو. بەم پێیە کوپلەی یەکەم قافیەی بەم جۆرەیە (اب اب)، بەڵام پێنج کوپلەکەی دیکە دوو نیوە دێری یەکەم یەک قافیەیە، دوو نیوە دێری دووەم لەگەڵ دوو نیوە دێری کوپلەی یەکەم یەکتری دەگرنەوە. هەموو کوپلەکانی شیعرەکە، تەنیا کوپلەی یەکەم نەبێ قافیەیان بەم جۆرەیە (ا ا ج د).

لە موستەزادەکەیدا خانی دەڵێ:

ئەز چووم دەرێ مەیکەدەئێ سوبحەیەکێ زوو
من دی یەکا ئەسمەر
قامەت ب میسال دارێ د شمشادێ دو گێسوو
مانەندێ دو ئەژدەر

***

ماهێ موتەرەققیب مەیکەدە وو مەزهەرێ ئیعجاز
جارەک ب دو سەد ناز

حالێ مە تەفەحوس بکە بێژە کو ئەسیروو
ئەز بۆ تە مە غەمخوەر

***

چین چین د مەشن بسکێ ل سەر گولشەنێ ڕوخسار
مانەندێ دو شەهمار
گەه گەه دخشن زولفێ ل سەر قەوسێ دو ئەبروو
مانەندێ دو شەهپەر

***

من گۆتێ: د وەقتێ سەحەرێ ئەو چ تە دا من
ئەی سەروێ قەدا من!
گۆ: ما تو نزانی چییە من دا تە فەقیروو
(أَعْطَيْتُكَ كَوْثَر)

***

هندێ مەلەک و حوور و پەری بێنە تەماشا
(حاشا ثُمّ حاشا)
کەنگی دبن ئەو لائیق و هەڤرەنگێ دو ئەبروو
ئەی دل مەکە باوەڕ

***

یارێ ژ دەرێ مەیکەدەئێ من مەکە بێ بار
ئەی سەییدێ موختار
ساقی کو تو وی (أَشْهَدُ باللە)ی د ئیروو
(خانی) بوویە مەی خوەر

لەم موستەزادەدا خانی وەسفێکی ڕووکەشی ئاسایی ئامێزی دلبەری دەکا، هەر ئەو وێنە بەراوردیانە بەکاردێنێ کە لە غەزەل و قەسیدەکانیدا هاتوون، هەندێکیان لە داهێنانی شاعیرن، هی دیکەیان لەژێر کاریگەری شیعری ئیسلامەوی نەتەوە موسوڵمانەکانی هاوسێی کوردن.

## مولەممەع

مولەممەع هونەرێکی شیعرییە پێوەندی بەڕوخساری شیعرەوە هەیە لەڕووی زمانەوە. شاعیری کورد هەندێ جار دوو زمان بەکاردێنێ بۆ هۆنینەوەی غەزەلێک یا قەسیدەییێک، بێگومان زمانی یەکەمیان کوردی دەبێ، دووەمیان یەکێ لە زمانانی عەرەبی و فارسی و تورکی عوسمانی. جاری وا هەیە لە



شیعرێکدا سێ زمان بەکاردێنێ، هەندێ جاریش دەگاتە چوار زمان، واتە زمانی کوردی و هەرسێ زمانی هاوسێیانی نزیکی کورد، عەرەب و فارس و تورکی عوسمانی.

خانی لە مولەممەعێکدا هەر چوار زمانەکە بەکاردێنێ، شیعرەکەی لەسەر بنج و بناوانی چوارین داناوە بەمەرجێک دێڕەکانی چوارینی یەکەم لەسەر یەک قافیەن (ا ا ا ا)، بەڵام چوار چوارینەکەی دیکە، سێ نیوە دێڕی یەکەم و دووەم و سێیەم لەسەر یەک قافیەن، نیوە دێڕی چوارەم لە هەموویاندا دەگۆڕێن و دەچنەوە سەر قافیەی چوارینی یەکەم (ا ا ا ب). شیعرەکە بریتییە لە پێنج بەند (چوارین) دێڕی یەکەم عەرەبی و دێڕی دووەم فارسی و دێڕی سێیەم تورکی عوسمانی و دێڕی چوارەم کوردییە.

شیعرەکەی خانی بەم جۆرە هاتووە:

فاتَ عُمْري في هواكَ ياحبيبي كُلّ حال
آه و نالم همدمم در فراقت ماه سال
گر بنم قانم دلرسن چوقدن اولمشدر حلال
دین و ئەبتەر بووم ژ عیشقێ من نەمان عەقل کەمال

***

أنتَ فكرٌ في فُؤادي أنتَ روحٌ في الجسد
لشكر غمهای تو ملک دلم ویران کرد
داده گلدم عشق آلندن إسترم سندن مدد
وان تەتاران برنە یەغما عەقل و دین و مولک و مال

***

طالَ غَمِّى زاد هَمِّى شاع سِرِّى في الملا
تشنەای جام وصالم چون شهید کربلا
یوقسه سن دیوانه أولدن نیجه حالم أی دلا
یا ژ نووڤە عیشوەیەک دا من حەبیبا چاڤ کەژال

***

بِتُّ هِجْراناً حَبيبي لَسْتَ مِنِّى عالِماً
هر دم أز درد فراقت غافلی أز حال من
جان و دلدن عرض قلدم حالمی جانانه بن
عەرزوحالا من تو غافیل قەت نەپرسی عەرزوحال

***

هَل لنا من نعمةِ الوصْلِ حبيبي مِن نَصيب
اوفتاده ام بر درت بیچاره سرگردان غریب
درد من چوق لیک سندن اونه یوق هیچ برطبیب
ئەی تەبیبێ من دەوائێ دەردێ (خانی) هەر ویسال

لێرەدا دێرە شیعرە عەرەبی و فارسی و تورکییە عوسمانییەکان وەردەگێڕینە سەر زمانی کوردی و لەگەڵ دێڕی چوارەمی کوردییەکان دووبارە دەیاننووسینەوە:

لە هەموو حاڵێکدا ئەی خۆشەویستم تەمەنی من بەدڵداریی تۆوە چووە سەر
ئاه و نالەم هاودەمم بوون لە دووری تۆوە بەساڵ و مانگ
ئەگەر خوێنی منت گەرەکە لەمێژە بۆت حەلاڵ بووە
دین و ئەبتەر بووم ژ عیشقێ من نەمان عەقل و کەمال

***

تۆ هزری لەناو دڵمدا، تۆ گیانی لەناو لەشمدا
لەشکری غەمەکانی تۆ موڵکی دڵمی وێران کرد
لە دەست عیشق هاوارم لێ هەڵسا یارمەتیم لە تۆ گەرەکە
وان تەتاران برنە یەغما عەقل و دین و مولک و مال

***

غەم درێژەی کێشا و زیادی کرد، نهێنیم لەناو خەڵکیدا ئاشکرا بوو
تینووی جامی گەیشتنم بەتۆ وەک شەهیدی کەربەلا
یاخود تۆ شێت بووی، لە چی حاڵێک دام ئەی دڵ
یا ژ نووڤە عیشوەیێک دا من حەبیبا چاڤ غەزال

***

من لە دەردی دووریم ئەی خۆشەویستم، تۆ بەمن نازانی
هەردەم لە دەردی دووریت، تۆ لە حالی من غافلی
بەگیان و بەدڵ حاڵم عەرزی تۆ کرد ئەی خۆشەویستم
عەرزوحالا من توغافیل قەت نەپرسی عەرزوحال

***

ئایا بەشمان لە خۆشیی گەیشتن بەخۆشەویست هەیە ئەی دلبەری من
لەبەر دەرگات بێچارە و سەرگەردان و غەریب کەوتووم
دەردم زۆرە، بەڵام لە تۆ زیاتر هیچ پزیشکێکی بۆ نییە



ئەی تەبیبێ من دەوائێ دەردی (خانی) هەر ویسال

غەزەل و قەسیدەکانی خانی ڕێ خۆشکەرەوە بوون بۆ پەیدابوونی گەلێ بابەتی دیکە لە بزووتنەوەی شیعری کوردی لە کوردستانی باکووردا لە دوای دابەشکردنی کوردستان لە ئەنجامی جەنگی چالدیران (١٥١٤)دا.

بەرهەمی شیعری لەناو لاپەڕەکانی دیوانی خانیدا بەگشتی مەرجی شاعیرییەتی ئەو فەرەزەندەن، چونکە نموونەی بەرز و ڕەوان و بێ وێنەی شیعری کوردین، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خانی بە«مەم و زین» دەناسرێ و لە یەکتری جیاناکرێنەوە.

## مەم و زین
## لەڕووی ڕوخسارەوە

چیرۆکی شیعری (ئیپیک) وەک بەرهەمێکی ئەدەبی مێژوویێکی گەلێ کۆنی هەیە، دەتوانین بڵێین ئەم جۆرە هونەرە میللییە لەگەڵ ژیانی ئادەمزادی ناو ئەشکەوت پەیدابووە، لەو سەردەمانەدا تۆمار نەبووە، دەماودەم گێڕاویانەتەوە.

ئەم بابەتە بەرهەمە لەناو نەتەوە موسڵمانەکاندا باو بووە، میراتێکە پێش دەوری ئیسلام لەباب و باپیریانەوە بۆیان ماوەتەوە، مێژووی ئەدەبی نەتەوە و میللەتە ئێرانییەکان و هیندۆ ئێرانییەکان و تورکی عوسمانی و تورکە مەغۆلەکان بەچیرۆکی شیعری ڕازاونەتەوە. لە ئەدەبی کوردیدا چیرۆکی شیعری یەکێکە لە بابەت و هونەرە خۆشەویستەکانی ناو خەڵک. سەرچاوەی چیرۆکە شیعرییەکان لای کورد و لای هاوسێکانی لە دوو جێگە هەڵدەقوڵێن، یەکێکیان لە ناوەوەیە، واتە خۆماڵی، ئەوی دیکەیان لە دەرەوەیە، واتە بێگانە، لەبەر ئەوە دەبینین گەلێ چیرۆک لە ناوەوەن، لە بنجدا یەک بابەتن، بەڵام هەریەکەیان بەجۆرێک لە ڕووی هونەرییەوە خراونەتە بەرچاو، وەکو «شیرین و فەرهاد» و «شیرین و خوسرەو» و «لەیلا و مەجنوون» و «مەنیجە و بیژەن» و گەلێکی دیکە. ئەوە ئاشکرایە لە کاتێکدا چیرۆکی میللی فۆلکلۆری عەرەبی «لەیلا و مەجنوون» لە لای عەرەبەکان خۆیان بایەخی پێ نەدراوە، بەڵکو هەر دانی پێدا نەهێنراوە وەکو بەرهەمێکی بەرز دەبینین ئەمە بووە بەسەرچاوەیێکی یەکجار گرنگ بۆ داهێنانی شیعری ڕەسەن لە چوارچێوەی چیرۆکدا. بەم پێیە کۆمەڵێک چیرۆکی شیعری بەرزمان لەبەردەست دایە لە ئەدەبی کوردیدا لەلایەن شاعیرانی کوردی ناوچە جیاوازەکانی کوردستان هۆنراونەتەوە بەناوی چیرۆکی شیعری «لەیلا و مەجنوون».

چیرۆکی شیعری ڕۆژهەڵات بە ناوەرۆک لە ژیانی ئادەمزاد دەدوێ، بە ڕوخسار زمان و ئاواز و مۆسیقاییێکی وای تێدایە سەرنجی گوێگر ڕادەکێشێ بۆ مانا. لەناو ئەم چیرۆکە شیعریانەدا ناوەرۆکی دڵداری بەسەر هەموو ئەوانی دیکەدا زاڵە. ئێمە دەتوانین چیرۆکی شیعری کۆمەڵایەتی و سوارچاکی و ئەفسانەیی و دڵداری و ئایینی و سۆفیزمی و هی تر لە ئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتدا بەدی بکەین.

ڕەنگە ئەم قسەیەمان بۆ مەبەستێکی ئەکادیمی و ڕوون کردنەوە بێ بۆ ئەدەب دۆستان و قوتابیانی

ئەدەب، ئەگەر نا هەر بابەتێک لە چیرۆکی شیعریدا کە دیاری جۆرەکەی دەکا وەکو ئەوەی بڵێین چیرۆکەکە دڵدارییە، هەر لەو چیرۆکەدا وێنەی ژیانی گشتی ئادەمزاد دەبینرێ وەک چاکە و خراپە، جوانی و ناشیرینی، بەدبەختی و بەختیاری.

چیرۆکی شیعری «مەم و زین»ی خانی یەکێکە لەو چیرۆکانەی بووە بەشانازی ئەدەبی کوردی و ئەدەبی ڕۆژهەڵات و ئەدەبی هەموو گێتی لە ڕووی نرخی ئیستێتیکییەوە بەرامبەر بەشاکارەکانی ئەدەبی عالەمی دەوەستی.

## مەم و زینی خانی و مەمی ئالانی میللی

چیرۆکی مەم و زین گێڕانەوەییێکی ئەدەبی میللی سەرزار بووە بۆ ماوەییێکی زۆر پێش سەردەمی ژیانی ئەحمەدی خانی. چیرۆکەکە هەرچەندە بەناوی مەم و زین ناوبانگی دەرکردووە بەڵام بەناوی «مەمی ئالان»یش ناسراوە، ئەمە چیرۆکێکی فۆلکلۆری نەتەوەی کوردە وێنەی ئێش و ئازار و هیوا و ئامانجەکانی دەکێشێ.

چیرۆکی ناوبراو لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بەدرێژایی ڕۆژگارێکی زۆر درێژ لە ناوەوەیە بەدیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی. گۆرانیبێژانی میللی هەوڵیان داوە بەشیعر و پەخشان و گۆرانی چیرۆکەکانیان بگەیەننە ئەنجام. بێگومان لە ناوەرۆکی گۆرانی و چیرۆکەکاندا جیاوازی بەدی دەکرێ، بەڵام ڕووداو و قارەمانە سەرەکییەکان لە هەموو تێکستە جیاوازەکاندا وەکو خۆیان ماونەتەوە.

لە ڕۆژهەڵاتناسی ئەوروپا لە سەدەی نۆزدەم و لەلای خۆمان لە دەوروبەری جەنگی دووەمی گێتی دەستکرا بەبڵاوکردنەوەی تێکستی ئەدەبی میللی، لەناو ئەمانەدا بایەخێکی زۆر بە«مەمی ئالان» درا.

ئێمە ئەگەر لەم لایەنەوە سەرنجێکی مەسەلەکە بدەین وا دێتە بەرچاومان کە تا ئێستا تێکستێکی یەکجار زۆری ئەدەبی میللی کۆن و تازە لەلایەن کوردناسەکان و خۆمانەوە بڵاوکراونەتەوە، لەناو ئەمانەشدا «مەم و زین = مەمی ئالان» بەشی لە هەموویان زیاترە.

لەو ماوەیەدا لە هەندێ کارەکانی کوردناس و ڕۆژهەڵاتناسەکان دەدوێین و پەنجە بۆ بڵاوکراوەکانیان درێژ دەکەین:

١- تێکستە کۆکراوەکانی کوردناس ئەلبێرت سۆتسین لە شاری سانت پیترسبورگ لە ساڵی ١٨٨٧ بەزمانی کوردی بڵاوکرانەوە، وەرگێڕانی ئەڵمانی ئەو تێکستانە لە ساڵی ١٨٩٠ بڵاوکرایەوە.

٢- گۆڕینی ئەرمەنی تێکستی تری کوردی لە ساڵی ١٨٩٧، وە گۆڕینی کۆمەڵێکی تێکستی دیکەی کوردی لە ساڵی ١٩٠٤ بڵاوکرانەوە.

٣- کۆکراوەکانی تێکستی مەم و زینی فۆلکلۆری لەلایەن زانای ئەرمەنی ئایکوونی لە ساڵی ١٩٠٤ بڵاوکرانەوە.

٤- تێسکستێکی دیکە بەزمانی کوردی و لەگەڵ وەرگێڕانی ئەرمەنی لە ساڵی ١٩٠٤ بڵاوکراونەتەوە، ئەم تێکستە پەخشانە.



٥- تێکستە کۆکراوەکانی زانای ئەڵمان ئۆسکارمان بەزمانی کوردی لە ساڵی ١٩٠٦ بڵاوکراونەتەوە، وەرگێڕانی ئەم تێکستانە بەزمانی ئەڵمانی لە ساڵی ١٩٠٩ لە بەرلین بڵاوکراونەتەوە، ئەم تێکستە بەدیالێکتی کرمانجیی خوارووی ناوچەی موکریانە.

٦- تێکستە کۆکراوەکانی زانای نەمساوی هۆگۆ ماکاش بە زمانی کوردی و ئەڵمانی لە ساڵی ١٩٢٦ لە سانت پیترسبورگ بڵاوکراونەتەوە، ئەم تێکستە بە دیالێکتی کرمانجیی سەرووی ناوچەکانی جزیرە و توور عابدینە.

٧- سێ تێکستی جیاوازی حاجیی جندی و ئەمینی عەبدال بە زمانی کوردی لە شاری یەریڤان لە ساڵی ١٩٣٦ بڵاویان کردوونەتەوە.

٨- تێکستە کۆکراوەکانی زانای ڕووس ئو. ل. ڤیلچێڤسکی بە زمانی ڕووسی لە ساڵی ١٩٣٨ بڵاوکراونەتەوە. ئەوەی پێویستە بوترێ ئەوەیە تێکستە کوردییەکانی ئەم کۆکراوانە لە ئابلوقەدانی شاری سانت پیرترسبورگ (لینینگرادی ئەوسا) لە ماوەی جەنگی دووەمی گێتی لە ناوچوون.

٩- تێکستە کۆکراوەکانی کوردناسی فرەنسی ڕۆژێ لیسکۆ بەزمانی کوردی و فرەنسی لە ساڵی ١٩٤٢ بڵاوکراونەتەوە.

١٠- تێکستێکی تر بە زمانی ڕۆمانی لە ساڵی ١٩٤٢ - ١٩٤٣ بڵاو کراوەتەوە.

١١- تێکستێکی عەبدولمەسیح وەزیر (نووسەری عیراقی) بەزمانی عەرەبی ناوەرۆکی لە «مەمی ئالان»ی فۆلکلۆرییەوە کراوە بەعەرەبی لە ساڵی ١٩٤٢ لە کۆواری «الرساله والروایه»ی میسری بڵاوکراوەتەوە.

١٢- پێنج تێکستی جیاواز بە زمانی ئەرمەنی لە ساڵی ١٩٥٦ بڵاوکراونەتەوە.

١٣- تێکستە کۆکراوەکانی حاجی جندی بەزمانی کوردی لەساڵی ١٩٥٧ لە شاری یەریڤان بڵاوکراونەتەوە.

١٤- تێکستی «مەم و زین» یا «مەمی ئالان»ی فۆلکلۆری لە کۆکراوەکانی زانای ئەڵمان مارتن هارتمان لەلایەن نووسەری ئەم کتێبە مارف خەزنەدارەوە لە ساڵی ١٩٧٣ لە بەغدا بڵاوکراوەتەوە، ئەوەی شایانی باسە لەم ماوەیەدا ئەوەیە دەسنووسی ئەم تێکستانە لە ساڵی ١٨٩٩ تۆمارکراون و لە نامەخانەی گشتی شاری سانت پیترسبورگ پارێزراون.

ئەمە هەندێ لەو کارانە بوو کە ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسانی ئەوروپا گەیاندبوویانە ئەنجام لە بابەت کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە لە «مەم و زین»ی فۆلکلۆری، لای خۆشمان لە ماوەی زیاتر لەو پەنجا شەست ساڵەی دواییدا گەلێ تێکستی ئەدەبی میللی بەگشتی و مەم و زینی فۆلکلۆری بەتایبەتی بڵاوکراونەتەوە.

چیرۆکی میللی «مەم و زین» یا «مەمی ئالان» پێش ئەحمەدی خانی بەشێوەییێکی فراوان لە ناوەوە بووە، ئەحمەدی خانی هەر لە منداڵییەوە گوێی لە گەلێ لەو حیکایەتانەی مەم و زین بوو، بەشیعر و

پەخشان، بەگۆڕانی و گێڕانەوە. گومانمان لەوەدا نییە بەشێکی زۆر لە مەم و زین ئەوانەی لەبەر دەستمانن لە سەردەمی خۆیدا خانی بەگۆڕانی و حیکایەت بیستوونیەتی، چێژی لێ وەرگرتوون و کاریان تێ کردووە و لە دواییدا حیکایەتەکان بوون بەسەرچاوەی ئیلهامی خانی بۆ نووسینەوەی «مەم و زین»، بەرهەمێکی ئەدەبی ڕەسەنی بەرزی هێنایە ناوەوە هەتا هەتایە کورد شانازی پێوە بکا.

ئەگەر بەراوردێک لە نێوان ناوەرۆکی ڕووداوەکان و قارەمانانی تێکستی چیرۆکی شیعری مەم و زین و حیکایەتە پەخشانییەکانی لەگەڵ ناوەرۆکی «مەم و زین»ی خانیدا بکەین، بەڕوونی ئاشکرا دەبێ لە یەک چوون و لەیەک نەچوون لە نێوان قارەمان و ڕووداوەکانی تێکستە فۆلکلۆرییەکان و «مەم و زین»ی خانیدا هەیە، دەتوانین بە بێگومان کردن ئەوەش بڵێین قارەمانانی تێکستە فۆلکلۆرییەکانی «مەم و زین» لە قارەمانانی «مەم و زین»ی خانی زیاترن.

وێنەکە وەکو لای خوارەوە دەکەوێتە بەرچاو.

قارەمانانی «مەم و زین»ی فۆلکلۆری ئەمانەن:

١- مەم: کوڕی میری یەمەنە.
٢- زین: کچی عەبدەل (ئەبدال) و خوشکی میر زێندینی میری جزیری بۆتانە.
٣- خدر و ئەلیاس (خدر ئەلیاس): پێغەمبەرە.
٤- عەبدەل (ئەبدال): باوکی زین و میری جزیری بۆتانە.
٥- زێندین: کوڕی میر عەبدەل و برای زینە.
٦- بەنگین (بەنگۆ): هاوڕێی مەمە.
٧- ستی: خوشکی زینە.
٨- قەرە تاژدین: وەزیری میر زێندینە.
٩- مەلەک ڕحان: خوشکی بەکر (بەکرۆک)ە.
١٠- بەکر (بەکرۆک): پیاو و سەرکاری میر زێندینە.
١١- گورگین: هاوڕێی مەمە.
١٢- چەکۆ: هاوڕێی مەمە.
١٣- عارف: هاوڕێی مەمە.

قارەمانانی «مەم و زین»ی خانیش ئەمانەی خوارەوەن:

١- مەم: کوڕی میرزا (دەبیر)ی دیوانی میر زێندینە.
٢- زین: خوشکی میر زێندینە.
٣- زێندین: میری بۆتانە، برای زین و ستییە.
٤- بەکر: سەرکار و دەرگاوانی میر زێندینە.



٥- گورگین: هاوڕێی مەم و سەرۆکی پاسەوانانی میر زێندینە.
٦- ستی: خوشکی زینە.
٧- تاژدین: هاوڕێی مەمە و کوڕی ئەسکەندەری وەزیری میر زێندینە.
٨- عارف: ناوی یەکێک لە براکانی تاژدینە.
٩- حەیزەبوون: دایەنی زینە.
١٠- چەکۆ: ناوی یەکێک لە براکانی تاژدینە.
١١- خدر: پێغەمبەرە.

لەمەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ حیکایەتە فۆلکلۆرییەکان هەموو قارەمانەکانی «مەم و زین»ی خانییان تێدایە، تەنیا «حەیزەبوون»ی دایەنی زین نەبێ، سەرەڕای ئەمانەش سێ کەسی دیکەی تێدایە لە «مەم و زین»ی خانیدا نین:

١- عەبدەل: باوکی زین و زێندینی میری جزیری بۆتانە، تەنیا ناوی هاتووە و دەورێکی ئەوتۆی نییە.
٢- بەنگین (بەنگۆ): هاوڕێی مەمە.
٣- مەلەک ڕحان: خوشکی بەکر (بەکرۆک)ە.

لەمەدا ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ خانی جەوهەری چیرۆکە میللییەکەی وەرگرتووە و کردوویەتی بە یەکێتییێک، چونکە بەسەرهاتەکە لە ئەدەبی میللی سەرزاردا بڵاوە، لەگەڵێ لە ناوچە جوگرافییەکانی کوردستاندا لە ناوەوەیە بەدیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی، هەروەها حیکایەت خوان و گۆرانیبێژی کورد بەپەخشان وتوویەتی و بەگۆرانی چڕیویەتی، گێڕانەوەی وایان تێدایە ئەوەندە درێژن شەوانی زستانێکیان دەوێ، کەچی هی واشیان تێدایە لە ماوەیێکی کەم گۆرانیبێژ دەتوانێ ڕووداوەکان بگێڕێتەوە.

ئەم هەموو زانیارییانە بوونەتە هەوێن بۆ خانی و شاکارێکی ئەدەبی بەرزی لێ دروست کردووە.

**مەم و زین لەڕووی کێش و قافیەوە**

خانی لە هۆنینەوەی چیرۆکی شیعری «مەم و زین» هەموو مەرجەکانی ئەم هونەرەی بەجێ هێناوە کە لە ئەدەبی نەتەوە موسڵمانەکانی هاوسێی کورددا بەرچاو دەکەون لە ڕووی کێش و قافیە و سەرەتای چیرۆک و دابەشکردنی ڕووداو و زانیارییەکانی کە پێوەندییان بەناوەرۆکەوە هەیە بەسەر بەش و فەسڵەکانی چیرۆکەکە.

«مەم و زین»ی خانی لەلایەن کێشەوە هەموو دێڕەکانی لەسەر کێشی هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبووزی مەحزووفە (الهزج السداسي الأخرب المقبوض المحذوف) (مفعول مفاعلن فعولن)، وەکو:

هەر مێرەکێ وان ب بەزلی حاتەم
هەر مێرەکێ وان ب ڕەزمی ڕۆستەم

بەڵام لە هەندێ جێگەدا، لە باتی (مەحزووف)، عەرووز و زەرب مەقسوور دەبن (مفعول مفاعلن فعولان)، وەکو:

دا خـــەلق نەبێـــژتن کـــو ئەکــــراد
بێ مـــەعـــریفـــەتن، بێ ئەسل و بنیـــاد

لەڕووی کێشەوە، «مەم و زین» لەسەر بنچینەی مەسنەوی دانراوە، لەبەر ئەوەیە لەو کاتەی ئەم جۆرە هونەرە شیعرییە چیرۆکی شیعری و داستان و مەلحەمەی پێ دەوترێ «مەسنەوی»شی پێ دەڵێن، چونکە لە ڕووی قافیەوە هەردوو نیوە دێڕی هەر دێڕە شیعرێک لەسەر یەک قافیە دەبن (اا)، (ب ب)، (ج ج)... هتد. ئەم جۆرە قافیەیە لە ئەدەبی کوردیدا بۆ شیعری لیریکیش بەکاردەهێنرێ.

## دەسنووس و چاپی مەم و زین

ژمارەیێکی زۆر لە دەسنووسی «مەم و زین»ی خانی لە کوردستان و نامەخانە گەورەکانی ئەوروپا پارێزراون. لە سەدەی نۆزدەمدا هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسانی ئەوروپا باسیان لێوە کردووە و ناویان هێناوە، بەڵام کەسیان تێکستی «مەم و زین»ی خانی یا وەرگێڕانی بۆ زمانانی خۆیان بڵاونەکردۆتەوە. بایەخدان بە«مەم و زین» لەلایەن ئەوروپاییان و کەسانی لای خۆمان لە سەدەی بیستەمدا کەوتۆتە ناوەوە.

ئەگەر بمانەوێ شارەزایی لە چاپ و وەرگێڕانەکانی مەم و زین پەیدا بکەین پێویستە ئەم زانیارییانە دەربڕین، چونکە گرنگترین کارن لەم مەیدانەدا.

هەندێ پارچەی «مەم و زین» لە ڕۆژنامە و گۆوارە کوردییەکاندا چاپکراوە، لەمانە گرنگترینیان لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامە و گۆواری وەکو «کوردستان - قاهیرە» و «ژین - ئەستەمووڵ» و «هاوار - شام» و هی دیکە بووە.


مم و زین

اثرا

سرتاج ادیب کردان ومدار افتخارا جهان

احمد خانی

استانبول

نجم استقبال مطبعه سی

۱۳۳۵ — ۱۳۳۷

«مەم و زین»ی خانی چاپی ئەستەمووڵ



بڵاوکردنەوەی «مەم و زین» بەکتێب وەکو لای خوارەوە خۆی دەنوێنێ.

١- بۆ یەکەمین جار «مەم و زین»ی خانی لە ساڵی ١٩١٩ لە ئەستەمووڵ، لە چاپخانەی «نجم استقبال» لەژێر ژمارە (١)ی بڵاوکراوەی ڕۆژنامەی «ژین»ی ئەستەمووڵ چاپکراوە. پێشەکیی بەچوار لاپەڕە لەلایەن هەمزە مۆکسی (١٩٥٨ کۆچی دوایی کردووە)یەوە نووسراوە.

ئەم چاپەی ئەستەمووڵ لەڕووی دەسنووسێکەوە گەیەنراوەتە ئەنجام لە ساڵی (١١٦٥ھ/١٧٥١-١٧٥٢م)دا عەزیزی کوڕی شێر مامزیدی ڕوونووسی کردووە. ئەم چاپەی ئەستەمووڵ یەکێکە لە چاپە هەرە چاکەکانی «مەم و زین» و تا ئێستاش وەک سەرچاوەیێکی گرنگ تەماشا دەکرێ و نرخی ئەدەبی و زانستیی خۆی ون نەکردووە.

لێرەدا پێویستە ئەوە بوترێ ئەوانەی باسی ئەم چاپەیان بەرگوێ کەوتووە و چاویان پێی نەکەوتووە هەندێکیان سوورن لەسەر ئەوەی لەکاتی خۆیدا کەمالییەکان لە دوای چاپکردن هەموویان سووتاند و دانەیێکیش لەو چاپە نەماوە، ئەمەیان بۆ ئەوە بووە هەر کارێکی لەم لایەنەوە کردبێتیان و «مەم و زین»ی ئەستەمووڵیان نەکردبێ بەسەرچاوە کەس گلەییان لێ نەکا. بەڵێ ڕاستە لەگەڵ دەستپێکردنی تیرۆر لەلایەن کەمالییەکانەوە، هەوڵیان دا خەڵک و شارستانیەت و سامانی نەتەوایەتی کورد لەناو ببەن، بەڵام بەتەواوی بۆیان نەچووە سەر و «مەم و زین»ی خانیش زۆری سووتێنرا و کەمی ماوەتەوە.

٢- چاپی دووەمی «مەم و زین» لە ساڵی ١٩٤٧ لە چاپخانەی «آراس»، لە حەلەب دەرچووە، ئەم چاپە لەسەر کیسەی بەشیر شێخ حەسەن هاشمی کەوتۆتە ناوەوە. دەتوانرێ ئەم چاپەی «مەم و زین» بەبێ کەم و کووڕی بەچاپەکەی ئەستەمووڵ بناسرێ، چونکە بەبێ دەسکاری وەکو خۆی لەسەر چاپی ئەستەمووڵ تیپچن کراوە.


کاکل کربونه طرة هرسو — پرچم کربونه زلف و گیسو
وان لو کربو لباس تصریف — داقط نبتن لوان چو تکلیف
پوشیده لباس د لبراف — سترآن دکرن بسر کراف

ملاقی بوتا جدین و حمیه بەستی و زینی مستغرق بوناوانه د بحرا عشق و افینی

14

وان هردو کری دجامه تبدیل — وقتی دگرن دشهری تحویل
ناشکاء عجایبك نما وان — یك جزء ز عقل قط نما وان
دیتن د محله د زکاکان — هرکوچه و غرفه و شباکان
صد تازه جوان ز رنك سروان — دیبا و حریر و خز د بر وان
پانصد ز کج و کر و هروالان — او چند ز قسم پیر و کالان
انواع مذکر و مؤنث — هندك د برهنه هن ملبس
هندك د اعالی و اکابر — هندك د ادانی و اصاغر
پی خواس هنك هنك د سرکول — کاشو ز پیان و سروکی هود
سرمست هنك هنك د سرخوش — دم بسته هنك هنك د دم گش
گوینده هنك هنك د خاموش — پوینده هنك هنك د مدهوش
هن جامه دریده هن د سرخوش — هن عقل رمیده هن مشوش
هندان دکرن فغان و فریاد — هن بوی ز قید عقل ازاد

دەسنووسیکی «مەم و زین»

٣- لە ساڵی ١٩٥٤ گیوی موکریانی لە هەولێر چاپێکی دیکەی «مەم و زین»ی خستۆتە نێوەندی ئەدەبی کوردییەوە. لە ڕووی ڕاستی و زانستییەوە نابێ باوەڕ بەم چاپە بکرێ، چونکە بلاوکەرەوە دەسکاری هەندێ وشە و ڕستەی کردووە، لەمانە هەندێکیان لە سەردەمی ژیانی خانی لە ناوەوە نەبوون.

٤- محەممەد سەعید ڕەمەزان بۆتی کوردی سووریای عەرەبیزانی بەتوانا نویشکی «مەم و زین»ی خانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و لەساڵی ١٩٥٧ بەناوی «مەم و زین»ەوە لە شام (دیمەشق) بلاویکردۆتەوە. ئەوەی جێی داغە سانسۆری سووریا هەمموو ئەو بەندانەی کە خانی کوردایەتی تێدا کردوون بە بلاو کردنەوەیان ڕازی نەبووە. بەربەرەکانی کردنی کورد لە سووریا سیاسەتێکی هەمیشەیی و نەگۆڕاوە لە دوای دەستخستنی سەربەخۆیی ولاتەکە لەپاش جەنگی دووەمی گێتی.

٥- لە ساڵی ١٩٦٢ مارگریت ڕوودێنکۆ لە مۆسکۆ تێکستێکی تەواوی کوردی «مەم و زین»ی بلاوکردەوە لەگەڵ وەرگێڕانی بۆ زمانی ڕووسی. ئەم چاپە لەسەر بنچینەی تێکستی نۆ دەسنووسی جیاوازی نامەخانەکانی سانت پیترسبورگ کەوتۆتە ناوەوە. ئەم چاپەی «مەم و زین»ی خانی نرخێکی زانستیی هەیە، بەلام پێویستە هۆشیارانە وەکو سەرچاوەیێک بۆ لێکۆڵینەوە بەکار بهێنرێ چونکە مارگریت ڕوودێنکۆ لەگەلێ جێ لە مانا نەگەیشتووە. هەر ئەویش یەکێکە لەوانەی لەسەر ئەو باوەڕەن تاکە دانەیێکیش لە «مەم و زین»ی چاپی ئەستەموولَ لەبەردەستماندا نییە!

٦- لە ساڵی ١٩٦٨ گیوی موکریانی لە هەولێر جارێکی تر «مەم و زین»ی خانی چاپ کردەوە. ئەم چاپەی لە چاپی (١٩٥٤)ی باشتر دەکەوێتە ڕوو، چونکە هەندێ لەو دەسکارییانەی لە چاپی پێشووی کردبوونی، لەم چاپەدا چاکی کردوون و گەڕاندوونیەتییەوە بۆ ئەسڵەکە.

٧- لە ساڵی ١٩٦٨ محەممەد ئەمین بۆزارسلان تەواوی تێکستی «مەم و زین»ی لە تیپی عەرەبییەوە گۆڕییە سەر تیپی لاتینی لەگەڵ وەرگێڕانی لە زمانی کوردییەوە بۆ زمانی تورکی بەشێوەیێک لاپەڕەی لای دەستی چەپ (جووت) تێکستی کوردییە، لای دەستی ڕاست (تاک) وەرگێڕانە تورکییەکەیەتی. کتێبەکە لە ئەستەموولَ چاپکراوە. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشی بلاوکەرەوە لە بەشی پێنجەم کە خانی باس لە کورد دەکا ناچار بووە (٢٣) دێڕی لێ لابەرێ، ئەمانە ئەو دێڕانەن کە شاعیر باس لە شا و میر و سوڵتان دەکا بۆ کورد. بۆ زانستییەتی چاپەکەی بلاوکەرەوە ئەو دێڕانەی لایبردوون جێگەکانیانی بەنوختە پڕ کردۆتەوە، ئیتر سانسۆر دەستی لەم کارەدا نەبووە، بەڵکو بۆزارسلان ژیرانە ئەم کارەی کردووە بۆ ئەوەی کتێبەکە نەسووتێنرێ یا قەدەغە نەکرێ.

٨- محەممەد ئەمین عوسمان لە ساڵی ١٩٩٠ چاپێکی دیکەی «مەم و زین»ی خانی لە بەغدا بلاوکردەوە. گرنگیی ئەم چاپە لەوە دایە ئیملای نووسینەکەی تازەیە و لە هەمموو چاپەکانی پێش خۆی ڕێکوپێکترە، هەروەها مانای وشەکانی لێکداوەتەوە بەهەناسەیێکی فەرهەنگی، جگە لەوەی مانای هەندێ ڕستە و تەعبیری قورسیشی ڕوون کردۆتەوە. ئەم چاپە یەکێکە لە چاپە چاکەکانی «مەم و زین»ی خانی.



## **چیرۆکی مەم و زین لە ڕووی ناوەڕۆکەوە**

فەسڵەکانی مەم و زین وەکو لە چاپی یەکەمیدا هاتووە و یەکێکە لە چاپە باشەکان لە (٦٠) فەسڵ پێکهاتووە. بەڕاستی ئەمە هەندێ لە ناوەڕۆکی چیرۆکەکە ڕوون دەکاتەوە، ئەوەی پێویستە لێرەدا ئاشکرا بکرێ ئەوەیە چاپی ئەستەموولَ و حەلەب پارێزگاری ناوی فەسڵەکانیان کردووە و وەکو خۆی تۆماریان کردووە، بەلام لە چاپی محەممەد ئەمین بۆزارسلان و محەممەد ئەمین عوسمان ناوی فەسڵەکان کورت کراونەتەوە.

ئێمە لەم ماوەیەدا ناوی تەواوی فەسڵەکان دەخەینە پێش چاو:

١- فەسلێ یەکەم ناوی بۆ دانەنراوە، بێگومان لەبەر ئەوەیە بەموناجاتی مەزن دەژمێردرێ، وەکو پێشەکی پێشەکییان لە هەندێ چیرۆکی شیعری ڕۆژهەلاتیدا دەنووسرێ و ئینجا ئەو «موناجات» یا «ئیلاهییات»ە دەنووسرێ کە وەک پێشەکییێکە لە هەمموو کارێکی ئەم بابەتانەی بەرهەمی ئەدەبیدا بەکاردەهێنرێ.

٢- تیعدادێ نیعمەت شماری و تیکرارێ شوکر گوزارییا باری د سوورەتێ ئایینەداری و پەردە بەرداریێا پەروەردگاریدا د گەل ئیختیتاما ب موناجاتەک موختەسەرێ کوردی.

٣- د نەعتا قەلەمێ مەسنووعات و سیپڕێ دەفتەری مەوجوودات و عەقلێ مەعقوولات و پێش دەستێ مەخلووقات حەزرەتێ سەیید و لسادات محەممەد ئەلموستەفا (علیه أفضل الصلوات).

٤- ئیستیدعایێ شەفاعەت و ئیستیشفاعێ مەغفیرەتە ژ جەنابی ساحیبی سەریری شەفاعەت د سوورەتی میعراجێ دا ب بال حەزرەتی عیززەت.

٥- ئەشعارا مەدحییەتا تەوائیفی د کوردانە ب شەجاعەت و غیرەتی و ئیزهارا بەدبەختی و بێ تالیعییا وانە دگەل هەندە سەماحەت و حەمییەتێ.

٦- سەبەبی نەزما کیتابە ب ڤێ ئەزمانێ، د سوورەتێ شەکوایا ژ دەورانێ و گلیا ژ ئەبنایێ د زەمانێ کو ل بال وان یەکسانە هونەرا دانایی دگەل عەیبا نادانێ.

٧- فەهرەستێ سەر ئاغاز کیتابی ئەخبار و ئەشعار نەعتی ئەلقاب و ئاسارە د سوورەتێ ئیعتیراف و ئیقرارا ب عیجز و ئینکیساری دگەل ئیعتیزارا گوفتارێ.

٨- مەبدەئێ مەقالە د نەعتا حاکمێ بوهتان خودانێ ئیقبال ئەمیر زەینوددین ئیبن ئەمیر ئەبدال دگەل وەسفا هەردو هەمشیرەیێ دوی د ساحیبی جەمال زین و ستی و بێ میسال.

٩- تەحسینا قوماش و کالایێ والایی حوسنا حەبیبانە عموومەن، تەعریزا جەوهەرێ بەهای جەمالا ستی و زینانە مەخسووسەن.

١٠- عەتفێ عەنان و لیجامە ب سەر ئەنجامێ کەلام.

١١- داستانا بەیانا نەوروزا سولتانی تەسمییەیی موسیمی سوروور و شادمانی ب مەرسومێ قەدیمی کوردستانی کو وان دگوتی سەر سال عەد دکرن ب عیدی ویسال.

١٢- ب دەرکەتنا شهریانە ب دەشتی ژ بۆ سەیرانا سەر سال و گشتی.

١٣- مورەخخەس بو ناو شاقان ب بکلکشتا سەر سالی رەغبەت کرا وانە ببازارا حوسن و جەمالێ.

١٤- مولاقی بۆنا تاجدین و مەمییە ب ستی و زینێ موستەغرەق بۆنا وانە د بەحرا عیشق و ئەڤینێ.

١٥- هشیارییا مەمێ و تاجدینێ ژ بێ هۆشی و مەخموورِیا شوربێ عیشقێ ئاگاهی و خەبەر دادیا وانە ژ سەبەب و واسیتەیێ و مقێ.

١٦- موعاوەدەتا ستی و زینێ ژ سەرسال و کشتێ ئیستیتلاعا دایەیی لیماجەرا و سەرگوزەشتێ.

١٧- تیکرار ئیستیخبارا دایەیی ژ کنە ماجەرایێ تەسریح تەقریر ئەوانە ژ کەیفییەتا تەئسیرا هەوایی.

١٨- تەفەححوس و تەفائولا دایەیی ژ رمالێ ژ کەشفا حەقیقەتا وی ئەحوالێ.

١٩- دەولّەت و تەقریرا رمالیە ژ بو پیری موافیق ما فیلزەمیر و موخالیف تەقریری.

٢٠- هەم سوحبەتا و شاقان ب هەم خەلوەتییا موشتاقان واقیفیا ویە ل سەر وەقتێ عوششاقان.

٢١- فیکریانا دایەیی ڤیا دلداران ئاکە کر ناوانە ژ ئیسم و رِەسمێ بریندارِان.

٢٢- شیفا بەخشیا تەبیبەیی ل دەردێ عەلیلان شەفەقەت و مەرحەمەتا میرە ل حالێ زەلیلان.

٢٣- عەرووسیا ستی یێ ژ بۆ تاجدین تەهییەیی ئەسبابی شاهیە ژ تەهنیا غەمگینی.

٢٤- مەقالی ئیشتیعالی شەمعی جەمالی مەحبووبە مەقامی ئینتیقالی ئیشتیغالی ویسالی مەتلووبە.

٢٥- ووسوولی کەعبەیی موراد و تەوافە وەحوسوولی مەقسەدی مەرام و زەفافە (وصول کعبهء مراد و طوافه و حصول مقصد مرام و زفافه).

٢٦- حیلە پردازی و فیتنە ئەنگێزیا بەکرە ژ حەسەد و رزیا ل تاجدین کو ب وی سەبەب میر نەدا مەمی زین.

٢٧- نائومێدییا زینییە ژ دەولەتا وەسلەت و حەزرەتی دەرد مەندییا وییە ژ کەربەتا فیرقەت و حەسرەتێ.

٢٨- هەمدەمییا زینێ دگەل غەمان ب سەبەبێ نیفاق و نا ئیعتیمادییا هەمدەمان.

٢٩- موعاتەبیا زینێ دگەل ستی یێ گازندا حووری ژ پەری یێ.

٣٠- موکالەمەیی هەمزاری شەمعە موداوەمەیی خوونرێزی دەمعە.

٣١- بولبولییا زینێیە دگەل پەروانییا وییە دگەل دیوانەیی.

٣٢- مەجنوونیا مەمییە ژ عیشقا لەیلایی وامیقیا وییە ژ دەردی عەزرایی.

٣٣- موخاتەبییا مەمییە دگەل شەتتی جزیری موجاوییبیا ژ عیشقا بێ نەزیری.

٣٤- موباحیسیا مەمییە دگەل بایی هەوادارییا دگەل هەوایی.

٣٥- موجادەلییا مەمییە ب دل گول را موحارەبەیا پەروانەیی ب بولبول را.



٣٦- چوونا میر زێندینە ب سەید و نێچیرێ ئازادییا مەمی و زینە ژ قەید و زنجیرێ.

٣٧- داستانی بوستانی جەننەت نیشان مێرانە کو بوویە مەجمەعولبەحرەینا عیشقا هەردو دلفگاران مەتلەعولنەییرینا حوسنا هەردو گولعوزاران.

٣٨- رِەهاییا زینێیە ژ قەیدا تەعەلوقا ئەغیاران تەنهایی و تەکەلووما وییە دگەل پەلک و داران.

٣٩- تەقازایی داعییەیی دیداری دلدار و مولاقاتە ژ بۆ مەمی رِا ژ جەنابی واهیبولمەرام و قازییەلحاجات (تقاضای داعیهء دیدار دلدار و ملاقاته ژ بو ممی را ژ جناب واهب المرام و قاضي الحاجات).

٤٠- فیکریانا میر و میرزانە ژ شکاری سەرخوەشیا مەمێ و زینییە ب مەیا دیداری بێ خەبەرییا وانە ژ سیرِرِ داهاتنا میرە د وەقتێ ئێڤارێ.

٤١- رِابوونا تاجدینە ژ دیوانی د وی دەمیدا سۆهتنا مال مولکانە دەرییا مەمیدا.

٤٢- ئاگاهییا میرە ل عیشقبازی و یارییا مەمی زینان ب ئیفشا و ئیلقایا نەیاران و موزەبزیبینان.

٤٣- شترەنج بازییا مەمێ و میرە ب شەرتی دلّخواز قدانا دامی تەزویرە ژ بۆ کەشفی رِاز.

٤٤- خولووسییەت و خەلاسییا مەمییە د خەلوەتا زینداندا ژ سیفاتی د حەیوانی موشارەکەت و موشاکەلەتا وییە ب ئەخلاقی د رِووحانی.

٤٥- مەئیووسییا زینێیە ب سەبەبی مەحبووسییا مەمی مەئنووسییا وییە ب غەم و دەرد و ئەلەمی.

٤٦- تەهەووا تاجدینە ژ غیرەتا برایی مەشوورەتا دگەل برانە ل خەلاسییا بی نەوایی.

٤٧- تەعەسسوبی تەدارکا تاجدین و برانە ب ئەمرێ غیرەتی سورایا وانە ل هەسپی حەمییەتی.

٤٨- تەدبیرا بەکرە ژ بۆ دەفعا مەزەننە و عینادی تەزویرا وییە ژ ترسا فیتنە و فەسادی.

٤٩- نەسیحەتا ساحیب غەرەزی پرِ مەرِەزی دل کل ژ بۆ میری بێ تەمەییز سادە دل.

٥٠- رِوخسەت دانا میرە ل دیتنا دلّداری بی هوەش بوونا زینێیە ژ زەوق و شەوقا دیداری.

٥١- تەوسییە و تەدارکا زینێیە ژ بو سەفەرا ئاخیرەتی تەهییئەیی ئەسبابی جیهازە ژ بۆ عەرووسییا جەننەتێ.

٥٢- پەشیمانیا میر زێندینە ل مەحەببەتا مەم و زینان مەرحەمەتا وییە ل حالی نازەنینان مرنا مەمییە ب ئاخەفتنا برینان.

٥٣- تەعزییە و ماتەم و مەرسییە و شیوانا مەمی شەهیدە مرنا بەکری شەقی ب دەستی تاجدینی سەعیدە.

٥٤- ئیلتیماس و ئیستیدعایا زینییە ژ بو بەکری موفسیدرا عوزر خواهییا وییە ژ بۆ ئەوی مولحیدرا.

٥٥- تەجهیز و تەکفین و تەدفینا مەمی مەحرووم غەمگینە هەم نەفەس و هەم قەفەس بوونا ب فەوتا زینا نازەنین و غەم رِەڤینە.

٥٦- تەسویلی تەفاووت و ئیختیلافی خیلقەتە تەمسیلی تەقازای سورشت تینەت و فیترەتە.

٥٧- میسالی سەرەنجامی بەنی ئادەم و مەئال نە ب حەسەب زاهیری سوورەتی حالە بەلکی موتەعەللیقی باتینی مەعنا و مەوقووفی مەشیئەتی زولجەلالە.

٥٨- ئیسباتی خەواس و کەمالی جەوهەر عیشقە کو کیمیایی ئەکبەر و گوگردی ئەحمەر ژ بۆ خودانی لەورا بەهیمی و درندی و شەیتانی دکەتە ملک د نەفسا ئینسانی.

٥٩- بەیانی مەراتیب و مەداریجی سولووک و وسولْ ئیلا ئەڵڵاه و مەراسیمی فەنای فیللایە و بەقای بیللاهە (بیان مراتب و مدارج سلوک و وصول الی الله و مراسم فنای فی الله و بقای باللهه).

٦٠- خاتیمییا کیتاب و نامەیی د سوورەتی خیتابە دگەل خامەیی هەرچەند غەرەز خەتمی کەلامە لاکین ل موتەکەللیمی ئیهامە.

که لە خوێندنەوەی ناوی فەسڵەکانی «مەم و زین» دەبینەوە ڕاستییێکی شاراوەی گرنگ دەدۆزینەوە، ئەویش ئەوەیە ئەم ناوانە یا ڕستە ئەدەبییانە بەهەناسەییێکی شیعرایەتی نووسراونەتەوە، نویشکێکی چڕی ناوەڕۆکی فەسڵەکان دەخەنەڕوو. هەرچەند ئەم ناوانە لە شێوازی نووسینی خانی دەکەن، بەڵام ئێمە نازانین ناوەکان لە داهێنانی شاعیرن، یا ئەوانەی لە پاشانا دەسنووسی «مەم و زین»یان نووسیوەتەوە، ئەوان ئەم ناوانەیان بۆ فەسڵەکان داناوە! ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە ئەو کەسەی چاپی یەکەمی ئەستەمبوولّی بلاوکردۆتەوە یا لەو دەسنووسەی تێکستەکانی لێ وەرگیراون ناوی فەسڵەکان تۆمارکراوە، یا خۆی ئەم ناوانەی داناوە. هەرچۆنێ بێ ئێمە مەیلمان زیاتر بۆ ئەوە دەچێ ناوی فەسڵەکان لە دانانی خانی خۆی بێ، یا کەسێکی یەکجار شارەزا لە گێتیی ناوەوەی خانی و چیرۆکی شیعری نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دایناب‌ێ.

### مەم و زین لە پاڵ دڵداریدا لە ژیانی ئادەمزاد دەدوێ

خانی شاعیرێکە ئەو لایەنەی ژیانی گرتووە ئادەمزاد لە سەردەمێکدا بەختیارە لە کاتێکی دیکەدا لەناو تەم و مژی بەدبەختیدا خنکاوە. وەکو سیاسییێک خۆی پیشان دەدا، بەڵام سیاسەتەکەشی بەشیعرایەتییەوە بەستراوە. واتە ئیستێتیکی شیعرەکانی بە جۆرێک نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و سیاسەت دەخەنە بەر چاو، وەکو ئەوەی ئەم بیروڕایانە گۆڕانیان بەسەردا نەیە، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەم دیاردانە دەگۆڕێن، لەو حاڵەتەدا ئەگەر بشگۆڕێن لە نرخی شیعرەکان هیچ شتێک کەم نابێتەوە چونکە بەهۆی داهێنانی شاعیر مەسەلە سیاسییەکانی ڕۆژانەش دەبن بەموتلەق.

خانی لە «مەم و زین»دا زاراوەییێکی یەکجار زۆری سۆفیزم بەکاردێنێ، زیاتر خەریکی وەسفی سۆفیزمە، لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلام نەچۆتە دەرەوە، واتە بەشێوەییێک سۆفیزم بەکاردێنێ وەکو شەریعەت تەماشای دەکا. بەم جۆرە بۆچوون و وێنەکانی لە دەوری زاراوەی سۆفیزمی موسڵمانی دەسووڕێنەوە و ناچنە ناو شیعری داهێنانی سۆفیزم (عیرفانی). بەڕاستیش خانی خۆی ئارەزووی ئەمەی نەکردووە. شتی هەرە گرنگ بیروبۆچوونە سیاسییەکانیەتی لە بارەی چارەنووس و دواڕۆژی کوردەوە.

چیرۆکی شیعری «مەم و زین» وێنەی بەرزی زمانی ئەدەبی کوردییە، شاعیر لەو ڕۆژگارەدا لەوە



گەیشتبوو کە پێویستی سەرشانیەتی زمانی کوردی بپارێزێ و پێشی بخا، چونکە لەو سەردەمانەدا زمانانی نەتەوە داگیرکەرەکان (ڕۆم و عەجەم) سەپێنرابوونە سەر کورد.

مەم و زین شانازی شیعری کلاسیکی کوردییە، ئەم بەرهەمە بەرزە لە لایەن هەموو میللەتەوە پەسەند کراوە، نەک تەنیا لە ڕووی جوانکاری شیعرایەتییەوە بەڵکو لەبەر ئەوەی شاعیر بۆ یەکەمین جار مەسەلەی نەتەوایەتی (کوردایەتی) هێناوەتە ناو شیعرەوە، بۆ ئەم ئامانجە فەسڵی پێنجەمی «مەم و زین»ی تەرخان کردووە. لە دوای ئەوەی پێویستییەکانی سەرەتای چیرۆکی شیعری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەیاندۆتە ئەنجام، ئەو فەسڵەی بۆ مەبەستێکی تازە تەرخان کردووە، ئەم مەسەلەیە لەم جۆرە شیعرانەدا، لەو سەردەمانەدا باو نەبوو.

زۆر کەس باسیان لە خانی و مەم و زین کردووە، بەڵام ئێمە تەنیا قسەکانی یووسف ئوربێلیی دۆستی کورد بەبەڵگە دێنینەوە:

«... ئەگەر بیر لە نیشتمانپەروەری و لە شاعیرییەتی بکرێتەوە، پێویستە بەراورد لە نێوان سێ شاعیری مەزنی ڕۆژهەڵات بکرێتەوە، فیردەوسیی عەجەم، ڕووستاڤێلیی گورج و ئەحمەدی خانیی کورد، چونکە ئەم شاعیرانە بوون بەشاعیری نەتەوە و شیعرەکانیان بوونەتە گۆرانیی میللەت، هەتا لەناو ئەو کەسانەی تەنیا تیپێکی زمانەکەشیان ناناسن».

مەم و زین بەهەموو قورسایەتییێکی هونەرییەوە دەچێتە ناو درەوشاوەترین چیرۆکی شیعری تراجیدی لەناو بەرهەمی شیعری هەموو نەتەوەکانی گێتی.

### گەشتێک لە گێتی شیعرایەتی مەم و زین
### موناجاتی مەزن و موناجاتی چیرۆکەکە

ئەم بەشە سەرەتا و فەسڵی یەکەمی «مەم و زین»ە، وەکو قەسیدەییێکی سەربەخۆ دەکەوێتە بەرچاو و دەچێتە ناو بابەتی شیعری موناجات و ئیلاهییاتەوە، بەتایبەتی خانی نازناوی خۆی لە دوا دێڕی شیعرەکەدا بەکاردەهێنی. قەسیدەکە بەم دێڕانە دەست پێدەکا:

سەر نامەیێ نامە نامێ ئەڵڵا
بێ نامی وی ناتەمامە وەڵڵا
ئەی مەتلەعێ حوسنێ عیشقبازی
مەحبووبێ حەقیقی یو مەجازی
نامێ تەیە لەوحێ نامەیا عیشق
ئیسمی تەیە نەقشێ خامەیا عیشق
بێ نەقشێ تە نەقشێ خامە خامە
بێ نامی تە نامە نا تەمامە

نامێ تەیە شاهێ بەیتێ مەقسوود
فیهرستێ موکاتەباتی مەحموود

بەم دێڕانەش دوایی بەشیعرەکە دێنێ:

ئەم غافیل و عاتیل و گونەهکار
مایینە د قەیدا نەفسا ئەمار
نینن مە د قەلبێ فیکر و زیکرەک
ناکەین ب زەبانێ حەمد و شوکرەک
(خانی) کو نەهن ب قەلبی زاکیر
باری بدە وی زەبانی شاکیر

لەگەڵ ئەوەی خانی لەم شیعرەدا شاعیرییەتێکی بەرزی نواندووە، بەڵام گرنگی بەرهەمەکە زیاتر لەوە دایە بۆ یەکەمین جار ئەم بابەتە شیعرە کلاسیکییە ئیسلامەوییەی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

لە موناجاتی سەرەتایی چیرۆکی مەم و زیندا خانی دەڵێ:

ئەی شوکرێ تە جەوهەرا زەبانی
وەی زیکرێ تە سەیقەلا جەنانی
ئەی واحیدێ بێ شەریکێ یەکتا
وەی واجیدێ بێ نەزیر و هەمتا
ئەی باقی یێ بێ زەوالێ دائیم
وەی هادی یێ بێ فەنایێ قائیم
ئەی خالیقێ ئەرز و ئاسمانان
وەی خالیقێ جوملە ئینس و جانان
مولک و مەلەک و فەلەک ب جارەک
بیلجوملە تە چێ کرن تەبارەک

بەم دێڕانەش دوایی بەشیعرەکە دێنێ:

خانی ب نەزانییا خوە دەرحەق
گومراه ببت نە دوورە ئەلحەق
ئیللا کو مەگەر موعین خودا بت
یان ڕەهبەرێ وی موستەفا بت
یارەب تو ب حەققێ موستەفا کەی



(خانی) ب خوە ڕا تو ئاشنا کەی

ئەم بڕە شیعرەی شاعیریش دەکرێ بەقەسیدەییێکی سەربەخۆ بژمێررێ، ئەگەر خانی دەفتەری دیوانی شیعری بوایە، هیچ گومان لەوەدا نەبوو ئەم پارچە شیعرە و موناجاتە مەزنەکەی پێشوو و هەموو نەعتەکانی «مەم و زین» لە سەرەتای دیوانیدا تۆماری دەکردن.

**نەعتی پێغەمبەر**

لە دیباجەی «مەم و زین»دا خانی دوو قەسیدەی لە نەعتی پێغەمبەر تۆمار کردووە. لە سەرەتای قەسیدەی یەکەمدا دەڵێ:

ئەشیا ب حەسەب دەلیل و بورهان
نابن چو ئەگەر وجووب و ئیمکان
واجیب یەکە زاتێ کبریایە
مومکین پڕە جەمعێ ماسیوایە
وی واجیبی مومکیناتی بەرقەع
مومکین وی ژ بۆ خوە کرنە مەتلەع
یەعنی ئەوی ڤی ببت مەوبەرهەن
حوسنا وی بدەرکەڤت ژ مەکمەن
گەنجینەیێ جەوهەرێ ببت فاش
سابیت ببتن ژ نەقشێ نەققاش

بەم دێڕانەش دوایی بەشیعرەکە دێنێ:

سەد جار ب ژێ تە ئەی کەرەم کار
گەر دێ مە هەبن گونەه دو سەد جار
سەد مەرتەبە گەر چ ئەم خرابین
ئەمما ژ تە نائومێد نابین
حەتتا بگەهێتە (خانی)یێ ژار
ناپاک و پەلید و (واجب النار)
ئەو ژێ ب خرابی یو سەیینی
دەعوا دەکەتن ب ئوممەتینی
وی بەد عەمەلێ وەکی کیلابان
باری بکە پەیڕەوێ سەحابان

لە قەسیدەی دووەمی نەعتەکەدا خانی گەورەیی پێغەمبەر بەسەر دەکاتەوە و بەنزیکی لە خوداوە هەڵدەڵێ، واتە شیعرەکە وەکو بابەتێک لە بابەتەکانی موناجات دەکەوێتە ڕوو. لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ:

ئەی واسیتەیێ وجوودێ کەونەین
شایستەیێ قوربی قابە قەوسەین
شاهنشەهێ تەختگەهێ مەدینە
موعجیز ژ تە ئەو قەدەر مە دینە
سەیرا فەلەکان ل نک تە گاڤەک
فەخرا مەلەکان ژ تە سلاڤەک

بەم دێڕانەش دوایی بەشیعرەکە دێنێ:

ئەلقیسسە بکەی کو دێوێ سەرکەش
تەنها وو تەنێ بچیتە ئاتەش
فیلجوملە مە جوملە خاس و عامان
عاسی یو شەقی یو نا تەمامان
تێکرا ب شەفاعەتا خوە خاس کە
ڤێکرا مە ژ ئاگرێ خلاس کە

تا ئێرە خانی لەسەر بەرنامەی چیرۆکی شیعری کلاسیکی لاسایی نەتەوە موسڵمانەکان ڕۆیشتووە، سەرکەوتووانە پێڕەوی هەموو دەستوورەکانی ئەم جۆرە شیعرەی کردووە بەتایبەتی لەڕووی ناوەرۆکەوە.

کەچی خانی لە دوای نەعتی پێغەمبەر دەبوو بچێتە ناو چیرۆکەکەوە، بەڵام ئەم ڕچەی شکاند و باسکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی کوردی (کوردایەتی) کردە جەوهەرێک لەو جەوهەرە گرنگ و پێویستانەی دەبێ لە پێشەکیی هەموو کارێکی لەم جۆرەی «چیرۆکی شیعری»دا لەبەرچاوبن. ئەم کردەوەیەی خانی لەم بابەتە شیعرانەدا پێش ئەو ڕووی نەداوە.

لەم ماوەیەدا تەواوی ئەو بڕە شیعرانە دەخەینە پێش چاو کە بریتییە لە (٩٨) دێڕە شیعر، بەگشتی لە «کوردایەتی» و «سامانی نەتەوایەتی» دەدوێن.

## کوردایەتی

خانی لە پێشەکیی ئەو بڕە شیعرە کۆمەڵایەتی – سیاسییانە لەسەر ڕێ و شوێنی ئەدەبی کلاسیکی دەڕوا، ڕوو دەکاتە مەیگێڕ، داوای شەرابی لێ دەکا، بۆ ئەوەی سەرخۆش بێ، چونکە سەرخۆش بۆی هەیە هەموو نهێنییێک ئاشکرا بکا.

ساقی تو ژ بۆ خودێ کەرەم کە
یەک جورعە مەیێ د جامێ جەم کە



دا جامی ب مەی جیهان نوما بت
هەرچی مە ئیرادەیە خویا بت
دا کەشفی ببت ل بەر مە ئەحوال
کانێ دبتن مویەسسەر ئیقبال
ئیدبارێ مە وا گهـا کەمالێ
ئایا بووە قابیلێ زەوالێ
یا هەر وەهە دێ ل ئیستیوا بت
حەتتا وەکو دەورێ مونتەها بت

لە دوای ئەوە خانی کۆمەڵایەتی و سیاسەت دێنێتە ناو شیعرایەتییەوە، بێگومان لەو جۆرە شیعرەدا بیر بەسەر خەیاڵدا زاڵ دەبێ، بەڵام شاعیرێکی وەکو خانی توانیویەتی ئەو حەقیقەتە ڕیالیزمییانە بخاتە ناو خەیاڵی شیعری بەرزەوە، جۆرە شیعرێکی پەروەردەیی (دیداکتیکی) هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

لە دوای جەنگی چالدیران (١٥١٤) و بۆ یەکەم جار دابەشکردنی خاکی کورد بەسەر هەردوو دەوڵەتەکەی عوسمانی و عەجەم، بیری نەتەوەیی بەشێوەیێکی نوێ کەوتە ناوەوە، هەستکردن بەبوونی نەتەوە بزووتنەوەییێکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری لە کوردستانی سەروودا دروستکرد، شاعیرانی وەکو عەلی هەریری و مەلای جزیری و فەقێی تەیران پەیدابوون، کاری ئەوان ئەوە بوو بڵێن کورد هەیە و زمانەکەی ئەو زمانەیە کە ئێمە شیعری پێ دەنووسین.

ئەگەر قۆناغی ئەم شاعیرانە دروستبوونی «هەست» بووبێ، خانی کەوتە دەربڕینی ئەو هەستە و بەپراکتیک خستییە ناو شیعرەکانیەوە، بۆچوونەکانی شاعیر دوو مەسەلەی یەکجار گرنگی ئەو ڕۆژگارەمان بۆ دەور دەکاتەوە یەکەمیان دواکەوتوویی و پەژمردەیی و ژێردەستی و هەژاری میللەتی کورد و دووەمیان داوای سەربەخۆیی لە پێناوی ئەوەی کۆمەڵی بەدبەختی کورد وەربگێڕێتە سەر کۆمەڵێکی بەختیار.

خانی نەبوونی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی سەربەخۆ بەهۆی بنچینەیی دادەنێ بۆ هەموو ئەو مەینەتییەی کورد تێیدا دەژی:

قەت مومکینە ئەڤ ژ چەرخێ لەولەب
تالیع ببتن ژ بۆ مە کەوکەب
بەختێ مە ژ بۆ مەرا ببت یار
جارەک ببتن ژ خوابێ هشیار
ڕابت ژ مە ژی جیهان پەناهەک
پەیدا ببتن مە پادشاهەک

شیریٚ هونەرا مە بیٚتە دانین
قەدریٚ قەلەما مە بیٚتە زانین
دەردیٚ مەبب‌ینتن عیلاجیٚ
عیلمی مە ببینتن ڕەواجیٚ
گەر دیٚ هەبوا مە سەرفرازەک
ساحیٚب کەرەمەک سوخەن نەوازەک
نەقدیٚ مە د بوو ب سیککە مەسکووک
نە دما وەهە بیٚ ڕەواج و مەشکووک
هەرچەندی کو خالیس و تەمیزن
نەقدەینی ب سکەییٚ عەزیزن
گەردی هەبوا مە پادشاهەک
لائیق بدیا خودیٚ کولاهەک
تەعیین ببوا ژ بۆ وی تەختەک
زاهیر ڤە دبو ژ بۆمە بەختەک
حاسیل ببوا ژ بۆ وی تاجەک
ئەلبەتتە د بو مە ژی ڕەواجەک
غەمخواری دکر ل مە یەتیمان
تینانە دەریٚ ژ دەست لەئیمان
غالیب نە د بو ل سەر مە ئەڤ ڕووم
نەدبوونە خرابەییٚ د دەست بووم
مەحکوومیٚ عەلییە وو سەعالیک
مەغلووب و موتیعی تورک و تاجیک

لەو سەردەمەدا خانی بیری لەوە کردۆتەوە دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوا کەسانیٚکن یا میللەتانیٚکن کورد لە هەموو لایەنیٚکی هۆش و فامەوە لەوان کەمتر نییە، لیٚرەدا پەنا بۆ بەخت دەبا و لە کردگار دەپاڕیٚتەوە کاریٚکی وا بکا کوردیش بەختی یار بیٚ. لیٚرەدا ئەگەر شاعیر بەچاویلکەییٚکی میتافیزیکییانە لە مەسەلەکە بیربکاتەوە، لەلاییٚکی دیکەوە ڕیالیزمییانە هۆی دواکەوتنی کورد لەوە دەبینیٚ چونکە دەوڵەتی نییە. لەو دیاردەیە سەری سوڕ دەمیٚنیٚ و دەڵیٚ:

ئەمما ژ ئەزەل خودیٚ ووسا کر
ئەڤ ڕووم و عەجەم ل سەر مە ڕاکر



تەبەعییەت وان ئەگەر چ عارە
ئەو عار ل خەلقیٚ نامدارە
نامووس ل حاکم و ئەمیران
تاوان چییە شاعیر و فەقیران
هەرچی برە شیریٚ دەستی هیممەت
زەبت کر ژ خوە را ب میٚری دەولەت
لەورا کو جیهان وەکو عەرووسە
ویٚ حوکمیٚ ددەستیٚ شیریٚ ڕووسە
لیٚ عەقد و سەداق و مەهر و کابین
لوتف و کەرەم و عەتا وو بەخشین
پرسی ژ دنیٚ من ئەڤ بە حیکمەت
مەهرا تە چ؟ گۆتە من کو هیممەت
حاسیل کو دنیٚ ب شیر و ئیحسان
تەسخیر دبت ژ بۆبی ئینسان
ئەز مامە د حیکمەتا خودیٚ دا
کرمانج د دەولەتا دنیٚ دا
ئایا ب چ وەجهی مانە مەحرووم
بیلجوملە ژ بو چ بوونە مەحکووم
وان گرتی ب شیری شەهریٚ شوهرەت
تەسخیر کرن ب لاد هیممەت
هەر میرەکیٚ وان ب بەزلی حاتەم
هەر میرەکیٚ وان ب ڕەزمی ڕۆستەم
ب فکر ژی عەرەب حەتا ڤەگورجان
کرمانجییە بوویە شبهی بورجان
ئەڤ ڕووم و عەجەم ب وان حەسارن
کرمانج هەمی ل چار کەنارن
هەردوو تەرەفان قەبیلیٚ کرمانج
بۆ تیری قەزا کرینە ئامانج

گوویا کو ل سەر حەددان کلیدن
هەر تائیفە سەددەکن سەدیدن
ئەڤ قولزومێ ڕووم و بەحرێ تاجیک
هندی کو بکەن خورووج و تەحریک
کرمانج دبن ب خوونێ مولەتتەخ
وان ژێک ڤە دکەن میسالێ بەرزەخ
جوامێری یو هیممەت و سەخاوەت
مێرێنی و غیرەت و جەلادەت
ئەو خەتمە ژ بۆ قەبیلێ ئەکراد
وان دانە ب شیر و هیممەتێ داد
هندی ژ شەجاعەتێ غەیوورن
ئەو چەند ژ مینەتێ نوفوورن
ئەڤ غیرەت و ئەڤ عولووێ هیممەت
بوو مانیعێ حەملێ بارێ میننەت

لەو پارچە شیعرەدا خانی ئەوە دەردەبڕێ گریمان ڕۆژگار یا هەر هێزێکی دیکە ئەگەر ئارەزووی ئەوەی بووبی تورکی عوسمانی و عەجەم بەسەر ئێمەدا زاڵ بن و پێویستە ئێمە ببین بەکۆیلەی ئەوان، دیارە ئەمە شوورەیییە بۆ ئێمە، بەڵام تاوانی ئەمە دەکەوێتە سەر ناودارانی نەتەوە، شەرم بۆ فەرمانڕەوا و میرانە، شاعیر و فەقیر تاوانیان نییە. لە هەموو کۆمەڵێکدا و لە هەموو ڕووداو و کردەوەیێک فەرمانڕەوا بەرپرسیارە خەڵکی ناو کۆمەڵ بەرپرسیار نین.

خانی سەری لە حیکمەتی کردگار سوڕماوە، بۆچ کورد دەوڵەتی نییە؟ هەر خۆی لەسەر ئەو باوەڕەیە کە دەبێ سەربەخۆیی خۆی هەبێ چونکە هەموو مەرجەکانی بوونی دەوڵەت لەناو کورددا هەن، بیر و هۆش و فام و مێرخاسی و ئازایی و چاوتێری و کارکردن.

شاعیر مەینەتی کورد لە نەبوونی دەوڵەت دەدۆزێتەوە و دەڵێ:

لەو پێکڤە هەمیشە بێ تفاقن
دائیم ب تەمەررود و شیقاقن
گەر دێ هەبوا مە ئیتتیفاقەک
ڤێکرا ب کرا مە ئینقیادەک
ڕووم و عەرەب و عەجەم تەمامی
هەمیان ژ مەرا د کر غولامی



تەکمیل دکر مەدین و دەولەت
تەحسیل دکر مە عیلم و حیکمەت
تەمییز دبوون ژ هەڤ مەقالات
مومتاز دبوون خوەدان کەمالات

خانی ڕاستییێکی مێژوویییمان بۆ دەوردەکاتەوە بەوەی لەناو کۆمەڵی کورددا «یەکێتی» نەبووە، لە سەرەتای مێژووی کوردەوە ئەم دیاردە نالەبارە لەناویاندا بووە، تا سەردەمی خانی.

شاعیر بەو داخەوە سەری ناوەتەوە کە سەربەخۆیی کوردی نەدیوە، گیانی پاکی لەوانەیە هەست بەوە بکا کە ئەو نەبوونی یەکێتییە تا ئێستا لە کۆمەڵی کوردەواریدا لەناو نەچووە.

**سامانی نەتەوایەتی**

لە خوێندنەوەی ئەم فەسلەی «مەم و زین»دا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ خانی دوو مەبەسی سەرەکی پاڵی پێوە ناوە ئەم چیرۆکە شیعرییە بێنێتە بەرهەم. بەڕاستی لەم کارەیدا هەر دوو مەبەسی پێکاوە. یەکەمیان لە پەنای ئەو دڵدارییەی نەگەیشتۆتە ئەنجام و بەڕاستیش دەبوو نەگاتە ئەنجام و تراجیدییانە کۆتایی پێ بێ، شاعیر دەیەوێ بەشێوازێکی سیمبۆلییانە (ڕەمزییانە) دەردی دڵی خۆی دەرببڕێ، هەر ئەمە خۆشی وەکو کارێکی ئەدەبی مەبەسی دووەمی شاعیر دەهێنێتەجێ. لێرەدا خانی وەکو شاعیرانی پێش خۆی و پاش خۆی لە کورد و بێگانە گومانی لەوەدا نییە کە کورد پێویستییەکانی بوونی بەنەتەوەی تێدا هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شاکاری ئەدەبی بۆ دروست دەکا، یا هیچ نەبێ جۆرە بەرهەمێکی ئەدەبی بۆ دەنووسێتەوە کە نەیبێ، بۆ ئەوەی کەس نەڵێ، لە ئەدەبی کوردیدا چیرۆکی شیعری یا مەلحەمە و ئیپیکی پلە بەرز نییە.

خانی ژ کەمالێ بێ کەمالی
مەیدانا کەمالێ دیتی خالی
یەعنی نە ژ قابیل و خەبیری
بەلکی ب تەعەسسوب و عەشیری
حاسیل ژ عیناد ئەگەر ژ بێداد
ئەڤ بیدعەتە کر خیلافێ موعتاد
سافی شەمراند ڤەخواری دوردی
مانەندێ دەری لیسانێ کوردی
ئینانە نیزام و ئینتیزامێ
کێشایە جەفا ژ بۆیی عامێ
دا خەلق نەبێژتن کو ئەکراد

بێ مەعریفەتن بێ ئەسل و بنیاد
ئەنواعێ میلەل خودان کتێبن
کرمانج تەنێ د بێ حسێبن
هەم ئەهلی نەزەر نەبیێن کو کرمانج
عیشقێ نەکرن ژ بۆ خوە ئامانج
تێکدا نە د تالیبن نە مەتلووب
ڤێکرا نە موحیبن ئەو نە مەحبووب
بێ بەهرەنە ئەو ژ عیشقبازی
فاریغ ژ حەقیقی یو مەجازی
کرمانج نە پڕ د بێ کەمالن
ئەمما د یەتیم و بێ مەجالن
فیلجوملە نەجاهیل و نەزانن
بەلکی د سەفیل و بێ خوەدانن

خانی لەوە گەیشتووە کە کورد بێ بەهرە نییە، توانای ئەوەی هەیە خۆی گەورە بکا و وەک کەسانێک خەڵکی حسێبی بۆ بکەن، بەڵام ئەو هەڵسوکەوتەی بۆ هەڵنەکەوتووە بگاتە ئەو ئەنجامە. سەرکەوتن بەکۆششی سەرداری دڵسۆز دێتە دی، لەو کۆششەشدا ئەو سەردارە و فەرمانڕەوا و کاربەدەستانەی دەوروبەری ئەگەر بەرنامەی پتەوی زانستییانە و دانایانەیان نەبێ، کورد ناگاتە ئەو هیوا و ئامانجەی خانی و گەلێ دڵسۆزی دیکە خەونیان پێوە دیوە.

گەر دێ هەبوویا مە ژ خوەدانەک
عالی کەرەمەک لەتیفە دانەک
عیلم و هونەر و کەمال و ئیزعان
شیعر و غەزەل و کیتاب و دیوان
ئەڤ جنس ب بووا ل باوی مەعموول
ئەڤ نەقدی ب با ل نک وی مەقبوول
من دێ عەلەما کەلامێ مەوزوون
عالی بکرا ل بانێ گەردوون
بیناڤە ڕحا مەلێ جزیری
پێ حەی ب کرا عەلی حەریری



کەیفەک وە ب دا فەقیهێ تەیران
حەتتا ب ئەبەد ب مایی حەیران
چ بکم کو قەوی کەسادە بازار
نینن ژ قوماشێ را خەریدار
خاسما د ڤێ عەسرێ دا کو همیان
مەعشووق و حەبیبە بۆمە هەمیان

خانی دەڵێ: بایی ئەوەندە سامانی گیانیی نەتەوایەتیمان هەیە شانازی پێوە بکەین، بەڵام دام و دەسگا و کەسایەتیمان بڵند نەبووە تا بگاتە ئەو پلەیەی گیانی پاکی شاعیرانی گەورەی وەکو عەلیی هەریری و مەلای جزیری و فەقێی تەیران پێی شاد بێ.

لە پاشانا شاعیر دەکەوێتە ئامۆژگاری و دەربڕینی هەموو ئەو کەموکوڕییانەی بوون بەهۆی دواکەوتنی کورد.

یەعنی ژ تەمەعێ دراڤ و دینار
هەر یەک ژ مەرا وە بوونە دلدار
گەر عیلمێ تەمام ب دی ب پوولەک
بفرۆشی تو حیکمەتێ ب سۆلەک
کەس ناکەتە مەیتەرێ خوە جامێ
ڕا ناگرتن کەسەک نیزامێ
وەقتێ کو مە دی زەمانە ئەڤ ڕەنگ
فیلجوملە ل سەر دراڤێ بوو جەنگ
حەز کر مە ببینە کیمیاگەر
گاڤا کو مەدی نەبوو مویەسسەر
نیسفییە مە پێلەکی عەمەل کر
تەسفییە بێ جەوهەرێ دەغەل کر
قەلبێ مە نەکر قەبوولێ حیلە
قەت بۆ غەرەزێ نەبوو وەسیلە
دین چوو و نەکەت ب دەست مە دینار
پاشێ ژ نەچاری بووینە سەففار
سفرێ خوەیێ خەف مە ئاشکەرا کر

قیرتاسییه بوو مه لێ دوعا کر
دەعوەت گەریبیا ب سدق ئیجابەت
بوو واسیتەیێ قەزاییێ حاجەت
ئەو پوول ئەگەر چ بێ بەهانە
یەک ڕوونە و ساف و بێ بەهانە
بێ حیلە وو خوردە و تەمامن
مەقبوولێ موعامەلا عەوامن
کرمانجییە سرفە بێ گومانە
زێڕ نینە ب بێن سەپیدەمانە
سفرێ مەیێ سۆرە ئاشکارە
زیڤ نینە ببێن کو کێم عەیارە
نەقدێ مە مەبێژە کێم بەهایە
بێ سککەیێ شاهی شەهرەوایە
گەر دێ ب بووا ب زەربێ مەنقووش
نە دما وەهە بێ ڕەواج و مەغشووش
مەحبووب ب کەسێ نە نام زادە
لەو بەخت سیاه و نامرادە

زۆرانبازی لە نێوان ڕاستی و درۆ، چاکە و خراپە لە سەردەمی خانی لە پۆپەدا بووە، خراپە لە تای تەرازووی یەکسانیدا زۆر قورس بووە، چاکە زۆر سووک بووە، ئەمە کۆمەڵی کوردەواری بەڕێوە بردووە، بەڵام خراپە هەمیشە لە جەوهەری دروستبوونی نەتەوەی کورددا نەبووە. خوو و ڕەوشتێکە لە دەرەوە بۆی هاتووە، بێگانە و دوژمن کوردی فێری ئەم خەسیەتە نالەبارە کردووە.

خانی لە چیرۆکی «مەم و زین» و غەزەل و قەسیدەکانی دیوانی شیعری خۆیدا گەلێک خەریکی باسکردنی پارەیە، مەبەس ئەو نەقدەیە کە لە مەعدەنەکانی زێڕ و زیو و زەرد و هی دیکە دروست دەکرێ، ئەمە لە بەرهەمی ئەدەبیدا بووە بەڕەمزی «ڕەسەنی» واتە ئەو پارەیەی لە مەعدەن دادەڕێژرێ یەک قالبی هەیە، لەبەر ئەوە هەر چەندی لێ دابڕێژی هەموویان وەکو یەک دەبن، بەڵام ئەگەر لەسەر ئەو قالبە بنچینەییەدا قالبی تر دابڕێژرێ ئەو پارەیەی لەمە دروست دەکرێ «ڕەسەن» نابێ، لەبەر ئەوە پارە «ناڕەسەن» یا «قەڵب»ی پێدەڵێن. لە ئەدەبیاتدا ئەم دوو جۆرە پارەیە، یا سیککەیە بوون بەڕەمزی ڕەسەنی و ناڕەسەنی هەموو شتێک. لەناو شاعیرانی کورد خانی داهێنانی بەرزی لە شیعرەکانیدا هەیە لەم ڕووەوە. بەم جۆرە شاعیر لەبەر ڕۆشنایی ئەم تیۆرییە گەلێ هەڵوێست لە ژیانی کوردەواری ڕوون دەکاتەوە.



قیرتاسییەیا مە بێ پەناهان
بێ زەربێ قەبوولێ پادیشاهان
مەعلوومە ل با گەلەک عەلیمان
مەقبوولە ل باگەلەک حەکیمان
لێ حاکمێ وەقتێ مەعریفەت ناک
مەسمووع نەکر ب سەمعێ ئیدراک
لەو ڕا کو ئەوی نەکر پەسەندە
بە ئەسل و نەسەبا خوە ئەو ڕەوەندە
میرێ کو ب ناڤ میرزایە
مەحزا نەزەرا وی کیمیایە
قەلبێد زەل دکەت بلووری
پوولێد دەغەل دکەت فلووری
سەرباری هەبن فلووسێ ئەحمەر
دەرحال دکەت ب یەک نەزەر زەر
ئەعلایی دکەت ب قەهرێ ئەدنا
ئەدنایی دکەت ب لوتفێ ئەعلا
پاشان دگرت وەکی ئەسیران
ئازا دکەتن وەکی فەقیران
هەر ڕۆژێ هەزارێ بێ نەوایان
هەر لەحزە ب لوتفێ سەد گەدایان
زەنگین دەکەتن ب دەستێ هیممەت
حیکمەت ئەوە ناکەتن چ مییننەت

خانی باوەڕی تەواوی بە«قەدەر» هەیە، زانایانە و بە بۆچوونێکی فەلسەفییانە ئەم تیۆرییە بۆ حاڵی میللەتی کوردی سەردەمی خۆی بەکاردێنێ. لەو کاتەی لەسەر ئەو باوەڕەیە «قەدەر» هەرچی بیەوێ دەیکا، یا چۆنی بۆ دانرابێ دەبێ بێتە دی ئاوڕ لە «هیممەت»یش دەداتەوە، ئەمە لەلای شاعیر ڕەمزی کارکردنە، ئادەمزاد بەکۆشش و تەقەلاَ و هەوڵدان دەتوانێ ئامانجی بهێنێتە دی. بەم چەشنە بەلای ئەوەوە کورد دەتوانێ بگاتە ئامانجی ئەگەر ئەو هەلەی چنگ بکەوێ.

خانی بەم دێڕانە دوایی بەم بڕە شیعرەی دێنێ:

گەر دێ وی نەزەر بدا مە جارەک
ئیکسیرێ تەوەججوها موبارەک
ئەڤ قەول هەمی دکرنە ئەشعار
ئەڤ پوول هەمی دبوونە دینار
ئەمما نەزەرا وی زێدە عامە
لەو خاسێ نەزەر ژ دل نەدامە
ئەو رەحمەتێ خاسە بۆ عەوامێ
یارەب! تو ب دی وی هەر دەوامێ

ژیری و بلیمەتی خانی وەک سیاسی و موسلیحێکی کۆمەڵایەتی ئەوەندەی باری قورسی ناڵەباری دواکەوتوویی کورد دەخاتە سەر شانی کورد خۆی و بەتایبەتی سەرکردەکانی ئەوەندە بێگانە و دوژمن تاوانبار ناکا. کەم کەس لەناو کۆمەڵی کوردەواری تا ئێستاش وەکو خانی بیردەکەنەوە، ئێمە زۆرتر بەرپرسیارین لە دواکەوتنماندا، بێگانە و دوژمن کەمتر.

**سەرەتای مەم و زین**

خانی بەسەرهاتی مەم و زین بەشیعری ساقی نامە دەست پێدەکا، گیان لەناو گێتی سۆفیزمدا دەتوێنێتەوە، گەلێ رەمز و زاراوەی سۆفیزم بەکاردێنێ بۆ کێشانی وێنە تەماوییەکانی کە خاوەن دڵان مەست و سەرخۆش بوون لەم گێتییە ئەفسووناوییەدا بەبادەی مەیی کردگاری. ئەم سەرخۆشە خوداییانە پرتەو لە دڵداری مەم و زین وەردەگرن.

شاعیر دەڵێ:

سازێ دلێ کول ب زیر و بەم بت
سازندەیی عیشقا زین و مەم بت
شەرحا غەمێ دل بکەم فسانە
زینێ و مەمێ بکەم بەهانە
نەغمی وە ژ پەردەیێ دەرینم
زینێ و مەمێ ژ نوو ڤەژینم
مەعلوول بووین حەبیب و عاشق
ئیرۆ هە وەکی تەبیبێ حازق
دەرمان بکم ئەز ئەوان دەواکم
وان بێ مەدەدان ژ نووڤە راکم



دەردێ د دلێ مەمێ جەگەر ریش
زینا ژ دەروونێ دل جەفاکێش
وێ پەردەگەیا عەفیفە مەستوور
وێ بێ گونەهێ ژ توهمەتێ دوور
مەشهوور بکەم بەتەرز و ئوسلووب
مومتاز بن موحیبب و مەحبووب
ئەو رەنگ بکەم ژ نووسەر ئەفراز
دا بێنە تەماشەیێ نەزەر باز
دلبەر ل مەمێ بکەن گرینێ
عاشق بکەنن ب دەردێ زینێ

بەشێوازێکی شاعیرانە خانی لەم برە شیعرەدا پەنجە بۆ دوو مەسەلە درێژ دەکا، یەکێکیان ئەوەیە لە پەنای ئەم بەسەرهاتە دڵدارییەی مەم و زین بیروڕا و بۆچوونەکانی لە بارەی ژیانی ئادەمزاد و چارەنووس و دوارۆژی کورد دەردەبڕێ؛ دووەمیان مەم و زین جارێکی دیکەش دەژیێنێتەوە، واتە لە حیکایەت و بەسەرهاتەکانی ئەدەبی میللی بەرهەمێکی بەرزی کلاسیکی دروست دەکاتەوە.

ئەم بەشەی «مەم و زین»ی خانی، ناوونیشانێکی شیعرییانەی بۆ دانراوە وەکو لە چاپی یەکەمی ئەستەموولدا دەردەکەوێ «داستانی گێڕانەوەی نەورۆزی سوڵتانی، ناسراو بە مووسیمی خۆشی و شادمانی، بە نەریتی کۆنی کوردستانی، کە ئەوان پێیان دەوت سەر ساڵ و دەیانژمارد بە جەژنی ویساڵ».

کۆتایی ئەم بەشە شیعرەی چیرۆکی «مەم و زین»ی خانی بەم دێڕە شیعرانە هاتووە:

ئەز پیلەوەرم نە گەوهەریمە
خود رستەمە ئەز نە پەروەریمە
کرمانج و کۆهی یو کەناری
ڤان چەند خەبەرێد کوردەواری
ئیمزا بکرن ب حوسنێ ئیلتاف
ئیسغا بکەن ئەو ب سەمع و ئینساف
ئەسحابێ غەرەز کو گۆهـ ب دێرن
عەیبان ب کەرەم ل من ڤەشێرن
ئاڤا رووی شاعیرێ نەرێژن
گەر مومکینە یێکە قەنج ببێژن

سەهوو غەڵەتان نەکەن تەعەججوب
تەئویل بکەن ژ بۆ تەعەسسوب

لەم شیعرانەدا خانی ڕوودەکاتە خوێنەری کورد و داوای لێ دەکا بەچاوێکی زیرەکانە و دڵێکی پڕ لە سۆز بنوارێتە ئەم بەرهەمە شیعرییە، شاعیر لە کۆمەڵی کوردەواری پەروەردە بووە و بۆ کوردی نووسیوەتەوە، داوا دەکا هەموو شتێکی کە لەم داستانەدا هاتووە پێویستە بۆ چاکەی کورد لێک بدرێتەوە.

## نەورۆز و خاکی کوردستان

بەهار و گوڵی نەورۆز هەنگامی دیداری دڵدارانە، لەگەڵ ژیانەوەی سروشتدا ئەلقەکانی پێوەندیی ئادەمزادانی کۆمەڵ بەیەکتریەوە دەبەسترێنەوە، دڵدار و دلبەر، عاشق و مەعشووق، کوڕ و کیژ یەکتری دەدۆزنەوە. ئەو گیانە پاکانەی لە خەوندا بەیەکتری گەیشتوون، لە نەورۆزی بەهاردا لەسەر زەوی حەقیقەت بەیەکتری دەگەن.

خانی لە وەسفی نەورۆز و بەهاردا دەڵێ:

دانایێ موعەممەرێ کو هەن سال
ئەڤ ڕەنگە هە گۆ ژ بۆمە ئەحوال
گۆ عادەتێ پێشی یێ زەمانان
ئەڤ بوو ل هەمی جەه و مەکانان
وەقتێ وەکو شەهسوارێ خاوەر
تەحویل دکر د ماهێ ئازەر
یەعنی کو دهاتە بورجێ سەر سال
قەت کەس نە دما ل مەسکەن و مال
بیلجوملە دچوونە دەر ژ مالان
حەتتا دکەهشتە پیر و کالان
ڕۆژا کو دبوویە عید و نەورووز
تەعزیم ژ بۆ دەما دل ئەفرووز
سەحراو و چەمەن دکرنە مەسکەن
بەیدا و و دیمەن دکرنە گولشەن
خاسما عەزەب و کچێد باکیر
ئەلقیسسە جەواهیرێد نادیر



تێکدا د موززەیەن و مولەببەس
ڤێکرا ل تەفەرروجێ مورەخخەس
لێکێن نە ب توهمەت و ب مینەت
بەلکی ب تەریقێ شەرع و سوننەت
لەو را کو ئەوان عەرەز ژ گەشتێ
مەقسوود ژ چوونی یا ب دەشتێ
ئەو بوو کو چ تالیب و چی مەتلووب
یەعنی دوو تەرەف موحیبب و مەحبووب
ئەڤ هەردوو جەلەب کو هەڤ ببینن
کوفوێد خوە ئەو ژ بۆ خوە بینن

لەم دیمەنی بەهارەدا هەموو کەسێک لە سەیرانکەران بە ئارەزووی خۆی دەگا، هەر کوڕێک بووکی ون بووی خەونی دەدۆزێتەوە، هەر کچێک جوامێری بزر بووی خەیاڵی دەبینێتەوە.

بەم جۆرە خانی لەسەر وەسفی سەیرانی نەورۆز دەڕوا و دەڵێ:

دەورا فەلەکێ ژ بەختێ فەیرووز
دیسان کو نوما ژ نووڤە نەورووز
مەبنی ل وی عادەتێ موبارەک
شەهری و سپاهیان ب جارەک
باژێڕ و کەلات و خانی بەردان
تەشبیهێ ب نەژدەیان و جەردان
سەف سەف د مەشینە کۆه و دەشتان
ڕەف ڕەف دەخشینە سەیر و گەشتان
ئەسنافێ ئومەم سیغار و کوببار
قەتعا ڤە نەما د شەهرێ دەییار
هندەک ب پەیایی چوونە باغان
هندەک ب سواری چوونە ڕاغان
هندەک ب تەبایی یو ب کەسرەت
هندەک ب هەڤالی یو ب وەحدەت
ڕابوونەوە خانم و خەواتین

وان ژ تژی گول کرن بەساتین
حووران کرە مەسەکێ خوە جەننەت
بێ پەردە وو بێ مەلال و میننەت
دووشیزە وو دوختەر و ڕووالان
پاکیزە عوزار و زلف و خالان
ئەتراب و کەواعیبێد عەزرا
موردان و مواهیقێد زیبا
ئەسحابێ قوماشێ لوتفێ ڕوخسار
ئەربابێ مەتاعێ حوسنێ دیدار
وان لێک دکرن مەتاعێ یەک عەرز
تەخمین دکرن ب توولێ وەلعەرز
سەودا کەرێ عیشقێ بوون د بازار
هەم بائیعی حوسن و هەم خەریدار
سەرسالی یو باکیر و ڕووالان
سەد سالی یو جوان و پیر و کالان
سەر سالی ل ڕەسم و ڕاهێ مەعهوود
گێرانە د چوو مەقامێ مەحموود

خانی لەم پارچە شیعرەی «مەم و زین»دا سێ سەد ساڵ بەر لە ئێستا وەکو بلێی وەسفی ڕۆژی نەورۆزی سەردەمی ئێستامان دەکا، پۆل پۆل خەڵکی بەگەورە و بچووک، ژن و پیاو، کوڕ و کچ ڕوو دەکەنە مێرغوزار و دەشت و بەهاری نەورۆز، شار چۆڵ دەبێ، سروشتی ڕووتی زیندوو ئاوەدان دەبێ. لەم گەنجەفە و سەیرانەدا، لەم ڕۆژە پیرۆزەدا جوانی بەدڵداری دەکڕێ، هەزاران دڵدار دڵیان دەچێتە هەزاران شۆخ، ئەمە دەستووری ژیان و بوون و تەبیعەتە، کوڕێک و کچێک لەوانە، یەکێکیان «مەم»ە و ئەویتریان «زین»ە.

## بەکری مەرگەوەڕ

بەکری مەرگەوەڕ دروشمی ناپاکی و دوو ڕوویی و چلێسی و خیانەت و جاسووسییە، هەرچی خراپە هەیە لە کۆمەڵی ئادەمزاددا لە کردەوەی ئەم بەدفەڕەیە. ڕەنگ و دەنگ، بەرنامە و پیلانەکانی لە ئیش و کاری شەیتان و ئیبلیس و ئەهریمەنی هەموو ئایین و فەلسەفەکان وەردەگرێ.

قارەمانی ئاژاوە و گیروگرفت و تەنگوچەڵەمەی نێوان مەم و زین و نەگەیشتنیان بەیەکتری ناوی بەکری مەرگەوەڕ بوو. خانی بەم جۆرە لێی دەدوێ:



ئەلقیسسە ب ئیقتیزایێ خیلقەت
میرێ ب کەمال و عیزز و ڕیفعەت
ڕاگرتی ژ بۆ خوە دەرگەڤانەک
فەتتانێ زەمانە سەی پسانەک
دائیم ل دەرێ وی قاپوچی بوو
قەللاع و قەلاش و قاوەچی بوو
ئەمما ب نەسەب نە مەردێ بۆهتان
بەلکی موتەوەللیدێ ژ بوهتان
ئەسلێ وی دبێن ژ مەرگەڤەر بوو
مەحزا وی بە شەڕ ب شۆڕ و شەڕ بوو
ناڤێ وی موونافیقی بەکر بوو
بەلکی ژ بەلووقیا بەتر بوو
مەنناع و موزەبزەبین و ئیبلیس
خەدداع و خەبەر بەزین و تەلبیس
شاگردێ شەئامەتا وی شەیتان
شەرمەندە ژ گۆتنا وی بۆهتان
بەد چەهرە ژ ڕەنگێ دێو و کابووس
بەد فیعل و ستیزەکار و سالووس
تاجدین دگۆتە میر عەیانی:
میرم! بکە دەر ڤی دەرکەڤانی
ئەڤ لائیقی دەرگەهێ تە نینە
ئەڤ کەلبە نەهین دڕە ب کینە

خانی لە بنجدا بەکری مەرگەوەڕی لە پێناوی دروستکردنی کێشە و تەنگوچەڵەمەیێکی کۆمەڵایەتی بەکارهێناوە. لێرەدا دڵداریی مەم و زینی کردووە بەبەڵگە بۆ دیاردەیێکی نەوەکو تەنیا کۆمەڵایەتی بەڵکو دڵدارییێکی بەهێزی ئەوتۆ کاکە مەم و خاتوو زین خۆیان لە گێتیی میتافیزیکی سۆفیزمدا بدۆزنەوە. وە بەکری مەرگەوەڕیش وەکو شەیتان پێچەوانەکەیە لە هەموو دیاردە و فەرمانێکدا. هەموو ئەو وەسفەی لە ئایینەکاندا بۆ شەیتان کەوتۆتە ناوەوە، خانی بۆ بەکری مەرگەوەڕی بەکارهێناوە.

### ڕاز و نیازی زین لەگەڵ مۆم

خانی بەناوی زین موناجاتێک دادەهێنێ گۆیا لەگەڵ مۆم قسە دەکا. بەراورد لە نێوان ئەوەی لەناو دڵی خۆیدا هەیە لەگەڵ چارەنووسی مۆم لەکاتی سووتان و پژاندنی ڕووناکی و تیشکی ناو دەروونی:

دەم شەمع دکر ژ ب خوە دەمساز
کای هەمسەر و هەمنشین و هەمڕاز
هەر چەندی ب سۆهتنێ وەکی من
ئەمما نە ب گوهتنێ وەکی من
گەر شوبهەتێ من تە ژی بگۆتا
دێ من ب خوە دل قەوی نەسۆتا
دەردێ من و تە ژ یەک ب فەرقە
ئەو فەرقە ژ غەربێ تا ب شەرقە
مەشریق تویی ئاگرێ تە زاهیر
مەغریب ئەز و باتینێ من ئاگر
دائیم دسۆژت مە ڕستەیێ جان
تە ناسوژتن ب غەیرێ ئەزمان
پێهتی مە ل سەر د دل پەرەنگە
جانێ مە دگەل پەرەنگێ جەنگە
شەوقەک تە ل سەر سەری دیارە
سەودایەکە سەر سەری دیارە
ئەو شەوق ژ بۆ تەرا زەبانە
ئەڤ پێهت ژ بو مەرا زیانە
بێهتا ژ دلێ مە دایی سەرسەر
حوکمێ دکەتن ل بایێ سەڕسەڕ
هەرچەند ب شەڤ دەمینی بیدار
سوبحان دنڤی هەتا ڤە ئێڤار
ئێڤار و سەحەر ب ڕۆژ ئەگەر شەڤ
ئەز هەر دسۆژم وەسا ل سەر هەڤ
گەه گەه ژ دەستێ دلێ بریندار
ناچار دبوو ژ جانی بیزار



ڕووناکی و گەرمی مۆم بەسەرهاتێکی لەبن نەهاتووی نەمرییە، دڵداران پێی دەژین، هەرچەندە کارێکی گەلێ سەختە بۆیان، بەڵام مایەی هەمیشەیی و جاویدانییە. خانی زین لە تیشک و ڕووناکیدا دەبینێ لەم شیعرانەدا، ئیتر ڕێی بۆ خۆش دەکا لەگەڵ پەپوولە موعادەلەیێکی دیکە دروست بکەن.

### ڕاز و نیازی زین لەگەڵ پەپوولە

پەپوولە لێرەدا بەمانای «پەروانە» هاتووە، لەگەڵ مۆم دڵدار و دلبەرن، ڕووناکییەکەی پرتەوی گیانی خۆشەویستییە، گەرماییەکەی ڕەمزی سووتانی عاشقە. زین ڕوو دەکاتە پەپوولە و ڕاز و نیازی دڵی خۆی بۆ هەڵدەڕێژێ:

پەروانە دکر ب ئاتەشێ غەم
پەروانە دکر ژ بۆ خوە هەمدەم
کای تائیرێ ئاشیانێ فیرقەت
وەی بلبلێ بۆستانێ حیرقەت
ئەی حوججەتێ عاشقێد سائیب
وەی موبتیلێ موددەعی یێ کازیب
مەردانە دبەخشی جانێ ئەرزان
حەیفا کو ب مر گەرانی لەرزان
ناوەستی دەمەک ل بەرهەوایی
ناپوختە تەلەب دکی فەنایی
ئەو لەز ژ تەرا گەلەک قوسوورە
ئەو لەرزە ژ بۆ تەرا فوتوورە
بێ سەبری یو بێ سوکوون و بێ تاب
لەورا خوە دکی ب زوویی پر تاب
ناپوختەیی عەیبەکە تەمامە
مەتبووخ دبێژنێ کو خامە
پوختە دسۆژن مەگەر چ جاران
فانی ڤە دبن ب نوور و ناران
باقی دگەرن وەکی سەمەندەر
وان جیسم دبیتە جانێ ئەنوەر
وێ جیسم مونەووەرا وەکی ڕووح

بەیزا قەمەرا موقابەلەت بووح
یەک زەڕڕە ژ ئاسمان و عەردان
نە د ما کو نەکەت دگەل خەبەردان
ژ ئەڤ ئادەمی یێد ساحیب ئەغراز
مەحزا دکر ئیحتیراز و ئیعراز
فیکرا خوە دکر ژ ئینس و جانان
سیڕڕا خوە دگوتە بێ زەبانان
سەر تا ب قەدەم غەریقێ غەم بوو
نەقشێ دل و جان خەیالێ مەم بوو

زین کە گفتوگۆی لەگەڵ مۆم دەکرد مەبەسی ئەوەبوو ڕووناکی و گەرمایی مۆم ڕەنگی لە دڵداری داوەتەوە. لەم دیمەنەدا کە زین لەگەڵ پەپوولە قسە دەکا بێگومان ئەمەش لاییێکی دیکەی دڵدارییەکەیە، لێرەدا پێوەندی «ڕووناکی» و «پەپوولە» موتلەقێک دروست دەکا، ئەمە لەگەڵ دوو موتلەقەکەی دیکە «مەم» و «زین» سێ کوچکەییێک پێکدێنن و دەبن بە«یەکەییێک»، وەک خانی دەڵێ خەیاڵی مەم لەناو دڵدا هەڵکەندراوە، سڕینەوەی بۆ نییە هەتا هەتایە.

## ڕاز و نیازی مەم لەگەڵ دیجلە (ڕووباری جزیرە)

موناجاتی مەم لەگەڵ زێی دیجلە پەردەی شانۆییێکە وێنەییێکی داهێنەرانە لە هونەری شیعری کوردیدا دەخاتە ڕوو. خانی بەزمانی مەم وەسفی کەف و کوڵی دیجلە و بێ ئۆقرەیی دەکا، ئەو هەموو جێ و مەکانانە دەگەڕێ تا دەگاتە بەغدا، مەم داوای ئەوە دەکا ئاوڕێکیش لەو بداتەوە و بچێتە لای بۆ ئەوەی بزانێ لەناو دڵیدا چییە:

کای شوبهەتی ئەشکێ من ڕەوانە
بێ سەبر و سوکوونی ئاشقانە
بێ سەبر و قەرار و بێ سوکوونی
یان شوبهەتێ من تو ژی جنوونی
قەت نینە ژ بۆ تە را قەرارەک
غالیب د دلێ تە دانە یارەک
هەر لەحزە تە ژی چ تێتە بیرێ
سەرگەشتە دبی ل ڕەخ جزیرێ
ئەڤ شەهرەیە گەر ژ بۆتە مەحبووب
حاسیل گەڕییایە بۆتە مەتلووب



دائیم د دلێ تە دانە مەنزیل
دەستێ تە ل گەردەنێ حەمائیل
هێژا ژ خودێ تو فیکر ناکەی
هەر ڕۆژ هەزار شوکرێ ناکەی
ئەڤ چەندە دکەی هەوار و گازی
ئێدی چی مورادەکێ دخوازی
بێهوودە چرا دکەی تو فەریاد
ئاوارە دچی دیارێ بەغداد
گەر ئەز بگریم و گەر بنالم
وەر ئەز بمرم و گەر بکالم
هەرچی وەکو ئەز بکم ڕەوایە
مەعقوول ژ بۆ مەرا فەنایە
جارەک ل دلێ م ژی گوزەر کە
سەر چەشمەیێ چەشمێ من نەزەر کە
دەردێ دلێ من کو بێ دەوایە
چەشمێ تەڕێ من چ ماجەرایە؟
دێوانەمە من پەری بدەردا
ئەز دیجلەمە زەبنەرێ مەبەردا
وەستانی یو نێرگزی یو سەقلان
دەروازە وو عومەری و مەیدان
ڤان سەیرگەهان تو لێ دکەی گەشت
ئەز مامە ژ بۆ مرا دەر و دەشت

مەمی سەرگەردان و ئاوارەی تەجرید لە خۆ تەنیا دەر و دەشتی بۆ ماوەتەوە، کەچی گەشتی دیجلە بێ کۆتاییییە، سنووری گەڕانی ئەو بێ پایانە، سەر لە گەلێ سەیرانگا و ئاوایی هی وەکو وەستانی و نێرگزی سەقلان و دەروازە و عومەری و مەیدان و هی دیکە دەداتەوە، ئەمانە ئاوەدانی و گوند و دێهاتی دەوروبەری ڕووباری دیجلەن لە باکووری کوردستان.

## ڕاز و نیازی مەم لەگەڵ بای شەماڵ

لەو کاتەی خانی ڕووباری دیجلەی کردووە بە ڕەمزی دڵداریی ڕاست لەم بڕە شیعرەیدا بای شەماڵی

کردووە بە پەیامنێر بۆ ئەوەی پەیامی دڵی ببا بۆ دلبەر و بەسەرهاتی بۆ بگێڕێتەوە:

گەه بەحس دکر دگەل سەبایێ
شەرحا غەمێ دل دگۆتە بایێ
کای جیسمێ لەتیفێ شوبهەتی ڕووح
دەرگاهێ بەدەن ل بەر تە مەفتووح
ئەز هیڤی دکەم کو بێ تەوەققوف
ڕەنجیدە قەدەم بەبێ تەکەللوف
جارەک هەرە سوودەتولسەعادەت
گاڤەک هەرە سیدرەتولنیهایەت
ئەووەل تو ب بۆسە ئاستانێ
پاشی هەرە پێشی دلستانێ
ئەمما ب تەوازوع و ب تەعزیم
سەد مەرتەبە ئیحتیرام و تەکریم
ئاهەستە ژ بۆ بکە دوعایێ
وا بەستەیێ وێ بکە سەنایێ
شایستە بکە تو ئیحتیرامێ
دەست بەستە ڤەوەست بکە سەلامێ
پاشی حەرەکەت کە پێشڤە چاپوک
سیقلەت نەگەری ل تەبعێ نازوک
ئەڤ نامە کو خوون دلی میدادە
ئەڤ سەفحە کو مەردومەک سەوادە
پەردێ مە لڤین ژ بەر جەمالێ
تەنها بدە دەستی عەرز و حالێ
زینهار! دبا نەکی نیقابێ
گاڤا کو د خوونتن کیتابێ
بێژێ ژ مەدا کو پادشاهم
(بەندەن ئۆنا سۆیلە) قیبلەگاهم
لەو مەتلەعێ نووری زولجەلالی



لەو مەنبەعێ کەوسەرا زەلالی
لەو مەنزەر و مەزهەرا ئیلاهی
ئەم بوتە گەدا تو پادیشاهی
دا بۆ مە ب حەقێ موتتەسیف بی
دەرحەق مە عادیل و مونسیف بی

بای شەماڵ وەکو پەیامنێر لە ئەدەبی کلاسیکی میللەتانی هاوسێی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دیاردەیێکی هونەرییە، دەوری گرنگی هەیە بەتایبەتی لە چیرۆکی شیعریدا. ئەم وێنەیەی شاعیری کوردی ئێمە خانی بەزمانی مەمەوە وەک پەیامێک بەنووسین دەکەوێتە بەرچاو و بای شەماڵ بۆ زینی دەبا، بەڵام بەڕاستی ئەم پارچە شیعرە وێنەی موناجات دەنوێنێ، دڵداریی مەم و زین بووە بەدڵداری حەقیقی و مەم چۆکی داداوەتەوە و ڕووی کردۆتە بارەگای خودا و لەگەڵ ئەودا قسە دەکا، بەڵگەکەش ئەو گیانی خوداییییەیە کە لە زیندا خۆی دەجلوێنێ.

لەو شیعرەدا خانی بەڕستەیێکی زمانی تورکی ئەوەی لە دڵی دایە دەری دەبڕێ «بندن أونا سویله = Benden ona söyle» واتە (لە زمانی منەوە پێی بڵێ). ئەو کەسەی پێی دەوترێ دیارە زینە و لێرەدا ڕەمزی عیشقی حەقیقییە.

### باغی میر زێندین

وەسفی بەهاری سروشتی خۆڕسک و دەسکرد لەبەرهەمی غەزەل و قەسیدەی خانی لەڕێزی پشتەوە دەوەستی، لەوێ زیاتر بایەخ بەشیعری کۆمەڵایەتی و دانایی و فەلسەفە و ئامۆژگاری ڕۆشنبیران دەدا، کەمتر وەسف بەگشتی لەو بەرهەمانەیدا ڕەنگی داوەتەوە، بەڵام لە چیرۆکی مەم و زین لەگەڵێ فەسڵ و بابەتدا وەسفی سروشت و ئادەمزاد، بەتایبەتی دلبەر، بەدی دەکرێ، لە هەندێ جێ وەسفێکی سادەی جوانی فۆتۆگرافیانە دەخاتە پێش چاوی خوێنەر.

لە وەسفی باغی میر زێندیندا دەڵێ:

باغەک وی هەبوو ئەمیرێ زێندین
باغی ئیرەمێ دچوو ب مزگین
هەر دەوحە ژ وی و هەر تویوورەک
یەک قەسرێ ژ جەننەتێ و حوورەک
بۆ شوشتنی دەست و پێ و چاڤان
کەوسەر کر بوو سەبیلی ڕیزوان
هەمسەر ب مەقام سیدرە سەروەک
مانەندێ فریشتە هەر تەزەروەک

تەشبیه مەمێ دل سەنەوبەر
سەد پارە ژ عیشقێ قەد عەرعەر
نارنج و ترنج شوبهی زینێ
زەر بوویی ژ عیللەتا ئەڤینێ
سێڤ و روتەب و ئەنار بۆستان
لیڤ و زەقەن ئەنار پستان
شمشاد و چنار هەمقەدەم بوون
خوەش سایەوەر و عەلی هیمەم بوون
زێڕین قەدەحێد مەست لە ب ریز
ڕەیحان و بنەفشە جوملە نەوخیز
مەجموعەیێ خوزوورات و ئەزهار
شیرازەیا سەلسەبیل و ئەنهار
سەحنا ڕەزێ موجمەلەن کیتابەک
هەر قیتعە و و فەسلە فەسل و بابەک
گۆیا ب ئەدەب ئەدیبێ تەنجیم
سەر سەفحەیا باغێ شوبهێ تەقویم
جەدوەل کر بوو ب حەللێ سیماب
شنگەرف سیفەت گولێد سیراب
ئەتراف ژ سونبول و ڕەیاحین
ئەلوان ژ خوتووت سەبز و موشکین
هەر یەک دکرن بەیانێ ئەحکام
بەختێ سیەهـ و سفیدە ئیعلام

لەم شیعرەیدا خانی وەسفی باغ و باغاتی مێرزێندین دەکا، بە لایەوە ئەوەندە جوان و ڕەنگینە بە بەهەشتی دەچوێنێ، ئەم باغە هەموو جۆرە گوڵێکی تێدایە، هەموو جۆرە دار و درەخت و دەوەنێک ڕازاندوویەتیەوە، تەنانەت درەختی سیدرەش بەرچاو دەکەوێ، ئەو بنەدارەی لەلای دەستی ڕاستی بارەگای خودا لە ئاسماندا دەبینرێ، هەندێک دەڵێن ئەم بنەدارەی بەری لە گۆیژ دەکا لە بەهەشتی بەرینیشدا هەیە.

شاعیر هەموو جوانییە ڕووکەش و بەرچاوەکانی گوڵ و میوەی ناو ئەم باغە لەگەڵ ئەندامی لەشی



دلبەرا بەراورد دەکا.

**مەم لە بەندیخانەدا**

خانی لە پێشەکی ئەم شیعرەی بۆ بەندکردنی مەمی وتووە لەسەر ئەو باوەڕەیە کە چارەنووسی ڕۆژگار (قەدەر) سۆزی نییە، کینی هەیە، بەتایبەتی بەرامبەر بەدڵداری، لەبەر ئەوەیە هەرچی ئازار و پەژارە هەیە بۆ مەمی دروست دەکا و دەیخاتە زیندانەوە:

ئاخر د کەتن مەلوول و مەئیووس
مانەندێ مەمێ زەلیل و مەحبووس
داڤێژتە مەحبەسێ ب ناکام
داتینتە مەرقەدێ سەر ئەنجام
ئەو بەخت ڕەشێ لەقەب ل وی مەم
بێ هەمنەفەس و هەڤال و هەمدەم
هاڤێنتە چالەکی ب زاری
تەشبیه ب گۆڕێ تەنگ و تاری
مەکرووە وەکی دەهانێ ئەژدەر
مەنکوور وەکی نەکیر و مونکەر
روونیشت د وێڤە عابیدانە
زیندان ل وی بوویە چیللەخانە
ئەو چەهـ ل وی بوویە چاهێ نەخشەب
ئەو مەهـ گەری یاهیلالێ یەک شەب
سۆفی کو گەهشتە کونجێ خەلوەت
شێخینی گەها مەقامی وەحدەت
گەهـ شوبهەتێ عاشقان ب دلخواز
گەهـ شوبهەتێ عابیدان ب داخواز
هەر لەحزە دگەل کەلا گرینێ
ئەڤ ڕەنگە وی دگۆتە زینێ
کای میسلێ حەرارەتا غەریزی
ئیرۆ هە د میسرێ دل عەزیزی
سەد جاری هەڕ و لە قەلبێ غەمناک

پیرا هەنێ سەبرێ من تەکر چاک
گەه گەه چ دبت وەکی زولەیخا
پرسا مە ب کی تو ئەی شەکرخا
لەیلا تویی ئەز ژ بۆتە مەجنوون
گولگون ژ تەرا سرشکێ پڕ خوون
فەرهادم ئەز و تۆ بۆ م شیرین
سەیلابێ سرشک جۆیێ شیرین

مەم تاقی تەنیا و بێ هەواڵ و هاودەم لەناو زیندانی وەکو گۆڕی تاریک دەکات دەباتە سەر. بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە هەمیشە موناجاتی تارمایی پەیکەری زین دەکا، ئیش و کاری تەنیا بیرکردنەوە بووە لە زین. هەموو دەمی لاواندنەوەی خۆی و یادکردنەوەی زین بووە، هەستی خۆی بەرامبەر بە زین لەگەڵ هەستی عەزیزی میسر (پووتیڤار) و مەجنوون و فەرهاد دەردەبڕێ بەرامبەر بەزلەیخا و لەیلا و شیرین. ئەمانە بوون بەڕەمزی دڵداری و چاکە و خۆشی و بەختیاری ئادەمزاد ئەو حاڵەتانەی مرۆڤ خەباتیان بۆ دەکا لە ڕۆژگارانی هابیل و قابیلەوە تا ئێستا.

## ڕاسپاردە و وەسیەتی زین

خانی بەزمانی زینەوە هەست و نەستی ناوەوەی دەروونی دەردەبڕێ، هەمووی سۆز و لەخۆبوردن و خۆشەویستی مەمە. لەم بڕە شیعرەدا چاکەی بۆ کەسی دووەم دەوێ کەساسی و دڵگرانی بۆ خۆی. شاعیر دەڵێ:

زینێ کو نومانە وان کەرامات
ئەڤ چەندە مەنازیل و مەقامات
ڕوونیشت و وەسیەتا خوە بۆ میر
ئەڤ ڕەنگە هە کر بەیان و تەقریر
کای پادشەهێ ڕوحان و قەلبان
هەمشیرە بوی فیدا وو قوربان
قوربانێ تە بن هە ڕ و دوو سەد زین
ئەز هێڤی دکم نەبی تو غەمگین
ڕۆژا وەکو بر مە مەم ژ بۆ خوە
بیلجوملە برن مە غەم ژ بۆ خوە
مەنسووڕ بویم ل کیشوەرێ غەم
غەم بوونە ژ بۆ مرا موسەللەم



مەم بۆ من و مەرحەمەت ژ بۆ تە
غەم بۆ من و سەلتەنەت ژ بۆ تە
شاهم ب مڕا مەبە مونازیع
ئەز بوومە ب حیسسەیا خوە قانیع
ڕوونێ تو ل تەختێ شوبه خوسرەو
تاجێ خوەیێ زێڕ بگێڕە کەچرەو
بەزما تەڕەبێ ب دێڕە تەرتیب
زەوق و فەرەحێ بگێڕە تەرکیب
سەرخوەش بکە سادە وو ڕەوالان
چون خوەش کە ژ نوڤە پیر و کالان
ئەسبابێ نەشات و کامەرانی
ئادابێ سەفا وو زیندەگانی

زین لە وەسیەتەکەیدا کە بۆ میر زێندینی دەکا وەکو داناییێکی هۆشیار دەکەوێتە ڕوو، وەکو ئادەمزادێکە کە خۆی تووشی غەم و پەژارە و دەردی سەری دەبێ، نایەوێ خەڵکی دیکە لە ژیاندا ئێش و ئازار بکێشن، ئارەزووی ئەوەیە میر زێندین هەمیشە گەورە و مەزن بێ، لە خۆشیدا بێ و دیوەخانی زەمزەمەی بەختیاری بپژێنێ.

لە کۆتایی وەسیەتەکەیدا زین دەڵێ:

دەرحەقێ من و مەمێ نەکەی عار
گاڤا دەمرت مەمێ بریندار
ئەز دێ ب جەنازەیێ وی ڕابم
حەتتا ڤە کە مەقبەران تەبا بم
وەقتێ دمرم بدەی تو دەستوور
دا من بکرن ل گەل وی مەستوور
من ژ ئالی وی دەربەدەر نەگێڕی
بێ پەردە دگەل وی من ڤەشێری
زینێ کو کرن وەسیەت ئاخیر
غائیب گەڕییا ژ دەردێ حازیر
میر گۆ: تو هەڕە مەمێ ببینە

گەر دێ مری بت ئەوی ڤەژینە
باوەڕ تو ب کە ب سیدق و ئیمان
بوومە ل تەوو مەمێ پەشیمان
گەر هوون بمرن، وە گەر کو ڕابن
نابیت تو وو مەم ژ هەڤ جودابن

ئەستووری بیروباوەڕی زین لەم وەسیەتەدا ئەوەیە میر زێندین کارێکی وا بکا لە دوای مردن زین و مەم لە یەکتری جودا نەبنەوە، چونکە لە گێتی ئادەمزاد بەیەکتری شاد نەبوون، پێویستە لە گێتی جاویدانیدا وەکو حوور و غیلمان پێکەوە بژین. میر زێندین بەڵێن بەزین دەدا ویست و ئارەزووی بهێنێتە دی.

## دوا دیدەنی و مردنی مەم

کە زین لە دیالۆجەکەیدا لەگەڵ میر زێندین لێی جیا دەبێتەوە ڕوو دەکاتە کونجی غەم و پەژارەی مەم. خانی بەم شیعرانە وێنەی خۆ ئامادەکردنی زین دەکێشێ بۆ سەردانی مەم:

زینێ کو بهیستن ئەڤ تەکەللوم
ئەڤ میهر و وەفا و و ئەڤ تەڕەحوم
ڕابوو خەملی ژ پایی تا فەرق
بوو بەحری حوسنی د گەوهەران غەرق
دایێن و ستی یو سەد پەرەستار
خورشید و مەه نوجوومێ سەییار
بیلجوملە ب دەرکەتن ژ بورجان
دوڕدانە ب دەرکەتن ژ دورجان
سەد جارییە وو ستی یوو دایێن
هلگرتن ئەوێ ب رەسم و ئایین

زین دەڕازێتەوە، وەکو ئەوەی بلێی بۆ مەم بەبووک دەچێ، ستی و دەستە خوشکان، کارەکەر و پێش خزمەتان، بەڕازاوەیی دەکەونە دوای زین، لە بەرزیی ئەم مەقامە و بەهەند هەڵگرتنی ئەم دڵدارییە پاکەی نێوان مەم و زین ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە سڵاوی پاکی گەردوون و چەرخ و فەلەکیان لەم میهرەجانەدا دەگەیاندە گیانی دڵداریی مەم و زین.

زین بەبینینی مەم شادبوو، بەڵام دوا بەیەک گەیشتنی سەرەمەرگ بوو.

خانی دەڵێ:

دایێن وستی کو چوون ب سەردا
هندی کو ئەوان دگەل خەبەردا



گۆتن: کو مەمۆ تو رابە زین هات
ڕووحاتەیە بێگومان یەقین هات
ئەو تەشنە لەبێ زەلالێ دیدار
شاداب نەبوو ب ناڤێ دلدار
هندی کو رەیا دلێ کشاندن
هندی کو گولاڤ لێ ڕەشاندن

کە زین لەگەڵ مەم ڕووبەڕوو بووبوونەوە، عەرش و قورش لەناو غەمدا خنکابوون. مەم لە دوا هەناسەیدا بوو، بەم ڕەنگە خانی لە دەرچوونی گیانی مەم دەدوێ لە کاتێک زین لەژێر سەریەتی:

هێڤی دکەین ئەم ئەوی ژ مەعبوود
نینن مە ب غەیری وی چو مەقسوود
گاڤا ئەوی کر تەمەننی ئاخیر
دەرگاه ڤەبوو ل بەر وی حازیر
تەیرێ کو قەفەس ل بەر ڤەبوویی
ئەو ڕەنگ فڕی وەکی نەبوویی
دەستێد خوە ژ قەیدێ گل کشاندن
جەنگێد دلێ خوە ڕاوەشاندن
شەهباز ژ قەیدێ مەرکەزێ فەرش
پەرواز کر و گەهشتە زیلعەرش

مەم مرد، زین بەتەنیا مایەوە. خۆشی لەلای زین ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ناوەوە بووبێ، لەبەر ئەوە بووە چونکە مەم لەسەر زەوی بوو، ئێستا زین لە خودا دەپاڕێتەوە بیبا بۆ ئەو گێتییەی مەمی لێ دەژی.

## زین گەشتی لای مەم دەکا

ئەوپەڕی ئاواتی زین لەو سەردەمە پڕ ئێش و ئازارەدا ئەوەبوو بەزووترین کات بگاتە لای مەم، چونکە لەسەر ڕووی زەوی نەگەیشتنە یەک. جێی شادییە لە بەهەشتدا هەتا هەتایە لەگەڵ یەکتریدا بژین.

خانی لەم لایەنەوە دەڵێ:

زین هات و ب قامەتا سەنەوبەر
بوو سەروی ل سەر وی سایە گوستەر
بێ پەردە میسالێ نەی دنالی
هێستر دەوەرین عەلانتەوالی

عەینی تە دگۆ د فەسلێ نیسان
دەریا ڕژییا ژ عەورێ دیسان
باران کو ل توربەتێ دباری
هەر دانە دبوونە دەه مراری
هەردەم کو دکر ژ دەردێ دڵ ئاه
وان ماتەمیان نەعوز و بیللاه
ڤێرا ب نەوا دگرتن ئاهەنگ
هەر نەه فەلەکان ب سەر دکەت دەنگ

زین لەسەر مەم وەکو نەی دەیناڵاند، فرمێسکی چاوی وەکو بارانی نیسان بوو، ئاه و هەناسە و ناڵەی دەگەیشتە هەر نۆ فەلەک و دەنگی دەدایەوە. لە دوای ئەم هەموو شۆر و غەوغا و بوومەلەرزەیە لەگەڵ دەرچوونی گیانی زین لە لەشی، هێمنی باڵی بەسەر زەویدا کێشا و هەموو شتێک کپ بوو و لە جوولەکەوت.

خانی بەموناجاتی خودا دوایی بەم شیعرە دێنێ، لە پاش پاڕانەوەییێکی بەکول لە خودا، دەڵێ:

یارەب ب ئەشکێ ئالێ مەجنوون
یارەب ب ڕوویێ لەیلێ گولگوون
یارەب ب مەمێ و وێ ئەڤینێ
یارەب ب تەحەسورا ل زینێ
وەقتێ کو جودا دکەی ژ جانی
بێ بەهرە نەکەی ژ عیشقی خانی

***

زاهیر ژ وەرا سەلیە گوفتار
باتین ب وەرا خەبیە کردار
مانەندێ مەمێ ئەوێ مرن جان
تەشبیە بەکر ب بەخشە قەنجان

ئەمە دوا ئامانجەکانی خانی بوو، ئامانجێکی لە گیانی ناوەوەی تاکی کۆمەڵ وەرگرتبوو کە دڵدارییە، ئەوی دیکەیانی لە هەست و هیوای کۆمەڵی کوردەواری وەرگرتبوو کە سەربەخۆییە، سەرکەوتووانە توانیویەتی هەردوو لایەن بخاتە قالبی بەرهەمێکی بەرز کە ناوی ناوە چیرۆکی شیعری «مەم و زین».



**کۆتایی چیرۆکی «مەم و زین»**

لە پاش مردنی مەم و زین خانی لە مەلحەمەکەیدا بەردەوام دەبێ، بەهەناسەییێکی دانایانە و فەلسەفییانە فەسڵێک تەرخان دەکا بەناونیشانی «گیا لەسەر بنجی خۆی شین دەبێ»، ئامۆژگارییەکان بە شیعر بڵاو دەکاتەوە، هەروەها باس لە دڵداری ڕاست دەکا، ئینجا دێتە سەر ئەوەی بێداری هەر بۆ خودایە و هەموو شتێک کۆتایی پێ دێ ئەو نەبێ، بەم برە شیعرە کۆتایی تەواو بەچیرۆکی شیعری «مەم و زین» دێنێ:

وەللاهی ژ سفید یوو سیاهی
وی قەسدوغەرەز تووی ئیلاهی
ئەمما ب مورەککەبا قەبائیح
ڕوو ڕەش کرنە گەلەک سەفائیح
خەتتێ تەیە سەر نویشت و سەرمەشق
سیە سالە خەتێ خەتا دکەت مەشق
لەورا کو دەما ژ غەیب فەک بوو
تاریخ هەزار و شیست و یەک بوو
ئیسال گەهشتە چل و چاران
وی پێشرەوێ گوناهکاران
ڤێک دا ژ مەناهیان گەلەک مال
یەک پوول نەهن ژ خوسنێ ئەعمال
ئەووەل کو تە دا ژ عیشقێ مەتلەع
ئاخر بدێ وی تو حوسنێ مەقتەع

خانی بەموناجات کۆتایی بەچیرۆکی شیعری «مەم و زین» هێناوە. کارێکی یەکجار بەجێی کردووە کە هەندێ مێژووی تۆمار کردووە لە بابەت نووسینی «مەم و زین» و سەردەمی تەواوکردنیەوە. ئەمە بووە هۆی زانیاریی ڕاست و گرنگ لە بارەی لەدایکبوونی و کۆچی دوایی خۆی بخاتە ناو مێژووی ئەدەبەوە.

***

لە مێژووی ئەدەبی نەتەوەکانی سەر ڕووی زەوی گەلێ بەرهەمی ئەدەبی هەیە، بەتایبەتی «چیرۆکی شیعری» لە کۆنی کۆنەوە بووە بەدیارترین بابەتی گێتیی شیعری ئەو نەتەوانە. بەم جۆرە ئەگەر ئێمە شانازی بەوەوە بکەین چیرۆکی شیعری هونەرێکە باو و لە ڕووە لە ئەدەبی کوردیدا، بۆمان هەیە «مەم و زین» لە ڕیزی پێشەوە دابنێین، یا بەمەزنترین چیرۆکی شیعری بژمێرین لە سەرانسەری مێژووی ئەدەبی کوردیدا. «مەم و زین» لە ڕووی جوانکارییەوە بەرامبەر بەبەرهەمە ئەدەبییە گەورەکانی گێتی دەوەستێ.

## نووبهارا بچووکان

له دوای دابەشکردنی خاکی کوردستان بۆ یەکەمین جار لە ئەنجامی سەرکەوتنی عوسمانییان بەسەر سەفەوییانی عەجەم لە جەنگی چالدیران (١٥١٤)، لە کوردستانی باکوور بە بۆچوونی ئەو ڕۆژگارە کوردایەتی چەکەرەی کرد و دەستی کرد بەجوولانەوە. ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە لە مەلایان ئالآی بە کوردی کردنی خوێندنی حوجرەیان هەڵکرد.

لە بنەڕەتدا پەیدابوونی قوتابخانەی شیعری کلاسیکی بەگشتی دەسکەوتێکی ئەو تاقیکردنەوەیە بوو. عەلیی تەرەماخی هەوڵی دانانی دەستووری زمانی دا، زانایانی دیکە مەشقی ئەوەیان دەکرد هەندێ لە زانستییەکانی ئەو سەردەمانە بەکوردی بنووسنەوە.

ئەحمەدی خانی لە هەموو کەسێک زیاتر نزیکی ئەو بیروباوەڕە بوو. ڕاستە خوێندنی منداڵی کورد لە پێناوی فێربوونی قورئان و زانستییەکانی زمانی عەرەبی و شەریعەتی ئیسلام بوو، بەڵام وانە وتنەوە بەزمانی کوردی بوو.

هەستی نەتەوایەتی پاڵی بە خانییەوە ناوە بەمەبەسی ئەوەی منداڵی کورد فێری زمانی عەرەبی ببێ، فەرهەنگۆکی «نووبهارا بچووکان»ی داناوە. گرنگی ئەم کارە لەوەدایە وشەی کوردی هێناوەتە ناو زمانی نووسینەوە، چونکە تا ئێستاش لە حوجرەی مزگەوتی کوردەواریدا هەموو زانستییەکان پێوەندییان بەزمانی عەرەبی و شەریعەتی ئیسلامەوە هەیە، تەنیا قسەکردن و تەقریر بەزمانی کوردییە.

«نووبهارا بچووکان» فەرهەنگۆکێکە خانی بۆ منداڵانی کوردی داناوە لە پێناوی ئەوەی فێری زمانی عەرەبی بن. لە ساڵی ١٦٨٢ تەواوی کردووە. لە فەرهەنگۆکەکەدا مانای دەوروبەری هەزار وشەی لێکداوەتەوە. کارەکەی بەشیعر هۆنیوەتەوە، وەکو دەستووری ئەو سەردەمانە. بێگومان ئەم جۆرە شیعرە شیعری فێرکردن و پەروەردەیی پێدەڵێن (دیداکتیکی = تەعلیمی).

«نووبهارا بچووکان» لە پێشەکییێک و سێزدە پارچە (قیتعە) پێکهاتووە، هەمووی زیاتر لە ٢٠٠ دێڕ شیعری گرتۆتە خۆ.

خانی لە پێشەکیی «نووبهارا بچووکان» دەڵێ:

بسم الله الرحمن الرحيم
مەبدەئێ هەر عیلمەکێ ناڤێ عەلیم
حەمد و سەناو و شوکرانی
ژ بۆ وی خالیقێ ڕەحمانی
کو فەساحەت و بەیان دایە لیسانی
لیسان دایە ئینسانی
هندی سەلەواتن هەمی
ل ڕەسوولێ مەئی ئوممی
کو بوونە پەیڕەوێ د وی
عەرەب و عەجەم و کرمانج ڕوومی
ژ پاش حەمد و سەلەواتان
ئەڤ چەند کەلیمەنە ژ لوغاتان
ڤێک ئێخستن ئەحمەدێ خانی
ناڤێ نووبهارا بچووکان لی دانی
نە ژ بۆ ساحێب ڕەواجان
بەلکە ژ بۆ بچووکێت کرمانجان
وەکو ژ قورئانێ خەلاس بن
لازمە ل سەوادی چاڤ ناس بن
دا ب ڤان چەند ڕەشبەلەکان
ل وان تەبیعەت مەلەکان
دەرێ زیهنێ ڤەبیتن
هەرچی بخوەنت زەحمەتێ نەبیتن
ئومێدا مە ژ تفالان
کو مە عەمەل بەتالان
د وەقتێ دەور و دەرسان
بکن ئینعام و ئیحسان
ب دوعان مە بیرێ بینن
فاتیحا ژ مەرا بخوینن

لە دوای پێشەکی فەرهەنگۆکەکەی خستۆتە ناو ١٣ پارچە (قیتعە) شیعری کێشی عەرووزییەوە. کێشەکان بەم جۆرە دابەش کراون: چوار پارچە «ڕەجەز»ە، سێیانیان «هەزەج»ە، دووانیان «ڕەمەل»ە، چوار پارچەکەی دیکەیان هەر یەکێکیان لەمانەن «موزاریع» و «بەسیت» و «سەریع» و «موتەقاریب».

خانی پارچەی یەکەمی «نووبهارا بچووکان»ی بۆ موناجات و نەعت و مەسەلەی ئایینی تەرخان کردووە، باس لە خودا و پێغەمبەر و چوار خەلیفەی ڕاشیدین و چوار ئیمامی سوننییان و ئەسحابان (یارانی پێغەمبەر) و بەکورتی بەسەرهاتی پێغەمبەر دەکا.

لە پارچەی دووەمدا شاعیر دەچێتە ناو بابەتەکەوە. لە پێشانا وشە عەرەبییەکە دەخاتە ڕوو ئینجا

ماناکەی بەکوردی دەڵێ، تا کۆتایی بە فەرهەنگۆکەکەی دێنێ.

خانی لەم کارەیدا تەنیا خۆی وەکو شارەزاییێکی زمانی کوردی پیشان نادا، بەڵکو وەک زانایێکی گەورەی زمانی عەرەبی خۆی دەخاتە ڕوو بەتایبەتی لە زانینی زانستیی کێش و قافیەی شیعری عەرەبی کە عەرووزی پێدەڵێن.

## عەقیدا ئیمانێ

خانی «عەقیدە» کە بیروباوەڕی ئیسلامییە بەشیعری جووت قافیە (مەسنەوی) گرنگترین لایەنەکانی بەکوردی دەگێڕێتەوە. بێگومان ئەمە نویشکی چڕی گەلێ لەو زانستییانەیە کە لە حوجرە دەخوێندرێن بەمەبەسی شارەزایی پەیداکردن لە بیروباوەڕی ئیسلامەتی.

ئەم بەرهەمەی خانی لەگەڵ هەموو بەرهەمەکانی دیکەی لە حوجرە و نێوەندی ئایینی لە باکووری کوردستان باون و ڕێزیان دەگیرێ. ئەگەر هەندێ بە وردی بنوارینە خانی لەبەر تیشکی ئەم بەرهەمەی دەبینین دیسانەوە سۆزی کوردەواری و ئەڤینی میللی هانی داوە ئەم بەرهەمە پەروەردەییە دروست بکا بۆ قوتابیانی کورد، ئەگەر نا ئێمە دەبینین ئەو زانیارییانەی لەم کارەی خانیدا خراونەتە پێش چاو وەنەبێ لێکدانەوەیێکی قووڵ بن لە بیروباوەڕی ئایینی ئیسلامدا. خانی بۆ ئەم مەبەسە «عەقیدا ئیمانێ»ی نەنووسیوەتەوە بەڵکو بۆ ئەوەی بووە ئەم زانیارییانە بەکوردی بخوێنرێن، بەتایبەتی بۆ قوتابیان، لەبەر ئەوەیە پێویستە هەموو کارەکانی خانی لە گۆشەی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و مرۆڤایەتییەوە تەماشا بکرێن.

***

ئەحمەدی خانی خاسیەتێکی تایبەتی هەیە لەناو هەموو شاعیرانی کلاسیکی کۆنی کورد و بووە بەنموونەیێکی تاقانە لەناویاندا بەوەی هۆشیارانە چۆتە ناو گێتی هەردوو بابەتە کلاسیکییەکەی شیعری کوردی کۆن و تیایاندا سەرکەوتووە. یەکەمیان شیعری خۆماڵی، مەرجی دیاریکراوی خۆی هەیە لە کێشی سیلابی و قافیەی تایبەتی و زمان و ڕەوانبێژی قەومی؛ دووەمیان شیعری ئیسلامەوی (غەزەل و قەسیدە)، ئەمەشیان کێشی عەرووزی و یەکێتی قافیە و زمان و ڕەوانبێژی تایبەتی خۆی هەبوو. ئەگەر فەقێ تەیران نوێنەری یەکەمیان بووبێ، مەلای جزیری سەرۆکی دووەمیان بووە، بەڵام خانی هەردووکیانی کۆ کردۆتەوە، لە گێتی یەکەمیاندا «مەم و زین»ی دروست کرد، لە دووەمیاندا هەموو بابەتەکانی غەزەل و قەسیدەی ئیسلامەوی هێنایە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

کردەوە ئەدەبییەکانی خانی بیرفراوانی (شموولی) و خەیاڵی بێ پایان و داهێنانێکی وەستایانە دەخەنە بەرچاو، لەبەر ئەوەیە بەرهەمی ئەدەبی ئەو شاعیرە مەزنە بوو بە بەشێک لە «بوون»ی نەتەوایەتی کورد.

## بەشی چواردەم

# مەلای باتەیی

**١٦٧٥ - ١٧٦٠**

### ژیانی

ناوی حوسێنە، بە باتەیی ناوبانگی دەرکردووە. باتە (باتێ) گوندێکە لەناوچەی هەکاری کەوتۆتە لای ڕۆژهەلاتی باشووری جۆلەمێرگ، مەلا حوسێن سەر بەئێلی ئەرتووشییان بووە، نازناوی باتەیی بۆ خۆی هەڵبژاردووە و لە شیعریدا تۆماری کردووە، لە پاشانا کە خوێندنی ئایینی تەواو کردووە بەمەلای باتەیی لەناو خەڵکیدا ناسراوە.

گەلێ کەس قسەیان لە مەلای باتەیی کردووە، بەڵام زۆربەیان زانیاریی کەسانی پێش خۆیان دووبارە کردۆتەوە، کاری بەکەڵک ئەو هەوڵ و تەقەلا و کۆششانە بووە کە لە ئەنجامدا بڕێ لە شیعرەکانی شاعیر دۆزراونەتەوە.

کۆنترین سەرچاوە لە بابەت ئەم شاعیرەمانەوە قسەکانی ژابایە کە دەڵێ: خەڵکی گوندی باتەی ناوچەی هەکارییە، شیعر و بەیتی زۆرە، دیوانی شیعری نایاب و چاکە، مەولوودنامەی بەکوردی نووسیوەتەوە، لە کوردستاندا بەناوبانگە، خەڵکی بەچاوێکی بەرز تەماشای دەکەن، نەوەد ساڵ ژیاوە، لە مەڵبەندی خۆی لە گوندی باتەدا نێژراوە.

وا دەردەکەوێ مەلا حوسێنی باتەیی لە دەوروبەری ساڵی ١٦٧٥م لەدایک بووبێ. لە مزگەوتی (مکس) و جزیرە و جۆلەمێرگ خوێندوویەتی، چونکە لەو دەورەدا ئەو ناوچانە مەڵبەندی بنچینەیی خوێندن بوون لە کوردستانی باکووردا، نەوەی باتەیی تا ئێستا ماون و لەژیان دان.

باتەیی خوێندنی حوجرەی تەواو کردووە، ئیجازەی مەلایەتی لەهەر دوازدە زانستییەکە وەرگرتووە و هەموو ژیانی بەمەلایەتی بردۆتە سەر. وانەی ئایینی وتۆتەوە و شیعری نووسیوە. لە ژیانیدا حەجی کردووە، وا باوە قەسیدە نەعتە بەرزەکەی «هلۆ ڕابە ئەبولقاسم»ی لەسەر ئارامگای پێغەمبەر وتووە. شاعیر تەمەنێکی درێژی بردۆتەسەر. باتەیی خوداناس و پڕ باوەڕ بووە بەئایین و دەڵێن میری جۆلەمێرگ یەحیا بەگ مووچەی ساڵانەی بۆ بڕیبووەوە و بۆی دەنارد گوندی باتە.

بەپێی لێکدانەوەی هەموو ئەو سەرچاوانەی لەژێر دەستدان مەلای باتەیی لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەم لە دەوروبەری ساڵی ١٧٦٠م لە دێی باتە کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە، تا ئێستا ئارامگای وەک گۆڕی پیاوچاکێک بەسەر دەکرێتەوە.

### بەرهەمی

بەرهەمی شیعری باتەیی دەکرێ بە دوو بەشەوە:



١- لیریک (غەزەل و قەسیدە).
٢- ئیپیک (چیرۆکی شیعری = مەولوودنامە).

### غەزەل و قەسیدە

غەزەل و قەسیدەی باتەیی سەر بەقوتابخانەی مەلای جزیرییە، ئەم هونەرە شیعرییە لە ئەنجامی تێکەڵبوونی مەدەنیەتی نەتەوە موسوڵمانەکان (بەتایبەتی عەرەب و فارس و تورک و کورد) پەیدابوو. لەسەر دەستی مەلای جزیری لە باکووری کوردستاندا گەیشتە پلەیێکی بەرز، جا ئەگەر مەلای جزیری دامەزرێنەربێ، بێگومان مەلای باتەیی یەکێکە لە گەورەترین قوتابی و دڵسۆزی داهێنەر و پارێزەری ئەم هونەرە. باتەیی هەندێکی لە مەلای جزیری وەرگرتووە و بڕێکی خستۆتە سەری و پێشکێشی شاعیرانی باکووری کوردستانی نەوەی دوای خۆی و هەموو نەتەوەی کوردی کردووە.

لەناو غەزەل و قەسیدەی مەلای باتەیی بەزۆری ئەم دوو مەبەسانەی لای خوارەوە بەدی دەکرێن:

١- دیوی یەکەمی غەزەل و قەسیدەی باتەیی شیعری ئایینییە.

ئەگەرچی هونەری «موناجات» بۆ خودا و «نەعت» بۆ پێغەمبەر دوو هونەری جیاوازن لە شیعری کلاسیکیدا با زۆریش لە یەکترییەوە نزیک بن، بەڵام شاعیران ڕەچاوی سەربەخۆیی هەردوو هونەرەکەیان کردووە، هەندێ جاریش ئەم دوو هونەرەیان تێکەڵ بەیەکتری کردووە، جا لە بنەڕەتدا مەبەسی باتەیی لە شیعرە ئایینییەکانیدا تەنیا «نەعت» بووە. وەکو دەستوورێکیش ڕستە و ناوەڕۆک و وێنەی موناجاتی لە نەعتەکاندا بەکارهێناوە، ئایەتی قورئانی وەرگرتووە بەتایبەتی ئەوەی پێوەندی بەپێغەمبەرەوە هەیە، ڕستەی پاڕانەوە و ئامۆژگاری ئامادەکراوی بەکارهێناوە، هەندێ جاریش هەوڵی داوە زاراوەی سۆفیزمی ئیسلامی بەکاربێنێ. دیارە نەوەکو تەنیا ئەو سۆفیزمەی لەگەڵ شەریعەتدا دەگونجێ، بەڵکو لە خزمەت شەریعەتدا دەبێ، ئەگەر ناکۆکییێک لە بیروڕا بکەوێتە نێوان سۆفیزم (تەریقەت) و ئایین (شەریعەت)ەوە دەبێ بیروڕای شەریعەت سەر بکەوێ. ئەم بابەتە شیعرە وشە و ڕستەی عەرەبی زۆری تێدا دەبێ، هەر ئەوەش پاڵی بە شاعیرەوە ناوە کە پێنجینی مولەممەع (کوردی - عەرەبی) بەکاربێنێ لە یەکێ لە نەعتەکانیدا.

٢- دیوی دووەمی غەزەل و قەسیدەکانی باتەیی شیعری دڵدارییە. هەوڵ دەدا زاراوەی سۆفیزم بەکاربهێنێ، نەک داهێنانی سۆفیزم، چونکە لەو کەسانەیە کە سۆفیزم لەگەڵ ئایین دەگونجێنێ، لەبەر ئەوە لەلایێک دلبەرەکەی کچێکی کوردە، هەرچی جل و خشڵی جوانی کوردی هەیە لەبەری دەکا، دیمەنی سروشت وەکو کەرەستەیێک بەکاردێنێ، بۆ دەربڕینی جوانی دلبەر، لەلایێکی تریشەوە بەلای ئەوەوە دلبەر هەر پەرییەکەی بەهەشتە، ئەویش لەبەر ئەوەیە چونکە ئەوەی ئێرە (دلبەر) وەختییە و ئەوەی ئەوێ (پەری) هەمیشەییە بۆیە دلبەر لە دواییدا بۆی دەبێتە پەری.

مەلای باتەیی لەم جۆرە شیعرەیدا وشە و ڕستە و لێکسیکۆنی خوێندەوارانە بەکاردێنێ، ئەو وشە و ڕستانەی بەبێگانە دادەنرێن، بەڵام لە ئەنجامی بەکارهێنانی لە شیعری کلاسیکی نووسراوی بەرزدا

(مومتاز) بووە بە بەشێک لە هونەری نەتەوەیی تایبەتی کە لە چوارچێوەی شیعری ئیسلامەوی خۆی دەدۆزێتەوە، وەکو ئەو دیاردە گریکە - لاتینییەی کە لە هەموو ئەدەبیاتی نەتەوەکانی تازەی ئەوروپا دەبینرێ.

### نەعتی باتەیی

(١)

محەممەد سەییدێ عالەم
شەفیعێ ڕۆژا میزانێ
چراغێ دیدەیێ ئادەم
خودانێ وەحی یو فورقانێ
خودانێ وەحی یو تەنزیلێ
ب ئەقلام و ب تەبجیلێ
قەلەم دا نەسخی ئینجیلێ
نەما تەورات خجلانێ
چ ئینجیل و چ تەوراتن
د مەنسووخن د مولغاتن
ب وی ناڤێ موسەمماتن
حوکم چوو کەنزێ ڕەحمانێ
ب حوکمێ سەییدێ مورسەل
نەبی یێ ئاخیر و ئەووەل
بەتال کر دینەها موجمەل
ب ئایات و ب قورئانێ
ب ئایات و ب تەوحیدێ
ژ تەشریفێ و تەمجیدێ
شەڤا خوڕڕەم د تەولیدێ
سەنەم هور بوون د بوتخانێ
نگوون سەر بوون سەنەم عاجز
ژ تەولیدا گولا قورموز



ب کیسرایێ گەها موعجیز
تەزلزول کەفتە ئەیوانێ
بوویە مزکین د دنیایێ
شکفتە وەردی ڕەعنایێ
ژ باغێ ئیستەفەینایێ
قورەیشی ئەسلی ئینسانێ
قورەیشی بوو پەناهی دین
خودانێ سوورەیی یاسین
شڤانێ کو دکی نۆڕین
مەلەک هاتن د فەرمانێ
مەلەک هاتن ب تەعجیلێ
دوو شەق کر سینە جبریلێ
ئەلەم نەشرەح تێ تەنزیلێ
دکت تەوزیح و تبیانێ
خودانێ تەخت و لەولاکە
سیارێ هەفت ئەفلاکە
ل عەرشێ مەرکەزی خاکە
ژ بۆ وی هاتە کێشانێ
ژ بۆ وی چێ بوو ئەڤ عالەم
نەبی بوو هێژ هەڕی ئادەم
د ئەخباری وەکی خاتەم
چراغێ ئەهلێ ئیمانێ
چراغێ ڕوهینا ئوممەت
ژ بۆ وی چێ بوو ئەڤ خەلقەت
فەتتاحێ دەرگەهێ جەننەت
ئەمیرێ سەدرێ دیوانێ
ئەمیرێ تەختێ عوقبایێ
سهاوێ دارێ تووبایێ

خوەزێ جارەک ل دنيايێ
ب ديتا من تو وی ئانێ
تو ئينايی و د حينێ بوو
دلم موشتاقی دينێ بوو
ل ڕێگايە مەدينێ بوو
ڕەسوولێ هاشمی کانێ
ڕەسوولێ هاشمی سابير
ئەوە تاها ئەوە حاشير
دل و جانێ مە بوو ئاگر
ژ نار و پێت و هيجرانێ
چ نار و پێتێ دا سەرمە
ئەڤينا تە قەوی گەرمە
دو چاڤان تێ بکم سورمە
ژ تۆزا ڕەوزێ ئاستانێ
ژ تۆزا وێ دڕازێنێ
دکم فەرياد و نالينێ
خودێ چێ کت د وێ حينێ
ويسالا لوتف و ئيحسانێ
ويسالا سەييدی ئەحباب
خودانێ مينبەر و ميحراب
موبيەسەر بن ل من ئەسباب
مە جان هاڤێتە مەيدانێ
مە جان ڤادا فيدايێ تە
تەنم خاکا سەرايێ تە
زبان وەقفا سەنايێ تە
دلێ من عەبدێ فەرمانێ
دلم قەنديلا ڕەوزێ بت
لەبم نەزديکی حەوزێ بت



ژ ئەهلی سيدق و فەوزێ بت
ئەزم موحتاجێ غوفرانێ
دوو عالەم پێکڤە موحتاجێ
ژ بۆ وان هاتی ئيخراجێ
شەڤا ئەو چوويە ميعراجێ
چ غولغول کەفتە ئەيوانێ
چ غولفول هاتە ئەز غەبرا
سەدايێ گونبەدا خەزرا
کو سوبحانەللەزی ئەسرا
ژ قودسێ چوويە ديوانێ
ئەلا ئەی سەييدێ سەفوەت
تو ڕۆژا حەشر و پڕ فيتنەت
بە تی ژيت ئوممی يێ ئوممەت
فکندە سەر و چۆگانێ
فکندە سەر بيا دەربەی
دکم هيڤی ژ ميرێ حەی
شيفاعەکی ژ بۆ (باتەی)
بدە بەر زيللی سەيوانێ

ئاهەنگ و ڕەوانی ئەم شيعرە شنەبايێکی ڕۆمانتيکييانەی نەرم لە ئاسمانی چيرۆکی پەيدابوونی بيروباوەڕی موسوڵمانەتی دەجووڵێنێ. ئەگينا گێڕانەوەکان زياتر پێوەندييان بەڕاستی و ڕووداوەوە هەيە، بەڵام شاعير بەزمانی شيعر ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە نەوەکو بەزمانی مێژوونووس. لەبەر ئەوەيە ئەم شيعرە بۆ کوردێکی موسوڵمانی پڕ باوەڕ کە پێغەمبەر بەخۆشەويستی خودا دەزانێ بووە بەجۆرە نوێژێک بەزمانی کوردی زۆر باش لێی تێدەگا و هەست و باوەڕی دەجووڵێنێ و بەتێنتری دەکا.

(٢)

هلۆ ڕابە ئەبولقاسم
هلۆ ئەی قاسيدێ ئەکبەر
هلۆ فەخرا بەنی هاشم
هلۆ ڕابە تويێ ڕەهبەر

هلۆ ئەی سەییدێ عالەم
هلۆ ئەی مەفخەرێ ئادەم
ژ ڕەوزێ ڕابە یا خاتەم
ژ ناڤ وێ مەرقەدێ ئەنوەر

ژ ناڤ وێ مەرقەدێ نوورین
هلۆ تاها هلۆ یاسین
ژ دوو سۆتین ئەمێت مسکین
هلۆ مەهدەرچی پێ مەحشەر

هلۆ جارەک د حینێ دا
کو دا نوور چیت د چینێ دا
حەتا کەنگی د مەدینێ دا
نیقاب پۆشی نیقاب ل سەر

نیقاب بو پەردەیا باڤێ
ل مەهجووران دەم و گاڤێ
ب ڕەحمەت لێ بکت ئاڤێ
شەفاعەت کی ژ بۆ مەهدەر

تویی خاهێ شەفاعاتێ
سڤک سازێ موناجاتێ
هلۆ نوورا هیدایاتێ
ئیمامێ مەسجید و مینبەر

ئیمامێ ئەنبیایێ تو
ل قورئانێ خودانێ تو
یەقین ئەم خوش شڤانێ تو
شڤانێ ئوممەتێ یەکسەر

شڤانێ ئەسمەری گولباف
هلۆ ئەی نێرگزا تێر ئاڤ
خەدەنگا عیشوەیێ پر تاڤ
بکە ئەز کیسەوا عەنبەر



عەبیر و بینە زولفەینێ
خودانێ قابە قەوسەینێ
ل سەر چاڤێن مە نەعلەینێ
بنێڕ ئەی داعی یێ سەروەر

تویی داعی حەبیبەڵڵا
فیراقێ سۆتن ئەم وەڵڵا
تەرەحەم یا نەبیەڵڵا
ل مەهجووران هلۆ بنکر

هلۆ جارەک ژ وێ خاکی
سیاری هەفت ئەفلاکی
بەلێ سولتانێ لەولاکی
تویی ئەی ساقی یێ کەوسەر

ئەلا یا ئەیووهەساقی
خودانێ عەهد و میساقی
هلۆ سوار بە ل بوراقی
هەرە پێش خالیقی ئەکبەر

هەڕە پێشی خودایێ مە
ڕەحیم و ڕەهنە مایێ مە
شەفاعەت کە خەتایێ مە
ل دیوانێ بکە مەهدەر

بکە مەهدەر ل دیوانێ
د ڕۆژا حەشر و میزانێ
عەفووکە مە ژ عیسیانێ
نەبن شەرمەندە ئەی سەروەر

د ڕۆژا حەشرا پڕ هەی هەی
هەزاران پەی ل سەر یەک پەی
بکۆمارا بیا (باتەی)
خودان بەخشی برە و ب گوزەر

ئەم پاڕانەوەیە مۆنۆلۆجێکە لە هەست و نەست بەقسە لەلایەن شاعیرەوە لەگەڵ پێغەمبەری دەکا، بەڵام پێغەمبەر لەلای نییە، لەبەر ئەوە پاڕانەوەکە وەکو مۆنۆلۆجێک دەمێنێتەوە و نابێ بەدیالۆج، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئەوە بزانین ئەگەرچی پێغەمبەر وەرامی شاعیر ناداتەوە، بەڵام باتەیی لەوە دڵنیایە کە پێغەمبەر ئاگادارە و گوێی لە قسەکانیەتی و دەگاتە هانای شاعیر و هەموو موسوڵمانێکی کە گوناهیان بەئانقەست نەکردووە، بەتایبەتی گوناهی پێش تۆبە.

شاعیر بەجۆرێک تەماشای پێغەمبەر دەکا وەکو مەزنترین و پاکترین نەوەی ئادەم، بەڵکو بەلایەوە دروستکردنی ئادەم لەبەر پێغەمبەر بووە. چونکە خۆشەویستی کردگارە، خودا لە کۆنەوە لەسەر لەوح نووسیویەتی ڕۆژێ لە ڕۆژان پەیدا دەبێ بۆ بانگکردنی خەڵکی بۆ ڕێی ڕاست.

محەمەد سەرۆکی هەموو پێغەمبەرانە، خۆشەویستی خودایە، بۆیە کەس چاوی بەخودا نەکەوتووە ئەو نەبێ، هەر لەبەر ئەوەشە هەموو داواییێکی دێتە دی، بەم جۆرە پیاو دەبێ لەو بپاڕێتەوە، چونکە پێوەندی نێوان ئادەمزاد و کردگارە.

(٣)

ئەی نەعتێ تو ئەز عەرشی هەتا فەرشی شەهیرا
ئەز پرتەوێ نوورا تەجیهان گەشتە مونیرا
ئەی سەییدێ عالەم بکە پەروایێ ئەسیرا
ئەی تاجی سەرێ شاه و سەلاتین و ئەمیرا
(قد کان لك الفضلُ لكَ الجودُ کثیرا)
(أرْسِلْتَ الی الخلْقِ بشیراً ونذیرا)
تاها تو ڕەسوولێ مەلەکێ عەرشێ عەزیمی
دەر بەحری کەمالێ تو تەنێ دوڕڕا یەتیمی
لوء لوء سیفەتی دەرسەدەفی بەحرێ کەریمی
(أحسن تر) ئەز یووسفی سددیقێ حەلیمی
(ما کانَ لكَ الناسُ شبیهاً ونظیراً)
(أرسلتَ الی الخلق بشیراً ونذیرا)
ئەی سەروەری دین مەهبەتێ ئایاتێ موکەڕڕەم
ئیسمێ تەیە هندێ سەفەحان بوویە موفەخخەم
لوتفا تە شەیاتین ژ سەما کرنە مورەججەم
گەر تو نەبوویا قەت نە دبوو چەرخێ موعەززەم



(طوبی لمن أشفقتَ له کنت مجیراً)
(أرسلتَ الی الخلق بشیراً ونذیرا)
ئەی لەعلێ لەبت عەزمی ڕەمیمی دکە ئیحیا
جۆشان و خرۆشان ژ فیراقا تەیە دەریا
پڕ شەوق و خوهار و ب تە سەرگەشتە سوررەییا
هەرچی کو ب شەرعێ تە عەمەل دارن د دنیا
(کانت لهم الخلد جریراً وسریرا)
(أرسلتَ الی الخلق بشیراً ونذیرا)
فەخرا مەلەکان پادشاهی تەختێ مەدینی
یەک لەحزە گەها عەرشێ خەرامان ب مشینی
نەه چەرخی فەلەک بۆ نەتە سەرگەشتی ئەڤینی
خەلقی کو نەئێنت ب تە ئیمان و یەقینی
تێک بوونە خەسارات (وسیصلون سعیرا)
(أرسلتَ الی الخلق بشیراً ونذیرا)
بارانی سەلاتان ژ خودا سوبح و عەشییا
بەر سەییدێ موختارێ ڕەسوولێ عەرەبییا
بەر ئال و وە ئەسحابی حەبیبی قورەشییا
سددیق و چ فارووق و چ عوسمان و عەلییا
(کانو لَكَ في الدین معیناً وظهیرا)
(أرسلتَ الی الخلق بشیراً ونذیرا)
ئەی سەییدێ عالەم سەنەدێ نوورا هیدایەت
هیڤی دکەن ئەم ژ تە ئەی سەدری ریسالەت
مەحروومی نەکی مە ژ دیوانا شەفاعەت
(باتی) ب جەهەننەم نەبری پەرواری قیامەت
(قد کنتُ له ثمة شفیعاً وظهیرا)
(أرسلتَ الی الخلق بشیراً ونذیرا)

لەم پێنج مولەممەعەدا باتەیی هونەرێکی زۆری خەرج کردووە، بەپێی ئەوەی کە بابەتی مولەممەعی هەڵبژاردووە دەبێ هەندێ دێڕی بەزمانی تر بێ. ناچار بووە وشە و ڕستەییێکی یەکجار زۆری عەرەبی

ئایینی بەکاربێنێ لە قسە کوردییەکانیشدا. ئەمە و جگە لەوەی بابەتەکە کە ئەددەبی ئایینییە، لێکسیکۆنی ئایینی موسوڵمانیش زمانی عەرەبییە، دەبێ وشە و ڕستەی ئامادەکراوی زۆری تێدابێ. زیاتریش ئاهەنگی ئەم شیعرە پڕ زەمزەمە و تەنتەنەیە هەست و نەستی پیاو ڕادەکێشێ، بۆی هەیە ئەگەر لە مانا و ناوەرۆکیشی نەگا کاری تێ بکا.

**شیعری دڵداری باتەیی**

(١)

سوبح و ئێڤاریێ شەڤا تاری شەمالا کێ یی تو
لەیلەتولقەدر و بەراتن نووریێ مالا کێ یی تو
چیچەکا باغێ ئیرەم شۆخ بەژن و بالا کێ یی تو
بۆ خودێ کەی بێژە من کانێ شەپالا کێ یی تو
دێم کتێبە زولف و حاشی شەرحی خالاکێ یی تو
دلبەرا گەردەن شەفیفی دانوا دوڕرا عەدەن
نازک و مەوزوون لەتیفی نەخلیا سەلوا چەمەن
گول لیباسی، گول قیاسی، گول تەنی، گول پیرەهەن
ئاهوویا دەشتا تەتاری ڕەهزەنا ئاسکا ختەن
حۆرییا باغێ بەحەشتێ چاڤ غەزالا کێ یی تو
قیبلەگاها عاشقانی شەنگەلا ئەبرۆ زراڤ
هاتە بورجا شانەشینێ سەد مەلائیک چون سلاڤ
داغ و کۆهڤانا ئەڤینێ سۆتی جانێ من تەڤاڤ
ئەختەرا سوبحا سەعیدی ڕەش ڕەیحانا تا بەلاڤ
فلفلا هیندوستانێ زولف و خالا کێ یی تو
ئەو چ دیمە شاهە باغە گولشەنا دارولقەرار
سەد هەزاران نال و ئاوازێ ژ بلبل چار کەنار
حەلقە پێ دا بەست و هاتن عەقرەب و ئیلان و مار
نێرگزا شەهلا شەپالی یاسەمینا مێر غوزار
لە ب خەمۆشی، مەی فرۆشی، دێم پەیالا کێ یی تو
پێنجێ سالێ شەهـ لەوەندی کەفتمە چاها رەسەد
ئەز نزانم چەرخێ دێمە تێ هەیە بورجا ئەسەد



جەنگەلەک ئاڤێتە دل کون کر ل من داد و مەدەد
قەلبەکێ هشک و سفالین من دڤێت جان تا ئەبەد
شاه ل تەختێ دلبەرێ فیکر و خەیالا کێ یی تو
سەفحەکێشا کاتبێ غەیبێ ژ نوورا لایەزال
خالەکا وا ل گەردەنێ میسلێ بەرێ ڕەش ماه ویسال
سەد هەزاران ڕەکبە حاجی تێن تەوافا زولف و خال
نەترەکو شتر یو ئیلان دانەبەر بایێ شەمال
لا ئوبالی چاردە خالی، چاردە سالا کێ یی تو
شەهـ کتێبەک من دڤێت بەحسێ مەحببەت بیلتەمام
سەد تەلیسم و سیکرە تێدا پێکڤە سوریانی مەقام
ئەبجەدا عیشقێ مە خوند و عەقل و وندا کرد مام
حۆرییا باغێ بەحەشتێ تووتیا تاووس خەرام
غەیرێ (باتەی) پادشاها من دەلالا کێ یی تو

ئەم پێنجینە غەزەلێکی ئاساییە، باتەیی دەیەوێ باسی ئەوە بکا کە خۆشەویستی هەیە، پێی خۆشە ئەو دلبەرە لە دانیشتوانی ئەم گێتییە و ئەو گێتییەش بێ، هەرچەندە هەوڵیش دەدا ئەوە دەربخا کە هەردووکیان یەکێکن، بەڵام بۆی ناچێتە سەر. یەکێک نین بەڵکو لە یەکتری دەکەن، ئەوەی ئێرە هەیکەلی مەتریالی هەیە، ئەوەی ئەوێ هەیکەلی میتافیزیکی هەیە. بەڵام سەرکەوتنی شاعیر لەوەدایە کە توانیویەتی ڕووداوی هەستپێکراوی سروشت بکاتە کەرەستە و لەگەڵ پەیکەری دلبەرەکەی بەرامبەر و بەراوردیان بکا.

(٢)

ئەلوەفایێ وەسلی جانان
غەمز و نازا من نەهات
یا تو قەلبی عاشقانی
گول نیگارا من نەهات
مام د قەیدا دەرد و داغان
غەم کوسارا من نەهات
سوبحی نابت وێ شەڤێ
دەنگی تارا من نەهات

هیڤیداریٚ سوبحەییٚ بانگی منارا من نەهات
دەرد و داغم بیٚ قەرارم
بیٚ بهارم بیٚ چەمەن
بیٚ حەبیبم بیٚ تەبیبم
هەم غەریبم بیٚ وەتەن
شوبهی یەعقووبی ژ عەشقا
یووسفی گول پیرە هەن
مونیسیٚ دەرد و غەمانم
ساکینی بەیتولحەزەن
تار و مارم ئینتیزارم شاهسوارا من نەهات
پرتەوا شەمعا جەمالیٚ
من د سۆژت دەم ب دەم
ئیشتیاقا زولف و خالان
تێک کرم دەریایی غەم
دامە بەر پێچا فیراقیٚ
وەسلیٚ قەت ناکت کەرەم
ما مەدەد کاریٚ مە بت
ئیننا فەتەحنا سوبح و دەم
وەرنە سۆتم ئاتەشی دل شەهریارا من نەهات
شوبهی مەستانم وەکو
دێوانە ئەز دێوانە سەر
باد نۆشم پڕ خرۆشم
ییٚ بیٚ هۆشم دەربەدەر
حەسرەت و هیجرێن کەسەر
مەحبووب و غەیرن بیلنەزەر
بیلفیراقی لیتتەلاقی
بیٚ سکوونم تا سەحەر
خواب و نۆشین باعەزیزم



خوابیٚ نۆشینیٚ عەزیزم دل نیگارا من نەهات
مەجلیسا بیٚ ساز و هەی هەی
من نەڤێت و ناچمیٚ
بیٚ دەف و بیٚ چەنگ و بیٚ نەی
من نەڤێت و ناچمیٚ
بەزمەیا بیٚ یاری (باتەی)
من نەڤێت و ناچمیٚ
دیٚ گروشمان کیٚ ل من کت
من نەڤێت و ناچمیٚ
بیٚ فەراغەت یاری (باتەی) عیشوەگارا من نەهات

باتەیی چاوەڕوان بوو، بەڵام دلبەر هەر نەهات، دەبێ نەیە، ئەگەر بگاتە کۆڕی عاشقان با پیری موغانیشی لێ بێ تەلیسمی شیعرەکە دەشکێ. شاعیری ئێمە یەکەمین کەس نییە دەردی دووری چێشتبێ، لەبەر ئەوە پەنای بردۆتە بەر مامۆستای خۆی پیری چاوەڕوانی، ئەوەندە چاوەڕوانی کرد بەڵام یووسف هەر نەگەیشت تا ئاوی چاوی داهات و کوێر بوو، چونکە ئەو چاوەی یووسفی پێ نەبینێ با کوێر ببێ.

(٣)

ئەجەل ساقی ب دەس من دا
مەیا باقی د پەیالیٚ دا
ژ ویٚ ڕۆژیٚ حەتا ئیرۆ
دلیٚ من ما د خەیالیٚ دا
خەیال و غەم ل من پڕ بوون
ل تووریٚ ئاگرەک هەل بوو
دەما من جیسم و جیسمانی
وەکی تۆزیٚ د بایێ دا
وەکی تۆزی وەکی غەبریٚ
وەکی مەوجا ل سەر بەحریٚ
دگەل دا ئەز غەریق مامە
ل ناڤ پێلێت د ئاڤیٚ دا

د رەنگێ دلبەرا حۆری
گەلۆ یارەب ل من پەیدا
زەریفا شەنگ ژ نەها بۆری
شەفەق دا دەر د ڕۆژێ دا
شەفەق دا ئەرد و ئاسمانی
ل من دل بر ب ئێسانی
دخۆم سوندێ ب سەنعانی
زولەیخا بوو د میسرێ دا
تو چێتر بووی ژ زولەیخایێ
شەپالی شەنگێ لەیلایێ
نەهێن ئەڤ ڕەنگ د دنیایێ
ب وێ بەیتا د کەعبێ دا
ب وێ بەیتا د حاجاتێ
دخۆم سوندێ ب ئایاتێ
نەهێن ئەڤ ڕەنگ د جەنناتێ
مونەووەر بوو د نوورێ دا
مونەووەر بوو ژ بەر نوورێ
کو من دی بوو ل سەر شوورێ
توبی شوبهێ پەری حوورێ
دلێ من تیرەیێک لێ دا
ل من دا تیرەکا دژوار
سەرێ تیرێ د دل چوو خوار
لێ دایم ئەز دکم هاوار
وەکی مەجنوون د عەشقێ دا
وەکی مەجنوونی دینم ئەز
وەکی بلبل دخوینم ئەز
حەتا کەنگی دمینم ئەز
د زیندان و د حەبسێ دا



ئەزم دایم د زیندانێ
وەکی یەعقووب د کەنعانێ
گەلۆ دلبەر نوزام کانێ
مە چاڤ مابوون ل وێ ڕێ دا
مە چاڤ مابوون ل وێ خەیلا
دکم هاوار و واوەیلا
کو جارەک بێتە دەر لەیلا
ببینم ئەز د خەملێ دا
ببینم جا وەکی بایێ
شیرینتر بووی ژ لەیلایێ
نەهێن ئەڤ ڕەنگ د بەغدایێ
ل تەورێز د شامێ دا
نەهێن ئەڤ ڕەنگ د ناڤ ڕۆمێ
گەلی خەلکێ نەکەن لۆمێ
کو ئەز سۆتم کەتم دۆمێ
بوومە ئێخسیر د بەندێ دا
بوومە ئێخسیرێ ڕەیحانا
ڤەیستن زولف و چۆگانا
کرمە دینەک د دیوانا
وەکی شێخێ د خەلوێدا
ئەزم دایم د خەلوێ مە
ب دل دایم دگەل وێ مە
........................
هلات بوو ڕۆژ د شەرقێ دا
ژ شەرقێ ڕۆژ کو هاتە دەر
دنێ پێکڤە بوویە ئەنوەر
ببینیت دلبەرا دلبەر
موفەررەح بووم دگەل وێ دا

موفەررەح بووم دگەل یارێ
برۆ قەوسێ کەزی مارێ
وەراندن وێ ئەڤێ جارێ
تەواف خالە د چارێ دا
وەکی من دیت د ڕەقسێ دا
وەکی من دیت ل کۆڤەندێ
گەلۆ یارەب تژی چەندێ
نەهێن ئەڤ ڕەنگ ل سەمەرقەندێ
د بەلخێ و و بوخارێ دا

لەم شیعرەدا باتەیی هەوڵ دەدا هەندێ دروشمی سۆفیزمی ئیسلامی بەکاربهێنێ، بەلایەوە ژیانی ئەم گێتییە بەندیخانە و دەستبەسەرییە تا گوناهی باوکی (ئادەم) پاک دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی جاویدانی. لە بەندیخانەدا هەمیشە چاوی لە گێتیی ئازادییە، بۆیە ئاشنای مەیخانەیە، چاوی لە پەرییە. پیری کەنعان و شێخ سەنعان و زولەیخا و لەیلا هەمیشە لە خەیاڵی دان. هەموو ژیانی لاواندنەوە و کرووزانەوەیە لە دەردی زیندان و ژێر دەستی (گێتیی ئێمە) و ئاواتەخوازی ژیانی سەربەستی و ئازادییە (گێتیی دوایی). دیارە باتەیی لە دەوروبەری زاراوەی سۆفیزمی ئیسلامی دەسووڕێتەوە، نەوەکو ئەدەبی داهێنانی سۆفیزمی کۆزمۆسی.

(٤)

ژ بەختێ من ڕەشی ڕا بوو
خەیالا من د باتیل هات
ل من ڕۆژا غەم ئاڤا بوو
شەڤا زولفێ موقابیل هات
شەڤا زولفێ کو پەیدا بوو
ژ ڕۆژێ نوور وندا بوو
عەجەب نوورەک ب من دابوو
هەتا شەهمارێ قاتیل هات
چ شەهمارێ خەنا پەنجێ
تەلیسمە وێ ل سەر گەنجێ
دلۆ رابە ببین قەنجێ



چ پێشەنگە شل و مل هات
گەلۆ پێشەنگە یا عەرعەر
گەلۆ ئەڤ زولفە یا عەنبەر
شەپالا نازک و ئەسمەر
ب خرخال و سەلاسیل هات
سەلاسیل تەوق و گەلوازن
هەزار ڕەنگ و ب ئاوازن
گوهار و بەربەن و بازن
چرنگینا بەر و مل هات
بەر و مل دەست و بشکۆژن
جەواهیرتێ وەکی ڕۆژن
د بەردا غونچە دلسۆژن
عەجایب باغێ کامیل هات
عەجایب باغێ گوڵ گەش بوو
هەر چی ئەو دی مشەووەش بوو
دەماغا دل مە پێ خوەش بوو
بەلێ دارا قەرەنفل هات
بەلێ دارا د گول پێڤە
هەنار و زەربەه و سێڤە
سیەه زولفێ کەتێ نێڤە
ژ بەلگاندا جەلاجیل هات
جەلاجیل بەرگی شیرینە
کەسێ ئەو هات و تەمکینە
ژ ئەنیێ گول دیارینە
ل سەر چاڤان ئەنێ گول هات
ئەنێ گول بوو بەلێ سی بوو
ب گەردەن شوبهەتی سی بوو
سەه و سەیوان مەیاسی بوو

ژ دیمێ خۆ ب زەنگل هات

ژ دێمێ زولف و سەرکێشن
جەگەر بێ حەد ژ بەر تێشن
قول و خادیم بەڕوو پێشن

شەمالا تازە مەنزل هات

شەمالا من شەفەق سەعدێ
دنالم شوبهەتێ ڕەعدێ
شرین لێڤێ شەکر وەعدێ

سەرا مەستا ژ من سل هات

ڤێ مەحبووبێ ب سەرمەستان
جەلاد ئینا ژ کوردستان
ڕوحا من وی دەمی بۆستان

جەلادی ڕەش موعەجەل هات

موعەجەل هات پەری حاله
ب شمشیر و شەڕ و قاله
نەپرسی ئەڤ چ عەبداله

ل دەرگاهێ مە سائیل هات

ئەزم سائیل ل دەرگاهێ
نەگۆ: عەبدال چ میخواهێ
ژ من قەت نینە ئاگاهێ

فیغان و ئاهێ بلبل هات

چ گول بوو چ بلبل بوو
مرادا مەتلەبا دل بوو
ئەگەرچی ئەو ژ من سل بوو

ژ بۆ (باتەی) حەمایل هات

ئەم غەزەلەی باتەیی خەریکی ئەندامە جوانەکانی یارە، بایەخێکی تەواوی بەزولفی خۆشەویستەکەی داوە، بەوەی بە بەختی خۆی و شەوی بێ مانگ و ڕەشماری چواندووە. خشڵی هەموو کوردەواری کۆکردۆتەوە و خۆشەویستی پێ ڕازاندۆتەوە، گوڵی هەموو کوردستانی کۆکردۆتەوە و ئەندامە ناسک و



ڕەنگینەکانی لەشی دلبەری پێ بەراورد کردووە، تاوەکو پەیکەری یار بووە بەباغێکی گەورە و فراوانی تەڕ و ئاودار، نە ئەم سەری دیاربێ و نە ئەوسەر، هەموو جۆرە گوڵ و میوەییێکی لێ دەست دەکەوێ.

شاعیر تەنیا بەوە نەوەستاوە گوڵ و گولزاری نیشتمانی خۆی بەسەربکاتەوە، بەڵکو ناوی کوردستانیشی هێناوە وەک دایکی ئەم هەموو جوانییە.

(٥)

عاشقێ زولفا ڕەشم
عاشقێ شەیدایە زولف
بێ بادە لەو سەرخوەشم

سەرخوەش و سەودایە زولف

سەرەخوەشم ئەز ڤێ دەمێ
کەفتیمە توورا غەمێ
سوهتیمە وی بەرچەمێ

چیمەکێ ڕەعنایە زولف

زنجیر و تابێ قنار
سەردا بە گۆش و گوهار
پێداخۆشی هاتە خوار

شەهمارێ شەهلایە زولف

ڕاحەت و سەبر و سەلام
توی چاپکی خوەش خەرام
کۆلێ تەمە ئەز غولام

(باتەیی) قل شایە زولف

لەم شیعرە لیریکییە کورتەدا باتەیی وەسفێکی ساکاری ڕووکەشی زولف دەکا، هیچ شتێکی نهێنی لەژێر مووەکان نابینێ، ئەفسانە دروست ناکا، شاعیر بێ بادە سەرخۆشە وەکو زولفی شەیدا و شێواو.

(٦)

ژ ئیلتافا شەهنشاهێ
د ڕۆژا پێنج شەمبێنە
بوویە زەمزەم ل دەرگاهێ

کو سولتان هاته شیرینە
بەنی سولتان و شیرینێ
خودانا یۆ ل و تەمکینێ
قوماشێ چین و ماچینێ
ژ سندووقان دەرانینە
قوماش و ئەتلەس و خارا
عەبیر و عەنبەر و سارا
موزەییەن بوو جەمالارا
ب تەوق و تاج و زێرینە
ب زێڕ و تەوق و خرخالا
مەشا (سەلوا) ل ئەبدالا
خو ئاڤێتە د ئالالا
شەپال و تازە ئەسمینە
چ ئەسمین و ترازن بوو
ب ناز و عیشوە مازن بوو
خرێنا تەوق و بازن بوو
گوهار شۆڕ بوون ب سەر سینە
گوهار و شۆرە هەم دەستێ
سیما دارن ڤە ناوەستێ
ڕەیحانا شۆرە لێ بەستێ
ل گوڤەندێ چ نەسرینە
چ نەسرین و قەرنفل بوو
ڕەیحان و نیڤە نیڤ گول بوو
ل گوڤەندێ شل و مل بوو
لفو رویشی و شترینە
لفو رویشی و شیرین تێن
ب چین چین تازە خەمری تێن
ژ باغێ تازە قومری تێن



ب ڕەفرەف وەردەک و سینە
ب ڕەفرەف وەردەک و قازن
شەراب و شەربەت و سازن
دەلال و عیشوە و و نازن
کەمانچ و عوود و موغنینە
کەمانچ و عوود و موئنیس بوو
عەجیب سولتانێ مەجلیس بوو
ژ عەقلێ (باتەی) موفلیس بوو
ژ فەهم و عەقل و زانینە

لەم بڕە شیعرە لیریکییەدا باتەیی دیمەنێکی ئۆروستوکراتیی دەوڵەمەند و جوانی ژیانی دڵداری کۆشک و سەرا دەکێشێ. جلوبەرگی ئاوریشمین، زێڕ و خشڵی گران، گوڵاوی بۆن خۆش، ئاهەنگی مۆسیقا، کۆڕی مەی نۆشان، سولتانی ئەم بەزم و ڕەزمە یاری نازدارە، ئیتر ئەمە چۆن لەگەڵ هەژارێکی وەکو باتەیی بەراورد دەکرێ!

(٧)

ژ چریا پاشی یێ پێ دا
(مەلایێ باتەیی) کانێ
سەفەرکێشا ب مکسێ دا
ل سەر دەورێ زڤستانێ
زڤستانێ ئەڤێ یۆلێ
ل ڤێ بەریێ ل ڤێ چۆلێ
گەرۆڤێ گرتی داهۆلێ
خوناڤی گرتی کیستانێ
خوناڤێ گرتی نەسرینە
جەمەد شین بوو ل سۆلینە
گریا مە تێ ژ بو ئەسمینە
پەریشانم ژ تالانێ
پەرێشانم ل هنگۆری
ل جۆ مەرزا گولا ژۆری

مەجالێ بەر چەلا بۆری
زەرێ ناهێنە سەیرانێ
زەری تێن و دیار نابن
چ خوەش تێن و ستار نابن
چ جندی تێن سوار نابن
بوویە تاری ل کۆلانێ
بوویە تاری و زولماتە
سڕ و سەرما ژ نوو هاتە
یەقین کانوونە وا هاتە
بنێرن داغ و کۆڤانێ
بنێر داغا مە ئێخسیرا
غەزام زەربوون ڕەزێت میرا
ڕەیحان باری د ئاڤێ را
ڕەیحان بۆرین د ئیوانێ
ریحان بارین د ئاڤێ دا
سەمۆمی بایەکی لێ دا
گولا گەش چوو د حەودێ دا
وەراندن کاتە ریحانێ
وەراندن کاتە مەحزوونە
ژ باغا بارکر و چوونە
سپیندار سەرنخوون بوونە
ڤەوەستا بوون ژ هژیانێ
ڤەوەستا بوون د ترسێ دا
فەما بوون ئەو د مکسێ دا
ب دەه ڕۆژان د پرسێ دا
مە دەست بۆری ژ گریانێ
مەلا لێ بەر چەلا بۆری
پەریشانن ل هنگۆری



ژ چو مەرزا گولا جۆری
کوتێک هەژیا ژ بارانێ
بۆ خۆ دا بچینە ئەرواسێ
ئەیا (باتەی) ڤەخۆ تاسێ
تو سەردا بووی مە نەیناسێ
د خوازین داد و ئامانێ

لەم بڕە شیعرەیدا مەلای باتەیی باس لە زستانێکی ساردی تووش دەکا، شیعرەکە زادەی گەشتێکی بووە بۆ لای میری هەکاری، گۆیا هەمووساڵێک سەری میری مۆکسیشی دەدا. ئیتر ماوەیێک لە جۆلەمێرگ دەمێنێتەوە لای میری هەکاری تا مانگی تشرینی دووەم لەوێ دەبێ. لەوکاتەدا داوا لە میر دەکا کە ماڵئاوایی لێ وەربگرێ و ڕێی بدا بەرەو مۆکس بکەوێتە ڕێ. میر دەیویست تا زستان بە سەر دەچێ لای بمێنێتەوە، بەڵام باتەیی سوور دەبێ لەسەر ڕۆیشتن، ئیتر بەڕێ دەکەوێ و لە ڕێگا تووشی بەفرێکی ئەستوور دەبێ و ڕزگاری لێ نابێ و تا دەبێتە هۆی خنکانی لەناو زەریای بەفر، بەم ڕەنگە لەناو بەفر دەمێنێتەوە تا بەهارێکی درەنگ، کە زەوی ڕەش دەبێتەوە، لاشەی دەدۆزنەوە و ئەم پارچەیە لەناو دەفتەری شیعری دەبێ، ڕەنگە دوا شیعری بووبێ.

گرنگی ئەم شیعرە لەوە دایە کە باتەیی وەسفی دیوێکی تری سروشت دەکا، ئەمە کەژی زستانە، دروشمی گرژی و قوچانەوەیە.

**مەولوودنامە**

مەلوودنامەی باتەیی کۆنترین چیرۆکی شیعری لەدایکبوون و هەندێ لەبەسەرهاتی منداڵی پێغەمبەرە لە ئەدەبی کوردیدا. جگە لە خوێندنەوەی لە ئاهەنگی مەولوودی مزگەوت و ماڵە کوردان لە بەرنامەی خوێندنی حوجرەی مزگەوت و لە پاش قورئان تا ئێستاش لە باکووری کوردستان دەخوێندرێ.

لەبەر گرنگی ئەم بەرهەمە ئەدەبییە گەلێ دەسنووسی کەوتۆتە ناوەوە، لە کوردەواریدا دانەی زۆرە، هەندێکیشی کەوتۆتە نامەخانەکانی ئەوروپا و لەوێ پارێزراون. چەند جارێکیش چاپکراوە.

ڤۆن لوکۆک لە ساڵی ١٩٠٣ لە بەرلین بەزەنگوگراف وێنەی تەواوی دەسنووسێکی مەولوودنامەی بڵاوکردۆتەوە، جگە لەوە زیاتر لە دە جار بەچاپ گەیێنراوە: لە قاهیرە، ١٣٢٤ھ/١٩٠٦م؛ لە شام، ١٩٣٣م؛ لە ئەستەموول، ١٣٥٠/١٩٣١م؛ لە هەولێر ١٩٦٦؛ لە بەغدا، ١٩٨٢، لە دهۆک ١٩٩٦ ولەجێی تریش.

باتەیی هونەری مەسنەوی (جووت قافیە)ی بەکارهێناوە بۆ هۆنینەوەی ئەم یادگارە. هەمووی بریتییە لە نزیکەی شەش سەد دێڕە شیعر (مەسنەوی = دوو نیوە دێڕ). پێشەکی مەولوودنامە بەم ناونیشانەیە «هذا مولد النبي الهاشمي بلغة الكردي أهل العراق» ئەم دێڕانەی گرتۆتە خۆ:

حەمدی بێ حەد بۆ خودایێ عالەمین
ئەو خودایی دایە مە دینی موبین
ئەم کرینە ئوممەتا خەیرولبەشەر
تابیعی وی موقتەدایێ نامەوەر
ئەو خودایێ مالیکی مولکی عەزیم
دایە مە میرات و قورئانا کەریم
دینی مە کر کامیل و نیعمەت تەمام
یەعنی دامە ئەحمەد و داروسەلام
ئەو خودایێ بێ نەزیر و زولجەلال
بێ میسال و بێ هەڤال و بێ زەوال
ڕازیقی بێ دەست و پاو و مار و موور
عالمی سیرڕانە کووتی در سودوور
کارسازی بەندە و و سولّتانی جان
ڕاحیم و ڕەحمان، لەتیف و میهرەبان
ئاسمانی بێ ستوون وی کر بەدید
سوورەتی باخال و تەخت وی ئافەرید
هیڤی دارین ئەم ژ تە شاهی کەریم
ئیهدینا یارەب سیڕاتەلموستەقیم
تێ ژ مە سووچ و خەتا تێن و ستەم
لێ ژ تە ئیحسان و غوفران و کەرەم
یارەب ئیمانی دخوازین ئەم مودام
ژێری ئالایێ محەممەد وەسلام

ئینجا دێتە سەر پێداهەڵدانی پێغەمبەر، باس لە گەورەیی دەکا، لە پرتەوی دەدوێ، لە پاشانا دەگەڕێتە دواوە بۆ لای ئادەم و پرتەوی پێغەمبەر دوارۆژ لەودا دەبینێ و باس لە دەرچوونی ئادەم دەکا لە بەهەشت. ئەوجا دەڵێ پرتەوی پێغەمبەر لە ئادەمەوە چووە بۆ باپیری کە عەبدولموتتەلیبە، لەویشەوە بۆ عەبدوڵڵای کوڕی، ئینجا خۆ دەرکردنی لە ئامینە و زگ پڕ بوونی. لە مانگی یەکەمەوە تا مانگی نۆیەم، لە هەر مانگێکدا پێغەمبەرێک سەر لە ئامینە دەدا و مژدەی لەدایکبوونی پرتەوی پاکی دەداتێ. ئەو



پێغەمبەرانەی لە مانگی یەکەمی زگ پڕ بوونیەوە بەڕێز سەریان لێ داوە و سڵاویان لێ کردووە ئەمانە بوون: ئادەم، شیت، ئیدریس، نووح، هوود، ئیبراهیم، ئیسماعیل، مووسا، عیسا. ئەوجا باس لە دایکبوون دەکا و دەکەوێتە پێداهەڵدانی، وەکو سەرۆکی هەموو پێغەمبەران و خۆشەویستترین و نزیکترین ئادەمزادێک لە خودا. ئینجا پەروەردەکردنی پێغەمبەر لەلایەن حەلیمەی مەمک دایەنییەوە.

باتەیی ئەنجامی مەولوودنامەکەی ناوناوە «در مناجات ختم الكتاب * ومولد رسول الملك الوهاب» و بەم دێڕانەی لای خوارەوە کۆتایی پێ دەهێنێ:

یا ڕەسوولەڵڵا ڕەسوولی ئینس و جن
یا شەفیعێ سەدرێ دیوانا مەزن
تو شەفاعەت کە ژ بۆمە عاسیان
وەرنە نەفسا شوومە ناکەت قەنجیان
یا کەریم و یائیلاهەلعالمین
یا ڕەحیم و یا عەزیم و یا مەتین
هیڤیداری ڕەحم و ئیحسانا تەین
تالیبی ئیکرام و غوفرانا تەین
حازیری گوهداری مەولوودا ڕەسوول
هیڤیا مە تو بکەی یارەب قەبوول
نێ تو غەففاری و سەتتار و لعویووب
مە ببەخشینی ب غوفرانا زونووب
هەم ل دا و باب و هندی موئمینین
هەم ل هندی موئمیناتان ئەجمەعین
تابیعی ئان شەهسوواری ئوممەتێ
پێکڤە رابین و بچینە جەننەتێ
ئەووەلەن بۆ ڕەوزەیی نوورین نیقاب
سانیەن بۆ ئال و ئەزواج و سیحاب
سالیسەن بۆ ئەنبیا و و مورسەلین
رابیعەن بۆ ئەولیا و و موئمینین
هەم ژ بۆ حوججاج و غوزاتان تەمام
هەم ژ بۆ ڤێ مەجلیسا ساحیب تەعام

هەم ژ بۆ هەر چار ئیمامێ جادەیی
هەم ژ بۆ ڤێ کاتبی ڤێ نوسخەیی
بۆ جەمیعی موسلیمین و سالیحە
بۆ فەقیری (باتەیی) ئەلفاتیحە

### لاسایی کردنەوەی باتەیی

ئەگەر شیعری باتەیی ببێتە سەرچاوەی ئیلهام بۆ شاعیرێکی تر و لاسایی بکاتەوە بەڵگەی داهێنانی بەرز و هونەری سەرکەوتووە.

شیعری لیریکی (غەزەل) بەشێوەییێکی گشتی هەندێ ئەدگاری تایبەتی هەیە دەبێتە هۆی درێژە پێدانی، واتە خستنە سەر و دانەپاڵ و زیادکردنی بەئارەزوو، ئەو ئەدگارانە بریتین لەوەی کە یەکێتیی دێڕە شیعر دەورێکی باڵای هەیە، واتە هەر دێڕە شیعرێک سەربەخۆیە و پێوەندییێکی بە دێڕەکانی پێش خۆی و پاش خۆیەوە نییە. بەم پێیە لە شیعری غەزەلدا بەگشتی بزووتنەوە و قارەمان و کات و شوێن نابینرێن، یا ئاشکرانین، لەبەر ئەوە کارێکی ئاسانە چەند غەزەلێک ئەگەر لەسەر یەک کێش و یەک قافیە بن تێکەڵ بەیەکتری بکرێن بەبێ ئەوەی پیاو هەست بکا کە هی چەند شاعیرێکە. بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەسمان ئەوەیە ئەم دیاردەیە واتە یەکێتی کێش و قافیەی دێڕە شیعر دەبێتە هۆی لاسایی کردنەوە، وەکو ئەوەی شاعیرێک شیعرێکی دیاریکراوی شاعیرێکی تر بچێتە دڵیەوە، ئیتر هەوڵ دەدا لاسایی شیعرەکە بکاتەوە لە کێش و قافیە و وشە و لێکسیکۆن و تەنانەت شێوە و ژمارەی دێڕی شیعرەکانیش. بەڵام ئەم شیعرە تازەیە داهێنانیشی تێدا دەبێ، بەوەی شاعیر لە مانا و وێنە شتی وا دەڵێ کە شاعیری یەکەم نەیوتووە، واتە ئەم شیعرە وا دێتە بەرچاو وەکو تەواوکەری شیعری یەکەم بێ نەوەکو دووبارەکردنەوە، یا لێکدانەوەی بێ، وەکو لە پێنج خشتەکیدا لێکدانەوە بە ئاشکرا دیارە.

بەم جۆرە غەزەلێکی پێنجینی باتەیی بۆتە هۆی داهێنانی غەزەلێکی پێنجینی دی لەلایەن شاعیرێکی تری کوردەوە. ئەمە پێنجینێکی بەرز و باڵایە لە داهێنانەکانی شاعیرێکە بەناوی «ماجین»ەوە. ئەم شاعیرە بێگومان لە دەوروبەری سەردەمی باتەیی ژیاوە و بەشاعیرێکی گەورەی ناسیوە و پێنجینە جوانەکەی باتەیی «سوبح و ئێڤارێ شەڤاتار شەمالاکێ یی تو» کارێکی گەورەی لێ کردووە، تا گەیشتۆتە ڕادەییێک لاسایی بکاتەوە و پێنجینێک بنووسێتەوە لە هەموو شتێکدا لەو بکا، بەڵام دووبارەکردنەوە نییە، لە پلەی هونەریدا لە تەک ئەودا دەوەستێ، لە هەندێ وردەکای هونەریدا لەویش بەرزترە، شاعیر نیگارێکی مۆزاییێکی ورد و ڕێکوپێکی دروست کردووە، شۆڕشێکی لە هونەری موسەممەتدا کردووە، لە باتی ئەوەی نیوە دێڕی شیعر بکا بەدوو ڕستە یا چوار ڕستەی یەک کێشی، وەستایەتی گەیشتۆتە پلەییێک، نیوە دێڕی شیعرێکی کردووە بە شەش ڕستەی یەک کێشی، نەخش و نیگارێکی بەرزی بەئاوازی وشە و ڕستە دروست کردووە، هارمۆنی شیعرەکە هەستی پیاو ڕادەکێشی کە لەگەڵ ئاواز بژی و بچێتە ناویەوە لە سەرەتای پێنجینەکەوە تا کۆتایی.



ئەم پێنجینە لە دەستنووسێکی کوردی دۆزراوەتەوە کە لەساڵی ١١٨١ھ/١٧٦٨م ڕوونووس کراوە.

ماجین لە پێنجینەکەیدا دەڵێ:

سۆرگولا غونچە دەهەن نازک نیهالا کێ یی تو
مەهوەشا دل پیرەهەن شوخ و شەپالا کێ یی تو
گول ڕوخا سیمەن زەقەن فیکر وخەیالا کێ یی تو
ئاهویا دەشتا خوتەن مشکین غەزالا کێ یی تو
نازکا سیما سەمەن قەنج و دەلالا کێ یی تو

ئەو چە دیمە ئەو چە روونە ئەو چەزولفە ئەو چە خال
ئەو چە گول باغی گولانە ئەو چە حوسنە بێ میسال
ئەو چە ئەبرۆنە چە قەوسن ئەو چە نوونن ڕەنگ هیلال
ئەو چە موژگانن چە تیرن ئەو چە ئەلماسن بقال
قاتیلی خون ڕێز و خوون خوەر پوور قتالا کێ یی تو

ئەو چە بادامن سیاهن ئەو چە چاڤن غەمزەریز
ئەو چە ڕەیحانن دشەنگن ئەو چە زولفن مشکەبیز
ئەو چە هیندوونە سیەه دل ئەو چە خالن فیتنەخیز
ئەو چە لیڤن ڕووحی پەروەر ئەو چە عوننابن عەزیز
لەب خەمۆشی بادەنۆشی لا ئوبالا کێ یی تو

ئەو چە بەژنە ئەو چە قامەت ئەو چە قەد دل روبا
ئەو چە ئەخبارن تەجان دە ئەو چە دوررن پڕ بەها
ئەو چە نارنج و ترنجن ئەو چە سێڤن سینەجا
ئەو چە مەهتابن بناگۆش ئەو چە سوبحە نوورفزا
ڕۆهینا شاما فیراقێ شەمع و مالا کێ یی تو

حوور و عینی غەم ڕەڤینی دل تشینی دل فریب
بێ قوسووری هەم چە حووری نووری تووری پڕ عەجیب
عیشوەسازی سەرفرازی دل نەوازی دل شەکیب
شەه لەوەندی لەب ژ قەندی چەشمی بەندی پڕ غەریب
سینە سۆژی دل فروژی مەه جەمالا کێ یی تو

ئەو چە عاجە ڕەنگ زوجاجە ئەو چە نوورین گەردەنە

ئەو چە دورجا لەعلی کونە جان ڕەوان تێ مەسکەنە
ئەو چە دەستین ڕەنگ خەنایی ڕشتنا خوونا منە
شوبهێ تە مەحبووب و خووب ما قەد د دونیایێ هەنە
جەبهە ڕوژی قلبی سۆژی قەد شەمالا کێ یی تو
ئەو چە دل بەندن موسەلسەل ئەو چە زنجیرن کەزی
ئەو چە مەهبووشن چە ئالا کەسک و سۆر و قرمزی
نەترک و ئیلان وشتری تیک لە دێمی تو ووزی
دێ بەمەش جارەک تو سەروا من وەرە سەیرا رەزی
دا ب قوربانی تە بت (ماجین) غەزالا کێ یی تو

***

مەلای باتەیی لاسایی ئەو سیستێمە شیعرە کلاسیکییەی کردەوە کە عەلیی هەریری و مەلای جزیری بەردی بناغەیان دانابوو، بە لای ئەوەوە ئەدەبی بەرز ئەو شیعرەیە کە شاعیرانی فارس و تورکی عوسمانی لە شیعری عەرەبییەوە دروستیان کردبوو و شتێکی نوێیان هێنابووە ناوەوە. مەلای باتەیی لەسەر ئەو باوەڕە بوو میللەتی کورد ئەوکاتە مافی نەتەوەیی خۆی لە ناوەوە دەبێ کە ئەدەبێکی بەرزی وەکو ئەدەبی هاوسێکانی هەبێ. هەستی نەتەوەیی لەو ڕۆژگارەدا بۆتە هۆی بەکوردی کردنی ڕۆشنبیری و خوێندەواری، بە لای ئەوەوە ئەمە پێچەوانەی ئەوە نەبووە زمانی ڕەسمی ئاییینی ئیسلام عەرەبی بێ.

## بەشی پازدەم

# پرتەو

**١٧٥٦ - ١٨٢٥**

### ژیانی شاعیر:

ئەم شاعیرەمان تەخەللوسی شیعری «پرتەو» و بە «پرتەوی هەکاری» و «شا پرتەوی هەکاری» لە گێتی ئەدەبی کوردیدا ناسراوە. ناوی مستەفا بەگ کوڕی عەبدوللا بەگ کوڕی محەمەد کوڕی ئێزدین شێرە، بە بنەماڵە لە میرانی ناوچەی هەکارییە. لە کتێبی شەرەفنامەدا ناوی بنەماڵە و باپیرانی پرتەو هاتووە. لە ساڵی ١٧٥٦ لە ناوچەی هەکاری لەدایک بووە. زانیاری تەواو لە ژیانی بۆمان نەماوەتەوە.

پرتەو وەکو کوڕی بنەماڵەیێکی دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتوو و بەکار توانیویەتی خوێندنی ئەو سەردەمەی حوجرەی مزگەوت تەواو بکا، ئیتر یا مامۆستای تایبەتی بۆ گیراوە یا لە حوجرە لەلای بەتواناترین مەلا و مامۆستایانی ئەو ڕۆژگارە خوێندوویەتی، وەکو لەبەرهەمی شیعری پرتەو دەردەکەوێ کەسێکی بەتوانا بووە لە زانستییەکانی زمانی عەرەبی و ئایینی ئیسلام و ڕۆشنبیرێکی بەدیمەن بووە لە زمانی کوردی و ژیانی کۆمەلایەتی کوردەواریدا.

پرتەوی کوڕی گەورە ماڵێک هەوڵی نەداوە وەک خوێندەوارێکی حوجرە، یا مەلاییێک بناسرێ، لەگەڵ ئەوەشدا پیاو بە هیچ جۆرێ بیری بۆ ئەوە ناڕوا ئەم شاعیرە لە نێوەندی خوێندەواری ئەو سەردەمە دووربووبێ، بەپێچەوانەوە دروستبوونی وەک شاعیرێک لە ئەنجامی ئەو خوێندنە بووە، هەروەها ناوچەی هەکاری وەک نێوەندێکی ڕۆشنبیری دەوڵەمەند کاری گەورەی بووە بۆ خەملاندنی چێژ و خەیاڵی پرتەو، چونکە ناوچەی هەکاری جێی لە دایکبوون و ژیانی هەندێ لە زانا و شاعیرە هەڵکەوتووەکانی وەکو عەلیی تەرەماخی و عەلیی هەریری و فەقێی تەیران و باتەیی و خانی و گەلێکی دیکە بووە، بۆیە ناوچەی هەکاری بەنێوەندێکی ڕۆشنبیری گەورەی خوێندەواری لە کوردستانی باکووردا ناوبانگی دەرکردووە.

### شیعری پرتەو

ئەو برە شیعرەی پرتەوی شاعیری ئەم ماوەیەمان لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم دۆزراوەتەوە، دەسنووسەکە لە ساڵی (١٢٢١ھ/١٨٠٦م) ڕوونووس کراوە. مامۆستامان تۆفیق وەهبی دەوری دیاری هەبوو لە ناساندنی ئەم شاعیرە بەخەڵکی کورد، وابوو لەسەر لاپەڕەکانی کۆواری دەنگی گێتیی تازە لە بەغدا (١٩٤٣ - ١٩٤٧) چەند غەزەل و قەسیدەییێکی شاعیری بلاوکردەوە.

دیوانی پرتەوی هەکاری لەوە دەچێ هەموو غەزەل و قەسیدەکانی شاعیری گرتبێتە خۆی. چونکە ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە شیعرەکان دەبینین شیعری لەسەر دەنگی هەموو تیپەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی هەیە، واتە قافیەی تیپەکان، تەنیا لە ئەلفوبێی عەرەبیدا دوو دەنگی (ذ، ظ)ی نییە، لە کوردیشدا تەنیا دەنگی (ژ)ی نییە. لێرەدا ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ کە دیوانی پرتەو یەکێکە لە دیوانە کلاسیکییە کەمەکانی ئەدەبی کوردی کە قافیەی غەزەل و قەسیدەکانی لە زۆربەی هەرەزۆری دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی پێکهاتوون.

هەروەکو چۆن دیوانی پرتەو لە ڕووی دەنگەکانی قافیەوە زۆر دەوڵەمەندە، هەروەها دەتوانین بڵێین لە ڕووی کێشی عەرووزیشەوە بەشێکی زۆری بەحرەکانی عەرووزی بەکارهێناوە.

لە ئەدەبی کوردیدا کەم شاعیری کورد هەیە نۆ بەحری عەرووزی لە شیعردا بەکارهێنابێ. شاعیری ئەم ماوەیەمان لە هەموو کێشەکان زیاتر ڕەمەل و هەزەجی بەکارهێناوە، لە دوای ئەمانە کۆمەڵێک غەزەلی هەیە لەسەر کێشی ڕەجەز، چەند غەزەلێکیش لەسەر کێشی موزاریع. لە کێشی بەسیت سێ غەزەلی هەیە و لە مەقسووریش دوان. هەرچی کێشەکانی موتەقاریب و مونسەریح و خەفیفیشن لەهەر یەکەیان غەزەلێکی هەیە. وەکو بۆمان دەردەکەوێ بەدەگمەن شاعیرانی کوردی کلاسیکی ئەم کێشانەی دوایی عەرووزیان لە شیعرەکانیاندا بەکارهێناوە.

شیعری پرتەو وەکو هەموو شاعیرە کلاسیکییەکانی دیکەی ئەدەبی کوردی لە غەزەل و قەسیدە پێکهاتووە. جگە لەم دوو بابەتە لە ڕووی ڕوخسارەوە کۆمەڵێک چوارین و پێنجین و موستەزادی هەیە. لە ڕووی ناوەڕۆکیشەوە موناجات و نەعتی پێغەمبەر و دڵداری و وەسفی خۆشەویست و سروشت هەموو لاییێکی شیعرەکانیان داگیرکردووە.

شاعیر بایەخێکی زۆری بەشیعری ئایینی (موناجات و نعت) داوە، ئەگەر شاعیرانی کورد بۆ پیرۆزبایی سەرەتای دیوانەکانیان بەیەک دوو قەسیدەی مەدحی خودا و پێغەمبەر ڕازاندبێتەوە پرتەو نزیکەی سێیەکی دیوانی بریتییە لە قەسیدە و پێنجین و چوارین، ئەمانە دەچنە ناو نموونەی شیعری هەرە جوانی ئایینی کە بەزمانی کوردی بێژرابێ.

ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەین چنینی شیعری جوان لەناو گوڵزاری دیوانی شاعیری ڕەند پرتەوی هەکاری کارێکی ئاسان نییە، چونکە غەزەل و قەسیدەکانی هەموویان جوانن، ئەگەر کارەکە بەڕاستی بێ پێویستە هەموو دیوانەکە بخەینە بەرچاوی خوێنەری ئەم کتێبە، بەلام ئەمە کارێکی قورسە، بۆیە نموونەکان دەکەونە ژێر چێژی ئیستێتیکی خاوەنی ئەم کتێبە و بەم جۆرە پیشانیان دەدا.

### گوڵبژێری دیوانی شاعیر

هەر لاپەڕەییێکی دیوانی پرتەو بکەینەوە بەرەو ڕووی پارچە شیعرێکی دڵداری دەبینەوە. خۆشەویستی بەرامبەر بەیار و تێکەڵکردنی بەسروشت. بێگومان بەهار ڕەمزی گەشانەوەی ژیان و هەرەتی لاوێتی دڵدارانە، لەبەر ئەوەیە بەبەڵگەی ژیانەوەی پاش مردن دادەنرێ.

(١)

خوەش بهارە وی ژ نۆشینا گولێ و گولزارێ باغ
لێ دلێ من شبتی لالە پڕ ز خوون و داغ داغ
مایە مەحرووم ئەڤ دەماغا من ز بێهنا چیچەکان
زەندە خەر تەبعان دا ب وێ گول موعەتتەر کر دماغ
نینە ساحیب مەنزلا هەمسایە تەلبا نوور شەمع
لەو ژ نار هیڤی مە دا ئیشەڤ من بیە نوور و چراغ
گەر چ مەحبووبان ڕوش گرتن ژ وێ سروا خرام
لێ شاکو ڤینە تەشبیهی فەلەنگینا تلاغ
چەرخی دەوران بێ وقووفە ناکتن یەک مووی فەرق
لەحنێ جۆشن نەوابێ بلبل ڕاڤا ڕا زاغ
موستەننەدان ئەهلێ دل ئەبلەهـ مودامێ کامیاب
دەردەمەندان ئەهلێ دانش ئەحمەقن ساحیب ئەیاغ
دل چرا (پرتەو) تە دا تیفلەک نەدانەک سەنگ دل
نی ل جوانان پرسشە وی نی ل بیرانە سوراغ

بەهار بەلای شاعیرەوە هەنگامی خۆشی و ئاسوودەییبیە بۆ هەموو کەسێک، تەنیا بۆ خۆی نەبێ. گوڵی لالە مایەی جوانی بۆ هەموو لایێک، بەتایبەتی کە وا دێتە بەرچاوی دڵداران وەکو لە کوڵمی دلبەر بکا، بەڵام بۆ شاعیر لالە لە دڵی پڕ خوێنی خۆی دەکا. پرتەویش وەکو شاعیرانی دیکە گازاندە لە خۆی دەکا، بەوەی دڵی خۆی داوەتە کیژێکی مندالکاری نەفام، نرخی دڵداری نازانێ و دڵڕەقانە ئازاری شاعیر دەدا.

لە حاڵەتی ئازاری دڵداری کە بەخۆشی دەگەڕێتەوە بۆ شاعیر ئاوڕ لە گوڵی تەبیعەت دەداتەوە و لەگەڵ هەندێ ئەندامی لەشی دلبەر بەراوردیان دەکا.

ژ بادی نەکهەتا سوبحێ چو بلبل جانێ مەخوەش بوو
ڕحان و سونبول و نەسرین ل ئەترافێ گولا گەش بوو
حیجاب و پەردەیا زولفان ب سەر عاریز وەکی شەڤ هات
نەسیحەت ڤێ کەت و شەمسا مونەووەر دەرکەت و گەش بوو
هەچی شۆر و شەڕ و فیتنە دنیایێ کو بوون زاهیر
ب ناسێ وان هەمی زولفان سیاهـ وا سۆر و ڕەش بوو
کەسێ چوو سوحبەتا ڕەندان نەما قەت و نەبوو دل خوون



ژیا مەخموور و سەرمەست و مودامێ یو موشەووەش بوو
وەکی ئەسکەندەری دائیم مە عەزما عەینێ حەیوان کر
وەلی سەرچەشمەیا حەیوان نەسیبێ هیندووەک ڕەش بوو
ب ئیحرام وی تەن بەستن ت سەحرا دل لە ما مەقسەد
ژ کەعبا دل تەوافا خال تەشبیهی بەرێ ڕەش بوو
ئەگەر (پرتەو) نەشاعیر بوو وەلێ چاڤنێرێ ڤێ بەیتێ
وەکی مەستان غەزەل چێ کر لە ما بەیتەک موشەووەش بوو.

شنەبای بۆن خۆشی بەیانی وەکو بلبل خۆشی گەیاندە ئێمە، هەروەها ئەو ڕەیحانە و سونبول و نەسرینە، ئەو بسک و کەزی و قژەی دەوری ڕوخساری جوانی وەک گوڵی گەشی داوە، سەرپۆشێک بوو تاریکی خستبووە سەر ڕوخساری دلبەر، هەر ئەو شنەبایە بوو قژی لەسەر ڕوومەتی لادا و خۆری ڕووناک هەڵات.

پرتەو دەڵێ ئەسکەندەری مەکدۆنی لە سەرچاوەی کانی ئاوی ژیان دەگەڕا، ئەو دەستی کەوتبێ یا نەکەوتبێ گرنگ نییە، کەچی سەرچاوەی ئاوی ژیان بەنەسیبی دلبەرێکی خاوەن خاڵێکی ڕەش بوو، وەکو ئاشکرایە لێرەدا مەبەس لە سەرچاوەی ئاوی ژیان دەمی دلبەرە.

(٢)

ئەی دلێ سەرمەستێ من مەستانە ڕەقس
بوزما جانانە وەکی پەیمانە ڕەقس
گولفشانەکە مەجلیس جارەک ژ من
جامێ ت کەف میسلێ گولان خەندانە ڕەقس
لەشکرێ ئیمانێ بهل بیروون دەر
ت دەروونێ خانەیا جانانە ڕەقس
گەر تە دوڤا خەلوەتا دل بێتە سەر
دێ وەکی جۆشا مەیا جۆشانە ڕەقس
بەس نییە ئەڤ قالوقیل و سووڕەتی
خۆش ب وەجهێ مەعنەوی ڕەندانە ڕەقس
گەهـ ت گەل دێوانەگان یا هایوهووی
گەهـ ت گەل فەرزانەگان فەرزانە ڕەقس
(پرتەو)ی ئاڤا هەیا دل بو خراب
کەف ب کەف ئەز شادیا وێرانە ڕەقس

شاعیر لەم پارچە شیعرەدا وشەی ڕەقس (رقص)ی کردووە بەپاش قافیە، لێرەدا پێش هەموو شتێک پێویستە بیرمان بۆ ئەوە بچێ پرتەو زیاتر مەبەسی ئەوە بووە قافیەی دەنگی (صاد)ی عەرەبی هەبێ، بۆ ئەمە ئەم شیعرە و شیعرێکی دیکەی هۆنیوەتەوە، واتە لە دیوانیدا دوو شیعری دەنگی (ص)ی عەرەبی هەیە وەک پاش قافیە. دووبارە و سێبارەکردنەوەی وشەی «ڕەقس» خۆی لە خۆیدا دەبێتە وەسفی ئەو بزووتنەوەی لەشەی کە ئێمە «سەما» و «شایی» پێ دەڵێین. وەکو لە ناوەرۆکی شیعرەکە دەردەکەوێ شاعیر مەبەسی سەمای دەروێش و سۆفییان و مێرمنداڵ و کیژۆڵە عازەبەکانە. تەهلیلە و هایوهووی دەروێشان دەستووری خۆی هەیە، هەروەها شایی و حێولانەی هەرزە و کیژۆڵانیش دەستووری خۆی هەیە.

(٣)

هێدی بهـژین بادی سەبا توورڕەیی دلدار
هەر تایەکی پێ بەستنە سەد زەخمی و بیمار
ساقی دەمەکی من بکە بێهـۆش ژ بادە
ڕاحەت ببتن بەلکی دلێ ژارێ بریندار
قوربانی تە بم ڕەحم و مورووەت کو تە نینە
ژ زولم و ستەمێ بیر بکە ڤی جانێ ل م یەکجار
جانێ من و عیشقا تە نە ئێرۆکنە دەمساز
بەلکی ژ ئەزەل ئێکن و یەک نوورن و یەک نار
دوژمن لە مە دلخوەش نەکە ئەی سەروەری خووبان
دەردێ وی ئەوە دا بکتن عاشق قەرار
یووسف کەرەم و نینە بها لێک وەکی پیر
نەقدا دل و جان (پرتەو)ی ئینانديە بازاڕ

شاعیر مەبەسی سەرەکی لەم پارچە غەزەلەدا تەنیا هەڵکردنی شنەبای شەماڵ نییە لە پێناوی ئەوەی ئێش و ئازاری دڵداری کەم بکاتەوە بەڵکو لە ساقی دەپاڕێتەوە بەمەی سەرخۆشی بکا، کە سەرخۆش بوو بێهـۆش و دەبێ و هەست بە برین و نەخۆشی ناکا. ڕوو دەکاتە یار و پێی دەڵێ: دڵی من و دڵداری تۆ ڕووداوی ئەمڕۆ نییە بەڵکو دیاردەییێکی ئەزەلییە و یەکێکیان ڕووناکی و ئەویتریان ئاگرە. بەختیاری بۆ تۆ و بەدبەختی بۆ من.

(٤)

چییە دەردێ تە بێژە ئەی دل ئەی دل
ژ چاڤان خوون بڕێژە ئەی دل دل
ژ بۆ تەسکینا ئێش و حیرەقەتا دل



هەمە دەردان بڕێژە ئەی دل ئەی دل
ژ من ئەحوالێ کۆڤانان مەپرسە
کو حالاتەک درێژە ئەی دل ئەی دل
هەچی داغ و برینا من ل سینە
ژ وێ بەژنا درێژە ئەی دل ئەی دل
نە ئیرۆکە تە ترکا ئاشنایی
کو قەتعا تە ژ مێرە ئەی دل ئەی دل
مە زانی عیشقا مەحبووبان بەلایە
هەچی دی سووس و گێژە ئەی دل ئەی دل
وەکو تە گووه نەدا پەندێت ت (پرتەو)
ت نارێ غەم بڕێژە ئەی دل ئەی دل

ئەم شیعرە موناجاتێکە پرتەو لەگەڵ «دڵ»دا دەیکا. «ئەی دل»ی دووبارە کردۆتەوە و وەک پاش قافیە خستوویەتییە ڕوو، ئەم دووبارە کردنەوەیە چەشنە مۆسیقاییێکی ڕەوانی داوەتە ئاوازی شیعرەکە، قافیەی شیعرەکە لە بنجدا دەنگی «ژ»یە، ئەگەر شاعیر خەریکی ئێش و ئازار و دەردی دڵ نەبوایە، بۆمان دەکرا بڵێین ئەم شیعرە وەک ئاوازێک بۆ سەما و شایی و هەڵپەڕکێ دەشێ، بەڵام ناوەرۆکەکەی زیاتر ڕەنگە لەگەڵ سەمای بالێ بگونجێ. بێگومان لێرەدا بوون و نەبوونی بالێ و ئۆپیرا لەناو کۆمەڵێ ئێمەدا، ئەوە ناگەیەنێ نەتوانین شیعرێکی کۆنی کلاسیکی کوردی، یا شیعرێکی نوێی هاوچەرخ لەگەڵ ئەم جۆرە هونەرە ئەوروپاییانە بگونجێنین.

(٥)

جەلاوو سەیقەلا قەلبان جەمالە
سەفا بەخشێ دلان بەژنا شەپالە
حەرامە ئەڤ ب بێ بەزما حەبیبان
ت گەل وان بادەیا سافی حەلالە
چ لێکم مەسجید و میحراب و مینبەر
ژ بۆ تەقبیلە ئەبرۆیێن هیلالە
سەدایێ عەندەلیبان تار و ئازار
نەوایێ بلبلان هەر وەردێ ئالە
نمازی عاشقان ناز و نیازە

نیازا سادقان وەجهێ جەلالە
نەڤێ من چەشمەیا ئاڤا حەیاتێ
حەیاتا من لەبێ لەعلا زەلالە
ت وەسلێ (پرتەو)ی سەد سالە ئاتەک
ت هیجرێدا دەمەک مانەندی سالە

لە خوێندنەوەی ئەم پارچە شیعرە لە ڕووی جوانکارییەوە ڕاستییێکمان بۆ دەردەکەوێ، شاعیر کۆمەڵێک تەعبیری ڕەوانبێژی ڕۆژهەڵاتی بەکارهێناوە، وا دەکەونە بەرگوێمان لەمەوپێش گوێمان ئاشنایەتی لەگەڵیاندا هەبێ، وەکو ئەوەی دوو برۆی مانگی یەکشەوی پەرستگایە لەباتی مزگەوت، دوو لێوی دلبەر سەروچاوەی ئاوی ژیانە و هی دیکە، بەڵام بەرزی شیعرەکە لەوە دەردەکەوێ پرتەو وەستایانە ئەو نرخە ئیستێتکیانەی وەرگرتووە و بەکوردی داێڕشتوونەتەوە، بەم پێیە ئەم جۆرە بەرهەمانە دەچنە ناو کاری ئەدەبی داهێنراوی بەرزەوە.

(٦)

پرتەو کۆمەڵێک پارچە شیعر بەکاردێنێ بۆ وەسفی دلبەر، لەو شیعرانەدا هەردوو لایەنی خۆشەویستی ڕەچاو کردووە، لایەنە جوانەکانی ئەندامانی لەش و لاری کە بەچاو هەستیان پێدەکرێ، هەروەها لایەنە جوانەکانی خووڕەوشتی نادیاری مەعنەوی کە بەچێژ و خەیاڵ و ئینفیعالی ناوەوەی دەروونی هەستیان پێدەکرێ، بەمە دلبەر دەبێتە بەڵگەی کامڵی و بێ کەموکوڕی.

لە پارچە شیعرێکدا دەڵێ:

م دی یارەک نیگارەک جوانەک
گەلەک فەهمیدە زانا، نوکتەدانەک
ب عاریز ئافتابا بورجێ خوونی
خەبەردان شەهد ریز و خوەش زبانەک
ب داد و لوتف و ئیحسان و مورووەت
دەمەک دنیا بکە یەک لەحگە کارەک
ب شان و سەتوەت و تەمکین و عیززەت
شەهەک ساحیب غوروور و عیزز و شانەک
نەبوون میسلێ تە ئەسلا ت عالەم
سزاوارەک نە سوڵتانەک نە خانەک
کو بۆ (پرتەو) دلا ڕامانە دیتن



چ بێژم نوورێ چەشمەک قووتێ جانەک

لەم شیعرەدا شاعیر لە خاسیەتە تایبەتییەکانی خووڕەوشتی دلبەر دەدوێ، دلبەر قسەزان و نوکتەچی ئەوتۆیە کە قسە لە دەمی دێتە دەرەوە وەکو ئەوەیە هەنگوین بپژێنێ. خۆشەویست نەرم و نیانە، چاوتێرە، ئازا و بەتوانایە، وەکو شاییێکی سەر بڵندە، بەڵکو لە شا و سوڵتانانیش ڕەتی کردووە.

ئەگەر لەم شیعرەیدا شاعیر دلبەری وەکو قارەمانێکی بەزەبر و زەنگ پیشان دابێ، وەک سیفەتێکی مەعنەوی، لە شیعرێکی دیکەیدا دلبەر لە ناسکی و نەرم و نیانیدا وەک پەڕەی گوڵ دەیخاتە ڕوو.

لەم لایەنەوە دەڵێ:

م دل دا دلبەرەک سەنگین و مەهوەش
لەتیفەک نازکەک مەستەک سەبووگەش
دڕ و گولبەرگ و سورخ و تازە و و تەڕ
ب سەر گول خال مشکینەک عەجەب خوەش
ژ بۆ تەعویزێ حیفزا چاڤ خرابان
ت عیشقێ دان ب دل دانی سەر ئاتەش
وەرە ئەی باد من سەلک دڤێتن
ژ من بۆ دلبەرێ میسلی تە بێ غەش
سەراسەر شەرحا ئەحوالێ فیراقێ
ژ خوونێ نامە بنڤیسم مونەققەش
هەمی وەزن و موقەففا و موسەججەع
هەمی تەرجیع و تەرکیب و موشەووەش
ژ (پرتەو)دا ببووسە ئاستانێ
بەدی عەرزی ڤەکرڤە چابەک و خوەش

لێرەدا دلبەر قورسە، مەستی هەوای ڕۆمانتیکییانەی شیعری کلاسیکی کوردییە، سوور و تەڕ و تازەیە و لە بەرگی گوڵ دروست کراوە، ئەو سیفەتە ڕەسەنانە بوونەتە هۆی داهێنانی شیعری بەرزی پرتەو. شاعیر شیعر دەهۆنێتەوە هەمووی کێشی جوان و قافیەی ڕێک و ڕستەی سەجعدارە، ئەم هەموو وێنە و مانایانە خراونەتە ناو شیعری تەرجیع بەند و تەرکیب بەند و گەلێ جۆری ڕەوانبێژی تیایاندا بەکارهێناوە.

شاعیر لەم وەسفانەوە، غەزەلێکی دیکە تەرخان دەکا وەک گفتوگۆییێک، یا موناجاتێک لەگەڵ دلبەردا، لەم شیعرەدا ئامۆژگاری خۆشەویست دەکا ئاگاداری ئەوە بێ جوانییەکەی سروشتی و خۆڕسکە و پێویست بەهیچ جۆرە شانە و ئاوێنەییێک ناکا.

لە غەزەلەکەدا دەڵێ:

مــــەکـــــە ئاییینه و عـــــاریز بەرابەر
مــەده شــانه ســەرێ زولفــا مــوعــەنبــەر
تەبەســـسوم کـە ب ناز و غـەمـزه چالاک
بکه بێ قـــەدر لـەعل و دورِ و گـــەوهەر
بده بەر با مـوسـەلسـەلهـایێ مـشکین
دەمــاغــا جــان بێن دالی مــوعــەتتــەر
ژ مـــێـــژه ناڤێ حـــوسنێ نینه پەیدا
ڤـــەده پەردێ ژ بەر حـــوسنا مـــونەووەر
کـــو دا عـــاشق ب ســەد ئەزمــان گـــویا
بخـوونن خـوتبـەیان عـیشـقـا ل مـینبـەر
ئو عـــەنبـــەر دانیـــا خـــالا ل ڕوویان
عــەبیــره یا نەدانی نێـڤـا مــەجـمــەر
نەشـێتن (پرتەو)ی وەسـفـا جـەمـالێ
بکت پایان ب ســەد تۆمــار و دەفـتــەر

شاعیر لەم وەسفەدا بەجوانی سروشتی دلبەردا هەڵدەڵێ، قژی جوانی پێویست بەشانە ناکا، بای شەماڵ شانەی دەکا، زیاتر جوانییەکەی دەخاتەڕوو، لێرەدا داهێنانی شاعیر لەوەدا خۆی دەنوێنێ کە دەڵێ: پرتەو ناتوانی وەسفی جوانی دلبەر بگەیەنێتە ئەنجام، تا ئەگەر سەدان دەفتەر و تۆماریش تەرخان بکا بۆ ئەو وەسفە.

(٧)

پرتەو ئەگەر بڕیاری دابێ لە هونەری موستەزادیش بەرهەمی هەبێ بۆ ئەوەی بووە دیوانی شیعری هەموو بابەتە تازەکانی شیعر بگرێتە خۆی، ئەوانەی لە دوای نزیکبوونەوەی ئەدەبی کوردی لە ئەدەبی نەتەوەکانی دیکە دروست بوون. بێگومان موستەزاد یەکێکە لە هونەرە تازە داهێنراوەکان. لە موستەزادەکەیدا شاعیر دەڵێ:

ئیــــرۆکـــە م تالیع ســـەحـــەرێ دلبـــەری ســـەلما
مەشیا ب خرامان
مـــەســـتـــانە وەش، کـــەچ کـــولەهـ و قـــامـــەتی ڕەعنا
شەنگا شەبی ڕیحان

***



ئەڤ شـیـــوەوو ئەڤ عـیـــشـــوەوو ئەڤ ناز و نەزاکـــەت
ئەسلەن م نەدی بوون
یـارەب ژ هـەمی دەرد و بـەلاّ و ئـافــــــەتی دنیـــــــا
حافز تو ب یەزدان

***

ســەیران کــره باغ و چەمـــەن و گــولشــەن و گــولزار
یاری ت سەحەرگەهـ
گــەر جــەننەت و فــیــردەوس و جــینان واری ســەحــرا
وەک حۆری یی ڕیزوان
دا زولم و ســتــەم جــەور و جــەفــا وان نەبە عــاجــز
(پرتەو) کو ژ مێژه
بـەدخـــــوونه ترش ڕوونه جــــەفـــاچوونه ســــەراپا
نەهـ عەهدە نە پەیمان

وەک لەم نموونەیەدا دەردەکەوێ لە ڕووی ناوەرۆکەوە موستەزاد بەگشتی لە دڵداری و وەسف دەدوێ، بەڵام لە ڕووی ڕوخسارەوە شاعیر یاری بەکێش و قافیە دەکا. دێڕە درێژەکان لەسەر یەک کێش دەبن، دێڕە کورتەکانیش لەسەر کێشێکی تر، هەروەها قافیەی دێڕە کورتەکانیش دەگۆڕێ. خوێنەر کە موستەزاد دەخوێنێتەوە وا دەکەوێتە بەر گوێی وەکو ئەوەی دێڕە درێژەکە پرسیار بێ و دێڕە کورتەکە وەرامی پرسیارەکەبێ، جا ئەگەر هەندێ جار بەڕاستی وا بکەوێتەوە، بەگشتی موستەزاد بۆ مەبەسی دیالۆگ دانانرێ. هەرچۆنێ بێ موستەزاد دیاردەیێکی هونەرییە ئاواز دەورێکی گرنگی هەیە بۆ نزیک کردنەوەی لە دڵ و دەروونی ئادەمزاد.

(٨)

پرتەو لە پارچەیێکی شیعری سێ دێڕیدا نازناوی خۆی «پرتەو»ی کردووە بەپاش قافیە، لێرەدا جۆرە زانین و شارەزاییێکی نواندووە و قسەکانی لە چێژ و خەیاڵی خوێنەر نزیک کردۆتەوە.

لە شیعرەکەیدا دەڵێ:

عـەجـەب ئاشـفـتـە وو حـەیرانە پرتەو
مـــیـــســـــالی بلبلێ باغـــانە پرتەو
ل شـەمـعـا عـاریزان حـەتتـا سـەحـەرگـەهـ
وەکـی پـەروانـە بـێ تـابـانـە پـرتـەو

نزانم ئەز تەلیسما سحری عیشقێ
وەکی مەجنوون بێ سامانە پرتەو

نزیک کردنەوەی خوێنەر لە خۆی زیاتر لەبەر ئەوەیە چونکە نازناوی خۆی لەم شیعرەدا کردووە بەقافیە، ئیتر لەم سێ دێڕە شیعرەدا چوار جار ناوی شاعیر هاتووە. جگە لەمە بەهۆی ئەوەی چەند جارێک ناوی شاعیر دووبارە کراوەتەوە دەبێ قسەکانی پرتەو لە بابەت خۆیەوە بێ، واتە وەسفی خۆی بکا. ڕاستییەکەش ئەوەیە شاعیر ئەم پارچە شیعرەی بۆ وەسفی هەست نەستی و ناوەوە و سایکۆلۆجییەتی دەروونی خۆی تەرخان کردووە لە ماوەییێکی دیارکراوی ژیانیدا.

ئەگەر لە لاییێکی دیکەی ڕەوانبێژییەوە بنوارینە ئەم پارچە شیعرە لە ڕووی وشەی «پرتەو»ەوە، دەتوانین ئەوە بلێین بەمانای «ڕووناکی» و «تیشک» و «ئیشراقی سۆفیزم»یش دەکرێ لێک بدرێتەوە.

(٩)

ئەگەر چوارینەکانی پرتەو لەگەڵ قەوارەی دیوانی شیعری بەراورد بکەین دەبینین بابەتی چوارینی زۆرە. لە ڕووی ناوەرۆکەوە چوارینەکان لە بۆچوونێکی کورت، یا وێنەییێکی شیعری بچووک پێکهاتوون، هەندێ جار وەکو وەرامی پرسیارێک دەکەونە بەرچاو، یا لێکدانەوەی نوکتەییێک، هەندێ جاریش بیری فەیلەسووف و داناییێک ورد دەکەنەوە.

لێرەدا بۆ نموونە هەندێ لە چوارینەکانی پرتەو بەرەو ڕووی خوێنەر دەکەینەوە.

١- لە چوارینێکیدا شاعیر دەڵێ:

شەڤ نینە کو من نالە نەبوون ژ فەلەک
هێستر ژ فورات و نیل بۆش بوونە گەلەک
دلبەر ب مڕا وەعدە خەبەردا نەکتن
ترسم ب مڕا وەفا تکت چەرخێ فەلەک

شاعیر لەم شیعرە و لە گەلێ چوارینەکانی دیکەی لە گێتیی شیعرییەتی خەیام دوور نەکەوتۆتەوە، هەندێ جار شیلەی ئەو شیعرانە بووە بەهەوێنی کوردانەی چوارینەکانی شاعیر، یا ڕاستتر بەکوردیکردنی هەست و نەستی دەرەوەی کۆمەڵی کوردەواری، بێگومان ئەمە دەبێتە هۆی دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی نەتەوە.

٢- لە چوارینێکی دیکەشدا شاعیر دەڵێ:

ئاگرێ عیشقێ د سۆژیت جانێ عاشق میسلێ نار
ئاگرەک پڕ جۆش و پڕ تاب و حەرارەت بێ قەرار
عاشق و مەعشووقی یەک قەلب و زبان و یەک دلن
دائیما هەر وەقتەکی ناسەبرن سەبرێ سەبوورێ تابدار



لەم چوارینەدا شاعیر لە گێتیی دڵداریدا سێ ئیستگە دەستنیشان دەکا، یەکەمیان ئاگری عەشق، دووەمیان عاشق و مەعشووق لەناو یەکتریدا دەتوێنەوە و دەبن بەیەک، سێیەمیان سەبریان نییە. بێگومان ئەمەی وەک زاراوەییێک لە زاراوەکانی سۆفیزم وەرگرتووە.

٣- لەم چوارینەدا شاعیر دەڵێ:

ئەسلەن دلێ من ژ غەمێ قەت ئازاد نەبوو
جارەک ژ ویسال یا ژ دل شاد نەبوو
تەشبیهی سەرێ زولفا تە وەڵڵاهی دلەک
غەیری دلێ من چو دل وە بەرباد نەبوو

شاعیر دەڵێ غەم هەمیشە نیشتەجێی لە دڵی ئەودا دۆزیوەتەوە، کەچی قەت بەبینینی شاد نەبووە، دڵی بەجۆرێک شێواوە وەک شێوانی زولفی دلبەرە، ئەم وێنانە ئاساین لە شیعری کلاسیکی کوردیدا.

٤- لەم چوارینەشدا شاعیر دەڵێ:

چرا جارەک تو گوهـ نادەی فەقیران
ب ڕەسما شاه و سولتان و وەزیران
دوعایی بێ نەوایان چیش زۆرن
ژ بۆ دەفعا عەدووێ مولکێ میران

لەم چوارینەدا پرتەو ڕوو دەکاتە خۆشەویستەکەی بەناوی ئەوەی کەسێکی هەژارە، بەڵام دلبەر دەوڵەمەندە لە مەقامی سوڵتان و شاهانە، پێی دەڵێ: جارێکیش گوێت شل کە بۆ پاڕانەوەی هەژاران چونکە قازانج سوودی هەیە بۆ دوورخستنەوەی پیلانی دوژمنان لە ئێوە.

٥- لە چوارینێکی دیکەدا شاعیر دەڵێ:

حینا کو هەبت ژ شاهێ عیشقێ تە تەلەب
داخواز بکە وەلێ ب عینوان و ئەدەب
گەردی ب کتن قەبوول ساحیب کەرەمە
گەر ڕەد بگرت نهن بێ سووچ و سەبەب

دەتوانین بڵێین ئەم وتەیەی شاعیر پەندێکە یا وتەییێکی دانایانەیە لە قالبی ئەم چوارینەدا داڕێژراوە، تێیدا شاعیر دەڵێ: ئەگەر داواییێکت لە شای عەشق و دڵداری هەبوو، بە ئەدەب لە مەقامیدا قسە بکە، ئەگەر بۆی کردی دیارە خاوەن کەرەمە، ئەگەر نەیکرد بێگومان هۆییێکی بەجێ هەیە، واتە لە هەردوو باردا ئەو ڕاستە و لەسەر هەقە.

٦- لەم چوارینەشدا شاعیر دەڵێ:

ئیرۆ کە م دی دلبەرەکا بسک ئالۆز

تاریکێ شـــەڤــا مـــەکـــر وەکی نیـــمـــە رۆژ
شـۆخـەک سـتـەمـەک عـەربەدەچوو تازە گـەلەک
چاڤ مـەست و سـیـەھ تیـر نیگەھ سـینە دۆژ

پرتەو لەم چوارینەدا ڕەوانبێژی کلاسیکی لە شیعری کۆنی کوردیدا بەرجەستە دەکا، قژ و بسکی شێواوی دلبەر نموونەی تاریکی شەوە، ڕوخساری ڕەنگدانەوەی نیوەڕۆیە، شۆخێک بەچاوی ڕەشی مەست و برژانگی وەک تیر، هەرزەییێکە ئاژاوە دەنێتەوە بۆ دڵدار.

٧- لە چوارینێکی دیکەشدا شاعیر دەڵێ:

ئەز ڕوو ڕەشم و ســـیـــــاھ ڕوومـــە چ بکەم
یارەب تو دزانی نەفـــســـا شـــوومـــە چ بکەم
گــەر چ غـــەزەبا تە پڕ شـــەدیدە ب عـــیـــقـــاب
دل دایە بەر ڕەحـــمـــــەتا تە ڕوومـــە چ بکەم

ئەم چوارینە موناجاتێکە شاعیر لە خودا دەپاڕێتەوە. ئەگەر سەرنج بدەینە ناوەڕۆکی شیعرەکە ڕەنگە هەموو ڕستەکان لەگەڵێ لە موناجاتی شیعر و پەخشانی کوردیدا بدۆزینەوە، واتە بەرامبەر بەمانایێکی ئاسایی دەوەستین لە شیعری پاڕانەوە و موناجات و ئیلاهییاتی شیعری ڕۆژهەڵات دەدۆزێتەوە، بەڵام شاعیری کوردی ئەم ماوەیەمان هوشیارانە چوارچێوەییێکی هونەری دروست کردووە، بەتایبەتی پەنجە درێژکردن بۆ هەندێ ئایەتی قورئان زیاتر ئەم چوارچێوەیەی ڕازاندۆتەوە، واتە ئەم جۆرە شیعرانە جوانییان لە وشەیە زیاتر لەوەی لە مانا بێ.

***

لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەم کە شا پرتەوی هەکاری لە دایک بوو، لە ئەنجامی ڕینیسانسی شیعری کوردستانی باکوور کۆمەڵێک بەرهەمی بەنرخی عەلیی هەریری و مەلای جزیری و فەقێی تەیران و ئەحمەدی خانی هی دیکە لە ناوەوە بوون.

ئەم بەرهەمە شیعرییە ڕەندانە بوون بەسەرچاوەی ئیلهام بۆ شاعیرانی دیکە. قوتابخانەی شیعری کوردستانی سەروو بە بەها بوو، بەپیت بوو، هاندەرێکی گرنگ بوو بۆ بەردەوامی ئەو بزووتنەوە ئەدەبییە، پرتەو لەم ڕێڕەوە هونەرییەدا دەوری باڵای هەبوو و بەشیعرە جوانەکانی ئەدەبی کوردی دەوڵەمەندتر کرد.

## بەشی شازدەم

# ڕۆمانی شیعری لە سەدەی هەژدەمدا

یەکێ لە خاسیەتە گرنگەکانی ئەدەبی کوردی ئەوەیە ڕۆمانی شیعری بابەتێکی سەرەکییە لە داهێنانی ئەدەبیدا. بەزۆری ئەم جۆرە بەرهەمە لە ناوچە شاخاوییەکان و هەرێمەکانی باکووری کوردستان دەبینرێ. بەگشتی ڕۆمانی شیعری ناوەرۆکی لە سەرچاوەی ئەدەبی میللی نەنووسراوی سەر زار وەردەگرێ و دیارە بنەچەی ئەم سەرچاوانەش دەگەڕێنەوە ڕۆژگارێکی یەکجار دێرینی سەردەمی هیندۆ ئەورووپی و هیند و ئێرانییەکانی پێش ئیسلام، ئینجا سەرچاوە ئایینییەکان (جوولەکە و مەسیحی و ئیسلام) کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر ناوەرۆکی ئەم جۆرە ڕۆمان و چیرۆکە شیعرییانە.

ڕۆمانی شیعری لە ئەدەبی کوردی لەسەر یەک کێش دەبێ، بەزۆری بەعەرووزی عەرەبی دەکێشرێ و هەندێ جار کێشی خۆماڵی (سیلابی، پەنجە)ش بەکاردەهێنرێ، هەرچی قافیەشە، پێڕەوی جووت قافیە (مەسنەوی – موزدەویج) (ا ا، ب ب، ج ج...) دەکا. ئەو ڕۆمانی شیعرییەی لەسەر کێشی عەرووز دادەمەزرێ بەزۆری کێشی هەزەجی بۆ بەکار دەهێنرێ.

ناوەرۆکی ڕۆمانی شیعری لە ئەدەبی کوردیدا بەزۆری بریتییە لەمانەی لای خوارەوە:

١– ڕۆمانی قارەمانی و سوارچاکی و جەنگاوەری (مەلحەمەی پێدەڵێن).

٢– ڕۆمانی مێژوویی.

٣– ڕۆمانی ئایینی و ئایینزایی،

٤– ڕۆمانی دڵداری و دەسبازی.

٥– ڕۆمانی کۆمەڵایەتی.

٦– ڕۆمانی ئەخلاقی و پەند و ئامۆژگاری.

تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بایەخێکی ئەوتۆ بەڕۆمانی شیعری نەدەدرا لەلایەن نووسەرانی مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، زۆربەی تێکستی ئەو بەرهەمانە لە نامەخانەکانی ئەورووپا پارێزرابوون، ئەوانەی لەلای خۆشمان لە ماڵە خوێندەوارەکاندا بەو چاوە تەماشا نەدەکران وەکو شیعری لیریکی کە جێگەیێکی بەرزی هەبوو لە کۆڕی ڕۆشنبیراندا.

لە دوای جەنگی دووەمی گیتی زانیارییێکی زۆر کەوتە ناوەوە لەبابەت ئەو دەسنووسە کوردییانەی چیرۆکی شیعرییان گرتۆتە خۆ و لە ئەورووپا پارێزراون، لای خۆشمان زیاتر لەبەر ئەوە بایەخی پێ درا چونکە ئەم جۆرە بەرهەمانە لە ڕووی هونەرییەوە نزیکن لە ئەدەبی میللی سەرزار.

لەو ماوەیەدا هەندێ لەم چیرۆکە شیعرییانە دەخەینە ڕوو.



### لەیلا و مەجنوون

حیکایەتی میللی لەیلا و مەجنوونی عەرەبی لە دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە کۆمەڵی کوردەواریدا کەوتە ناوەوە. بەشێوەییێکی یەکجار فراوان ڕەنگی لە ئەدەبی میللی نەنووسراو (فۆلکلۆر) دایەوە. هەندێ لە شاعیرانی کورد لە ناوەرۆکی حیکایەتی لەیلا و مەجنوون ڕۆمانی شیعرییان نووسیوەتەوە لەوانە:

١– لە شاعیرانی سەدەی هەژدەم مەلا محەمەدی قولیی کەندوولەیی، لە ساڵی ١٧٣٢ لە نووسینەوەی بۆتەوە. دەسنووسی ئەم لەیلا و مەجنوونە لە ساڵی ١٨٧٠ ڕوونووس کراوە، ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمان ئۆسکارمان لە شاری کرماشان کڕیویەتی. هەروەها دانەیێکی تری ئەو دەسنووسە لە ناوەوەیە بەخەتی مەلا سادق لە ٧ی شوباتی ١٨٧٩ ڕوونووس کراوە، ئۆسکارمان لە سابلاغ (مەهابادی ئێستا) کڕیویەتی. ئەم بەرهەمە ئەدەبییە تا ئێستا بڵاونەکراوەتەوە، هەرچەندە ئەم دیاردەیە ڕووی ڕاستی ئەدەبی نەتەوە ناگۆڕێ بەڵام لەبەر ئەوەی نەکەوتۆتە دەست ڕۆشنبیر و خوێندەواران تەنیا ناسینی بەچەند وشەییێک تێنوویەتی خوێنەری ئەدەبی کوردی دەشکێنێ.

٢– شاعیرێکی دیکەی سەدەی هەژدەم حاریس بتلیسی، لە ساڵی ١٧٥٨ لە دانانی ڕۆمانی شیعری «لەیلێ و مەجنوون» بۆتەوە. چیرۆکەکە بریتییە لە ٧٤٠ دێڕە شیعر و لە ٢٤ فەسڵ پێکهاتووە، بەشێوەی مەسنەوی و لەسەر کێشی هەزەج دانراوە. دەسنووسی ئەم چیرۆکە لە دوا ساڵانی سەدەی نۆزدەم بەخەتی فەیرووز ئەفەندی ڕوونووس کراوە.

لە ساڵی ١٩٦٥ مارگریت ڕوودێنکۆ ڕۆمانی شیعری «لەیلێ و مەجنوون»ی حارس بتلیسی لەگەڵ وەرگێڕانی ڕووسی لە مۆسکۆ بڵاوکردەوە. وەک لە ناوەرۆکی داستانەکە دەردەکەوێ حارس بتلیسی لەسەر خواستی کچە کوردێک حیکایەتی لەیلێ و مەجنوونی بەشیعر هۆنیوەتەوە.

سەرچاوەی بنچینەیی شعیر حیکایەتە زۆر و میللییەکانی سەرزاری خەڵکی کوردەوارییە لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا. بێگومان ڕۆمانە شیعرییەکانی پێش حارس بتلیسی بەزمانی کوردی بووین یا زمانی دیکە بوونەتە سەرچاوە بۆ شاعیر، هەرچۆنێ بێ حارس بەرهەمێکی ڕەسەنی هێناوەتە ناوەوە.

شاعیر ئەم ناوانەی بۆ هەندێ لە فەسڵی ڕۆمانەکە داناوە:

١– سەرەتای چوونە ناو دڵی یەکتری لەیلا و مەجنوون.

٢– مرازخواز نایانەوێ نهێنییان ئاشکرا بێ.

٣– مەجنوون بە چۆڵ و بیابان دەکەوێ.

٤– مەجنوون ڕوو دەکاتە کەعبە.

٥– خوازبێنی لە باوکی مەجنوون.

٦– خوازبێنی لە ئیبن سەلام.

٧– نۆفەل دێتە ناوەوە.

٨- مێردکردنی لەیلا.

٩- مەجنوون دیسانەوە بەچۆل دەکەوێ.

١٠- ڕێگە خۆشکردن بۆ ژوانی لەیلا و مەجنوون.

١١- ژوانی لەیلا و مەجنوون.

١٢- مردنی دایک و باوکی مەجنوون.

١٣- مردنی لەیلا.

١٤- مردنی مەجنوون.

حارس بتلیسی ڕۆمانی شیعری «لەیلا و مەجنوون»ی بەهەناسەییێکی دڵداری سەرزەمینی و پێوەندی کۆمەڵایەتی نووسیوە، هیچ جۆرە هەوا و چێژێکی سۆفیزمی تێدا بەدی ناکرێ.

**یووسف و زولەیخا**

چیرۆکی دڵداریی یووسف و زولەیخا و کارەساتی یەعقووب بە ونبوونی یووسف بەهۆی تەورات و قورئانەوە لەناو نەتەوە موسوڵمانەکاندا بڵاوبۆتەوە، لە پاشانا بووە بەسەرچاوەییێک لە ئەدەبی میللی سەرزار و ئەدەبی نووسراوی بەرزی هەموو نەتەوە موسوڵمانەکان و گەلێ ڕۆمانی شیعری لێ دوست کراوە و لە ئەدەبی کوردیدا جێگەییێکی بەرزی داگیر کردووە.

لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا کۆمەڵێک دەسنووسی بەنرخی «یووسف و زولەیخا» لە نامەخانەکانی ئەورووپا دۆزرانەوە، بەتایبەتی لە نامەخانەکانی شاری سانت پیترسبورگ، ئەمە تەنیا نەبووە هۆی ئەوەی گەنجینەییێکی دیکە لە ئەدەبی کوردی بدۆزێتەوە، بەڵکو بووە هۆی ئەوەی شاعیری دیکەی گوم ناوی کوردیش بناسین.

یەکێ لە شاعیرانی سەدەی هەژدەم سەلیم سلێمان بوو. ئەم شاعیرە وەکو لە شیعری دەردەکەوێ کەسێکی خوێندەوار بووە، عەرەبی و فارسی و تورکی عوسمانی زانیوە، شارەزای ئەدەبی ئەم نەتەوانە بووە، جگە لەوە وەک دەرچووی حوجرەی مزگەوتی ئەو سەردەمانەی کوردەواری ئاگاداری لە ئایینی ئیسلام و زانستییەکانی زمانی عەرەبی بووە.

چەند دانەییێک لە دەسنووسی «یووسف و زولەیخا»ی سەلیم سلێمان لە ناوەوەیە، بەهۆی ئەم سەرچاوانەوە مارگریت ڕوودێنکۆ لە ساڵی ١٩٨٦ تەواوی ڕۆمانی شیعری «یووسف و زولەیخا»ی بڵاوکردەوە لەگەڵ وەرگێڕانی بەزمانی ڕووسی.

ئەم چیرۆکە لە ١٧١١ دێڕە شیعری مەسنەوی (دوو نیوە دێڕ شیعر) پێکهاتووە. لە بنجدا حیکایەتەکەی بۆ میری خێزان یا بە یادی ئەو میرەی لە سەردەمی شاعیر ژیاوە هۆنیوەتەوە، سەلیم سلێمان چیرۆکی «یووسف زولەیخا» بەم دێڕانە دەست پێدەکا:

دیباچەیێ نامە نامێ مەعبوود



قەییوم و قەدیم و حەی یو مەوجوود
سازندەیێ مومکینات و کەونەین
داردندەیێ کائینات و بەحرەین
بێ مەبدەئو بیدایەت و قەدیمی
غەففار و عەزیم و هەم ڕەحیمی

***

تەجدید بکم ژ نوو ڕیوایەت
تەحریر بکم ژ نوو حیکایەت
ئەمما بسەعادەت و بعنوان
بەحسی بکم ئەم ژ پیری کەنعان
یەعقووب هبوو د بورجی ڕەفعەت
چەند ئەختەری مەتلەعا نوبووەت

شاعیر بەم دێڕانە کۆتایی بەچیرۆکەکەی دێنێ:

یا ڕەببی ب ئەڤینیا زولەیخا
یا ڕەببی ب تووتی یێ شەکەر خا
وەهھاب و کەریم و هەم ڕەحیمی
مەحرووم نکی ژ خوە (سەلیم)ی
هیڤی گرە ئەو ژ زاتێ ئەمجەد
ئازاد بکی ب بەخشی ئەحمەد
ئەز هیڤی دکم ژ خاس و عامان
هەر وەقت و زەمان و حین و ئانان
وەقتی کو بخوونن هوون کیتابی
من هیڤی هەیە بکن سەوابی
مەخسووس دکم ژ وە ڕەجایە
هوون فاتیحەیەک بکن هەدایە

مەبەسی سەرەکی شاعیر لەم چیرۆکەدا ئەوەیە باس لە تراجیدیای یەعقووب و کوێربوونی بکا بەهۆی ونبوونی یووسفی کوڕی، ئینجا مەسەلەی دڵداری نێوان یووسف و زولەیخا تێکەڵ بەتراجیدیای یەعقووب دەکا. زولەیخا و یەعقووب قارەمانی گرنگی چیرۆکەکەن.

شاعیر چیرۆکەکەی لە وەسفی خەونی یووسفەوە دەستپێدەکا، چۆن باوکی پێی دەڵێ بۆ براکانی نەگێڕێتەوە. لە دواییدا خوشکی یووسف خەونەکە بۆ برایانی دەگێڕێتەوە. ئینجا باس لەوە دەکا چۆن براکانی یووسف دەخەنە بیرەوە و کراسی لە خوێن وەردەدەن و بۆ باوکیانی دێنن بەناوی ئەوەی گورگ خواردوویەتی. یەعقووب سەرنج دەداتە کراسەکە و شوێنەواری ددانی گورگ نابینێ. لەبەر ئەوە باوەڕ بەکوڕەکانی ناکا، بۆیە هەموو گورگی سەر ڕووی زەوی بانگ دەکا و مەسەلەکەیان لێ دەپرسێ، لە پاشانا دێتە سەر باسی کاروانچییان و چۆن یووسف لە بیر دەردێنن. ئینجا دێتە سەر باسی دڵداریی زولەیخای کچی شا تەیمووس بەرامبەر بە یووسف.

سەلیم سلێمان لە بینین و بە یەکتری گەیشتنی یووسف و زولەیخا دەدوێ لە بازاڕ بۆ یەکەمین جار. زولەیخا لە یەکەم بینیندا لەوە دڵنیا دەبێ ئەمە ئەو کەسەیە کە لە خەونا دیویەتی. زولەیخا تکا لە عەزیزی میسر (پووتیڤار) دەکا کە یووسف بکڕێ، بەڵام دوودڵ دەبێ و وازان دەکا نەوەکو شا خۆی ئارەزووی کڕینی ئەم دیلە جوانە بکا! زولەیخا داوا لە شا دەکا بەوە ڕازی بێ عەزیز یووسف بکڕێ، ئەمەی بۆ دەچێتە سەر، ئیتر زولەیخا هەوڵ دەدا لە یووسف نزیک بکەوێتەوە، بەڵام بێ سوود دەبێ و بۆی ناچێتە سەر.

شاعیرێکی کوردی دیکەی سەدەی هەژدەم حارس بتلیسی جگە لەوەی ڕۆمانی شیعری «لەیلا و مەجنوون»ی نووسیوەتەوە، ڕۆمانی شیعری «یووسف و زولەیخا» یەکێکە لە کردەوەکانی ئەم شاعیرە.

بێگومان ئەم شاعیرەمان سوودی لە کارەکەی سەلیم سلێمان وەرگرتووە چونکە پێش ئەو نووسراوەتەوە، ئەگەر بە وردی بەراوردێک لە نێوان تێکستی هەردوو شاعیر بکەین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ لە هەندێ شوێن حارس لە سەلیمی وەرگرتووە، بەڵام بە داڕشتنێکی تازە دەژمێررێ، لەبەر ئەوە دەچێتە ناو بەرهەمی ئەدەبی داهێنراوەوە. جگە لەمە «یووسف زولەیخا»ی حارسی بتلیسی لەوەی سەلیم سلێمان میللی ترە، زیاتر نزیکی ئەدەبی نەنووسراوی سەرزارە، بەقەوارەش لەو بچووکترە. دەسنووسی ئەم بەرهەمە ئەدەبییانە لە ناوچەکانی کوردستانی سەروو باو بوون، دەنگوباسی وا هەیە لە دوای خەتمی قورئان لە حوجرەی مزگەوتدا ئەم چیرۆکانە چووبوونە پرۆگرامی خوێندنی ئاییینییەوە.

بابەتی ڕۆمانی شیعری لە کۆنەوە، واتە پێش سەدەی هەژدەم لەناو کۆمەڵی کوردەواری لە ناوەوە بووە، هەروەها لە دوای سەدەی هەژدەمیش مێژووی ئەدەبی کوردی گەلێ بەرهەمی بەنرخی لەم بابەتەمان بۆ دەوردەکاتەوە.

## بەشی حەڤدەم

# تیرەی لوڕ و ئەدەبی نووسراویان

### تیرەی لوڕ و جوگرافیای لوڕستان

وەکو ئاشکرایە میللەتی کورد وەک نەتەوەییەک لە سێ تیرە پێکهاتووە: کرمانج، گۆران، لوڕ. ئەم تیرانە لە هۆز و عەشرەت و یەکێتی عەشرەتی جیاواز پێکهاتوون، لە ڕووی نەژادەوە هەموویان نەتەوەی کورد پێکدێنن، لە ڕووی زمانەوە بەپێی زمانی عەشرەتەکانەوە لە دیالێکتی گەورە و بچووک پێکهاتوون، دیالێکتەکان ناویان لە ناوی تیرە و هۆز و عەشرەت و ناوچە و هەرێمە جوگرافیەکان وەرگرتووە.

لوڕ وەک کۆمەڵێک لە خەڵک بەشێکی گرنگن لە نەتەوەی کورد، لە سەردەمێکی یەکجار کۆنی پێش مێژوو لەو خاکەدا دەژین کە لوڕستانی پێ وتراوە، کەلوپەلی ئادەمزادی پێش مێژوو لە خاکی لوڕستان دۆزراوەتەوە، نموونەی ئەم پاشماوە ئەرکیۆلۆجیيانە لە مۆزەکانی ئەوروپا دەبینرێن. تیۆرییێکی مێژوویی لە ناوەوەیە گۆیا سۆمەرییەکان لە وڵاتی ئێستای لوڕەکانەوە کۆچیان کردووە بۆ باشووری میزۆپۆتامیا (عیراق). بینینی مێژوو هەرچۆنێک بێ لەم لایەنەوە لە سەردەمی ئێستاماندا بەناوچەیێکی دواکەوتوو دەژمێررێ.

لە ڕووی نەژادەوە گفتوگۆی ئەکادیمی لە ناوەوەیە لە بابەت پێوەندی لوڕ بەکوردەوە، واتە بەکوردبوونی لوڕ. ئەم مەسەلەیە لەلایەن زانا و پسپۆڕانی کورد و زۆربەی ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسەکانەوە ساغ بۆتەوە، گومان لەوەدا نەماوە کە لوڕ کوردن، جگە لەوە بەڵگەی گرنگیش ئەوەیە زۆربەی لوڕ خۆیان بەکورد دەزانن، ئەمە تیۆرییێکی گرنکە لە تەعریفی نەتەوەدا.

هەندێ لە سەرچاوە بنچینەییەکانی مێژووی عەرەب و تورکی عوسمانی لوڕیان بەتیرەییێکی کورد داناوە، لەوانە یاقووتی حەمەوی و ئەحمەد جەودەت پاشا. لە کوردانیش محەمەد ئەمین زەکی ماوەییێک لە پشتکۆ لەناویان ژیاوە، وەک کوردێکی خەڵکی سلێمانی توانیویەتی بەکوردی قسەیان لەگەڵدا بکا و لەیەکتری بگەن.

مێژووی کۆن و تازەی لوڕەکان بەمێژووی ئێران و میزۆپۆتامیا بەستراوەتەوە. لە ڕۆژگارانی مێژوودا میرنشین و دەسگای دەوڵەتی بەناوی خۆیان لەژێر فەرمانڕەوایی خۆیانەوە لە ناوەوە بووە. ئەمانە یا سەربەخۆ بوون یا لە سایەی شاکانی ئێراندا بوون.

وڵاتی لوڕستان وەک لەسەر نەخشەی جوگرافیا دەبینرێ ئاقارێکە پەنا کەوتووە و دوورە لە مەڵبەندە ستراتیجییەکان، لەبەر ئەوە لە مێژوودا لەڕوو نەبووە، تەنگوچەڵەمەی کەم بووە، بەزۆری تێکەڵ بەکۆمەڵ و میللەتانی دیکە نەبووە، لەبەر ئەوە ڕەوشتی نەتەوایەتی و ئازایەتی خۆی پاراستووە.



جێگەی جوگرافی لوڕستان وەک خاکێکی لە پەنا و لا کەوتووە لە گەلێ لە هێرشی بێگانان ڕزگاری بووە، ئەگەر هێرشیشی کرابێتە سەر وەک ئەوانەی هۆلاکۆ و تەیمووری لەنگ لێشاوی لەشکری ئەم داگیرکەرانە نەیتوانیوە بەسەریان زاڵ بێ و وڵاتیان داگیر بکا. بەڵام بەگشتی لوڕستان لەژێر فەرمانڕەوایی ئەتابەگەکاندا بوو، شا عەباسی سەفەوی هێرشی بردە سەر لوڕستان و دوا سەرداری ئەتابەگەکانی کوشت کە ناوی شا هوردیخان بوو بەتەواوی لوڕستانی داگیرکرد لەو ساوە لەژێر دەسەڵاتی ئێران دایە.

لوڕەکان لە ڕووی ژیانی ئایینی و کۆمەڵایەتییەوە بەگشتی لە کورد جیا نابنەوە. لە بابەت ئایینەوە موسوڵمانن و لەسەر ئایینزای شیعە (دوازدە ئیمامی)ن، گەلێ پابەندی سەیدانی ئیمامی شیعەن. گیانی عەشرەتی و نەریتی بنەماڵەیی لە ناویاندا بەهێزە. دوژمنایەتییان لەگەڵ بێگانە بە ئاسانی کۆتایی نایە، لەگەڵ خۆشیان برینی دوژمنایەتی بە هیچ جۆرێ سارێژ نابێ بەوە نەبێ هەر یەک لە دوژمنەکان کچێکی خۆی بداتە ئەوی دیکە. جگە لەوە ڕەوشتێکی تریشیان هەیە لە منداڵییەوە کوڕ و کچێک لەیەکتری مارە دەکەن و بەگەورەیی دەبن بەژن و مێرد.

جێگەی لوڕستان لەسەر نەخشەی جوگرافی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەتوانین بەم جۆرە دیاری بکەین: لای باکووری کرماشانە، لای ڕۆژهەڵاتی شاخەکانی برۆجەرد و مەلایەرە، لای باشووری خۆزستانە، لای ڕۆژئاوای درێژایی سنووری نێوان عێراق و ئێرانە لە خانەقینەوە تا کەنداو. وڵاتێکی شاخاوییە، زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس لوڕستان دەکا بەدوو بەشەوە پێشکۆ و پشتکۆ. هەروەها زێی کەرخە ئەم دوو ناوچەیە لە یەکتری جیا دەکاتەوە.

عەشرەتە گەورەکانی ناوچەی پێشکۆ (لوڕی بچووک، فەیلی) ئەمانە بوون:

حەسەن وەند، یووسف وەند، کاکە وەند، پیران وەند؛ هەروەها عەشیرەتە گەورەکانی ناوچەی پشتکۆش (لوڕی گەورە) ئەمانە بوون: مەلەک شاهی، دینار وەند، مامەسەنی.

عەشرەتەکانی لوڕ وەکو عەشرەتەکانی دیکەی کوردستان، لەو کاتەی زۆریان کۆچەر بوون، بەشێکیان هەر لە کۆنەوە نیشتەجێ بوون، کۆچەرەکانیان بەرە بەرە نیوە نیشتەجێ دەبوون، لە دواییدا وازیان لە ژیانی کۆچەری دەهێنا. عەشرەتی پیران وەند و سگوند لە عەشرەتە کۆچەرە گەورەکانی لوڕ بوون.

لە سەردەمی ئێستاماندا زۆربەی هەرە زۆری خاکی لوڕستان کەوتۆتە ئێرانەوە، بەناوی ئوستانی لوڕستانەوە کراوە بەسێ شەهرستان: خوڕەم ئاباد و برۆجەرد و ئەلیگۆدەرز، تیلمەییێکی درێژی خاکی لوڕستان کەوتۆتە دیوی لای ڕۆژئاوای سنووری ئێران و هەندێکیشیان لە شارە گەورەکانی نزیکی سنووری عێراق وەکو کووت و عەمارە دەژین، جگە لەوە بەناوی «فەیلی»یەوە جالیەییێکی گەورەیان لە بەغدا هەیە.

دیالێکتی لوڕی زمانی کوردی لە چەند دیالێکتێکی بچووکی زمان دیار دەکەوێ، وەکو: فەیلی، کرماشانی، بەختیاری، لەکی، کەلهوڕی، مامەسەنی... ئەدەبی میللی نەنووسراوی سەرزار بەهەموو ئەم

دیالێکتانە لە ناوەوەیە، بەڵام بەپێی پێویست کۆ نەکراوەتەوە و لێی نەکۆڵراوەتەوە، هەرچی ئەدەبی کلاسیکی نووسراویشە ئەمەیان نابێ بڵێم نیانە، چونکە پەردەیێکی تاریکی بەسەردا کێشراوە و ئێمە ئاگاداری نین، ئەمە دەڵێین چونکە لە دوای کۆششێکی بێ وچان توانیمان هەندێ نموونەی ئەو ئەدەبە کلاسیکییەی دیالێکتی لوڕی زمانی کوردی بدۆزینەوە.

### ئەدەبی لوڕی

هەرچەندە ناوچەی لوڕستان لە ڕووی ڕۆشنبیری و خوێندەوارییەوە ئەو دەرفەتەی بۆ هەڵنەکەوتووە وەکو ناوچەکانی دیکەی کوردستان ئەدەبی کلاسیکی نووسراوی لێ هەڵبکەوێ بەشێوەیێک بەرهەمێکی زۆر بێنێتە ناوەوە بەڵام بزووتنەوەیێک هەبووە، ئەمە خۆی لە میرزاییێک یا خوێندەوارێک بینیوە بەتایبەتی چینەکانی سەرەوە ئەوانەی بەڕێوەبردن و سەرۆکایەتی هۆز و عەشرەتەکانیان کەوتبووە ئەستۆ.

ئێمە بەپێی لۆجێکی مێژوو لەوە دڵنیابووین ئەو خەڵکەی لوڕستان نابێ بەرهەمی ئەو جۆرە شیعرەیان نەبێ کە بە ئیسلامەوی ناوی دەبەین. هەروەها وەکو ئاگادارین لوڕستان مەڵبەند و لانکێکی گرنگی ئایینی یارسانەکانە، بەشێکی زۆری ڕێبەرەکانیان لوڕن یا لە لوڕستان ژیاون. ڕاستە زمانی ئەو ئایینە دیالێکتی گۆرانی زمانی کوردییە بەڵام لوڕی کاری گەورەی کردۆتە سەر ئەو دیالێکتە، هەروەکو چۆن لوڕی کاری کردۆتە سەر ئەو زمانە ناوچەییەی دەوروبەری هەمەدان کە باباتاهیر دووبەیتەکانی پێ نووسیوە.

### کەشکۆڵی گوڵشەن

دەسنووسی «گوڵشەن» بەقەوارە یەکێکە لە دەسنووسە هەرە گەورەکانی نامەخانەی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی لە ئەکادیمییەی زانستی ڕووسی لە شاری سانت پیترسبورگ. ئەم دەسنووسە بەنرخە لە ساڵی (١١٩٨ھ/١٧٨٣-١٧٨٤م) نووسراوەتەوە یا ڕوونووس کراوە لەلایەن محەمەدی قازیی کوڕی محەمەد ڕەزای مەهجوورەوە.

وەکو لە مێژووی نووسینی دەسنووسەکە دەردەکەوێ لە دەوروبەری فەرمانڕەوایی بنەماڵەی زەندی لە ئێران (١٧٥٨ھ-١٨٩٤م) ڕوونووس کراوە. ڕەنگە لەسەر داوای کاربەدەستی یەکەمی ئێرانی ئەو سەردەمە خۆی بووبێ، لەوانەشە گەورەیێک، یا دەوڵەمەندێکی ڕۆشنبیر و کتێب دۆست بەڕادانی دابێ.

شیعری دەسنووسەکە بەگەلێ لە زمانی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تۆمارکراون، وەکو زمانانی: فارسی، تورکی، عەرەبی، کوردی، ئەرمەنی، گورجی، ئەفغانی (پشتوو) و دیالێکتەکانی زمانانی هیندستان و هی دیکە. ئەوەی دەسنووسەکەی بۆ ئامادەکراوە مەبەسی بووە نموونەی بەرزی شیعری کلاسیکی هەموو نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و قەفقاسی تێدا تۆمار بکرێ، لەبەر ئەوە نووسەر شیعری کوردیشی فەرامۆش نەکردووە. لێرەدا جێی سەرنجدانە نووسەر لە شیعری کلاسیکی هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردی گەڕاوە، نموونەی شیعری کرمانجی سەروو و گۆرانی و لوڕی هێناوەتەوە، پێویستە ئاگاداری ئەوەبین لەو سەردەمەدا هێشتا شیعری کلاسیکی نووسراو بەدیالکێتی کرمانجی خواروو دروست نەبووبوو.



بەشی کوردی دەسنوسەکە ئەم شیعرانەی گرتۆتە خۆ:

١- پارچە شیعرێکی ئەحمەدی خانی، ٣٤ نیوە دێڕ شیعرە.
٢- پارچە شیعرێکی تەیفی هەکاری، ١٤ نیوە دێڕ شیعرە.
٣- پارچە شیعرێکی مەلا حەسەنی کاشی، ٣٢ نیوە دێڕ شیعرە.
٤- پارچە شیعرێکی مەلای جزیری، ٦ نیوە دێڕ شیعرە.
٥- پارچە شیعرێکی شێخ حەسەنی گۆرانی، ٨ نیوە دێڕ شیعرە.
٦- شیعرێکی دیکەی دیالێکتی گۆرانی، ٨ نیوە دێڕ شیعرە، ناوی خاوەنی نەنووسراوە.
٧- دیسان شیعرێکی تری دیالێکتی گۆرانی، ١٠ نیوە دێڕ شیعرە، ناوی خاوەنی نەنووسراوە.
٨- میعراج نامە، لە شیعری قازیی مەنگوڕە، ٣٦ نیوە دێڕە شیعر بەدیالێکتی لوڕی زمانی کوردییە.
٩- شیعری شەهمیری لوڕ لە بابەت جەژنی غەدیرەوە، ٢٤ نیوە دێڕ شیعرە.

ئەوەی لێرەدا جێی سەرنجدانە نووسەری دەسنووسەکە لوڕ و گۆرانی بەکورد حسێب کردوون، ئەمەش بەڵگەیێکی دیکەیە بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو بیروڕایانەی ئەم دوو تیرە گەورەیەی کورد بەکورد نازانن.

ئەوەی لەم ماوەیەدا پێویستی بەڕوون کردنەوە هەیە ئەوەیە نووسەری ئەم دەسنووسە بەنەتەوە فارسە و فارسی باش زانیوە، ڕەنگە زمانی تورکیشی باش زانیبێ، بەڵام بەهیچ جۆرێ زمانی کوردی نەزانیوە و شارەزای دیالکێتەکانی نەبووە، لەبەر ئەوە شیعرە کوردییەکانی دەسنووسەکە بەگشتی هەڵەیێکی زۆریان تێدایە، هەوڵ و کۆششێکی وردیان گەرەکە تا ساغ دەبنەوە و خوێندەوار دەتوانی تێیان بگا.

لەم ماوەیەدا هەوڵ دەدەین هەردوو قەسیدەکەی شیعری لوڕی بڵاوبکەینەوە. ئێمە کۆششێکی زۆرمان کرد لە پێناوی هەردوو پارچە شیعرەکە، بەڵام هەست دەکرێ هێشتا بەتەواوی ساغ نەبۆتەوە و لە هەندێ نیوە دێڕ شیعردا هەست بەلەنگییێک دەکرێ، هەرچۆنێ بێ بڵاوکردنەوەی ئەم دوو نموونەیە یادگاری شیعری کلاسیکی لوڕەکانە و لاپەڕەی مێژووی ئەدەبی کوردی پێ ڕەنگین دەبێ.

### میعراج نامە
### شیعری قازیی مەنگوڕە

لەم شیعرەدا شاعیری لوڕی ئەم ماوەیەمان باس لە میعراجی پێغەمبەر دەکا، ئەم ڕووداوە ئایینییە چیرۆکی پێغەمبەر دەگێڕێتەوە لە مەککەوە بۆ قودس و لەوێوە بە یاوەڕی جبریل بۆ بارەگای خودا لە ئاسماندا، لە ئەدەبی کوردیدا ئەم ڕووداوە لە شیعری ئایینیدا ڕەنگی داوەتەوە بەشیعری کورت و قەسیدەی درێژ و چیرۆکی شیعری و پەخشانی دەکەوێتە ڕوو.

بە شەهنی ئەر بەهوونم شرره میعراج نەبی واتوو
موسولمان بید ئەزین ئەر کافری ئین حەرفە ئبشەهنەست
مەلیکولڵا دەوڵەتمەند جربیلش فرسەندیدە

بجوست کاد موهەممەد کەهـ سووار بوراک و رەست
بوراک ئو وەرد جربابیل و دەر ساعەت سوارەش کەرد
بوراکش چی کەبووتە و ئەز زەمین وور ئاسمان پەهرەست
کەدەم دەر ئاسمانی ئەووەلی بنهاد ئان هەزرەت
ئەلی چون شیری سوهراوون سەری رهنە بەئووگهرەست
بجبریل گوفت کاد موهمەد کە ئین شیر ئەزمنەش چی نما
کە ئەز ترسەش دلم هەمچون کولاهی کوهنەیی دەهرەست
بموهەممەد گوفت جربابیل کینی شیر ئیخو رەهداری
پەس ئان کە موهەممەدین ئەنگوستەرینەش دادوو وەر دەست
وولایی هەق تەعالا کاد موهمەد تاختی کەردی
بوراکەش هەمچو بادی سەخت ئیرەفتی کەنی لهرەست
ز مالی زیر تا دەر مالی بالا رەفت وولای مەردان
چنان مەردانی مەرد نە ئەز کەسی ترسەست و نە لەرزەست
مەلیک سوبحانەهو وەر ئوو سوخ کەرد ئەرنیشی پەردە
براش حەرف و حقایەت کەرد کە حەرف بی بهرەست
دەرئان هال و حقایەت ئیلتیماسی ئومەتی خوش کەرد
وو هەر ریشان ز دووزەغ ئەز کەمالی فەزلی خوونارەست
پەس ئەز هال و حقایەت هەق تەعالا گوفت ئەی موهمەد
تو موهمووونی مونی دانەم دلەت ئەز کەنگی موهرەست
برایەش هازری ئاوەرد نان و ماست و هەم هورما
وە بەعد ئەز هازری روخسەت گرفت زی بزی سەهلەست
ز تەیی هەق تەعالا میری دەولەتمەند بیدراهی
مەلاییک سەد هەزار ئەرنەش و ئەز نساس توهرەست
ئەجایب موهمەدین ئەز مالی بالا مالی زیر ئامەد
بتەیی زینە و کورگەل کە مالەش چی گول گول هەست
بجا خالیش بابای بزورگان ئوومە در تەییەش
ئەجایب موهەمەدین ماندی کە ئین بابا زکی شهنەست



ئەلی ئەز ڕەفتەن و ئەز ئامادەن خاتر نشانش کەرد
ز شیر و دادەنی ئەنگوستەرین راکەرەد کو هنەست
بگوفتا موهمەدی هەققەن تو بابایی بزورگانی
کە مەردی بزورگی و سەریوەر نامی تو مهنەست
منەم (قازیی مەنگورە) وەلی شرە وەلی دوورە
ئەگەر مو موئجیزی گوفتەم کە نەبهرەست و نەکهرەست

واتاکەی:

ئەگەر گوێ بگری شیعری میعراجی پێغەمبەرت بۆ دەخوێنمەوە
ئەگەر موسوڵمان بی یا کافربی، ئەم قسەیە ببیستە و گوێی لێ بگرە
خودای مەلیک و دەوڵەمەند جبریلی ڕەوانەکرد
لە محەمەدی مەزن بگەڕێ و سواری بوراقی بکا و دەربچن
جبریل بوراقی هێنا و دەستبەجێ سواری کرد
بوراق وەک کۆتر لە زەوییەوە بۆ ئاسمان فڕی
کە ئەو گەورەیە پێی خستە سەر ئاسمانی یەکەمین
عەلی وەک شێری زۆرابی گەیشتە ئەو و بەرامبەری وەستا (شێری زۆرابی، واتە ئازا، مەبەس سوهرابی کوڕی ڕۆستەمی زاڵە)
محەمەدی گەورە بە جبریلی وت ئەم شێرە چی لە من دەوێ
لە ترسی ئەو دڵم وەکو کڵاوی کۆنە دڕاو و کون کون بوو
جبریل بە محەمەدی وت ئەم شێرە دەیەوێ هاوڕێی سەفەرت بێ
لە دوای ئەوەی محەمەد ئەموستیلەی خۆی دایە، کەوتە ڕێ
محەمەدی گەورە پەلەی بوو زوو بگاتە لای خودای مەزن
بوراق وەک بای تیژ دەرپەڕی و کردی بەتۆز و غوبار
لە ماڵی ژێرەوە (ئەرز) تا دەرگای ماڵی سەرەوە (ئاسمان) چووە لای مەردان، کەسانی ئازا و جەسوور
ئەو مەردانەی (فریشتە و مەلایەکەتەکانی خودا) کە لەکەس ناترسن و نالەرزن
خودای گەورە پەردە و حیجابی لە ڕووی ئەو لابرد
قسە و گفتوگۆی جوانی لەگەڵدا کرد
یەکسەر لە خودا پاڕایەوە لە گوناهی ئوممەتی خۆش بێ
بەفەزلی خودا هەریەک لەوان لە دۆزەخ ڕزگاری بوو

له دوای گفتوگۆ حەق تەعالا وتی ئەی محەمەد
تۆ میوانی منی دەزانم دڵت لە کەیەوە مۆرکراوە یا پڕە لە خۆشەویستی و دڵداری
دەستبەجێ نان و ماست و خورمای بۆ هات
لە پاشانا ڕوخسەتی لەوانەی ئەوێ وەرگرت (مەلایەکەتەکان) و دەرچوو
ئەوەی لەلای حەق تەعالا میوان بوو
بەهەزاران مەلایەکەت لە پێش و لە پشتییەوە لە حوزووردا بوون
سەیرە محەمەد، لە ماڵی باڵاوە، لە ئاسمانەوە، لە بەهەشتی خوداوە گەڕایەوە سەر زەوی
بۆ لای ژنان و کوڕگەلان و هاوڕێیانی کە لەگوڵ دەکەن
جێی گەورەی گەوران (عەلی) بوو، بەڵام دەرکەوت و هاتە کنی
محەمەد سەیری پێ هات، چۆن زانی و لەکوێوە هات!
عەلی پیرۆزبایی لە چوون و گەڕانەوەی کرد
سوپاسی بەخشینی شمشێر و ئەمووستیلەی کرد
وتی محەمەد تۆ بەڕاستی گەورەی گەورانی
مەردی گەورە و سەروەری هەموو گەورەکانی
منم (قازیی مەنگوڕە) مەگەر ئەمە شیعرە و دوڕڕە
ئەگەر من موعجیبرەم وتبێ، نە زۆر و گەورەیە، نە کەم و بچووکە

### پێشوازیی غەدیری خوم

### شیعری کادی شەهمیری لوڕ

لەم قەسیدەیەدا شاعیر باس لە «غەدیری خوم» (کانیی خوم) دەکا، ئەمە ناوی جێگەیێکە لە نێوان مەککە و مەدینە. کە پێغەمبەر لەگەڵ کۆمەڵێک لە ئەسحابەکانی لە دوا حەج (حجة الوداع) بەرەو مەدینە دەگەڕانەوە لە ڕۆژی ١٨ی مانگی زیلحەججە لە غەدیری خوم لایاندا بۆ نوێژی نیوەڕۆ، پێغەمبەر دەستی عەلیی کوڕی ئەبووتالیبی گرت و پێی وت «من كنت مولاه فهذا علي مولاه، اللهم وال من والاه وعاد من عاداه وانصر من نصره واخذل من خذله». ئەو ڕۆژە لەلایەن شیعەکانەوە کراوە بە«جەژنی غەدیر» یا «جەژنی غەدیری خوم».

ئەو نیوە دێڕەی لە شیعرەکەدا سڕاوەتەوە لەبەر ئەوە نییە بۆمان نەخوێندرابێتەوە و ساغ نەکرابێتەوە، بەڵکو بەهیچ جۆرێ لەبەر هۆی ئایینی بۆمان نەکرا ئەم چەند وشەیە تۆمار بکەین.

بکووهی مەررە کاید موهممەدین ڕەفتی بشەهری هەج
گوزارش دەست دە ئان هەوری کە ئەو ئاوەرد دەر سەحرا
بگوفتا کور گەلان شەهنی کەمەر مووچی گوتەم سوڵتان
خودا جبریلی فرسیندە بتەییەم ئامەدە زیرا



چنینەش ئەمر کر مە جانشین موو ئەلی بووهە
قبوولەش ئەر کونی رازی وتان بوو مەوریدی فەرما
ئەلی بوو ئان کورتانم ئەلی ماس هردە ئەز کاسم
ئەلی دەردی هەمرەهم بیدە هەمان شەو درمالی بالا
ئەلی شیری خودا بووهە، ئەلی پەهلوونی ما بووهە
ئەلی ساف ئیتراشە تیغی تیزەش وەر کوهی خارا
چنین کاد موهمەمەدین گوفت ڕەفیقان جوملە شەهنیدەند
قبوولی هەرفشە کەردەند تەمام ئەو جەماعەتها

.............................................................

کە ئەرمیریم ئەلی راما قبوولەش نەی کونیم هاشا
ئەلی ئان بابمان کوشتە، ئەلی ئان تاتمان کوشتە
ئەلی بی کەسیان کوومە دری دونیا دەری دینا
چنین بوغزی ئەلی وەر دل هەفی ڕەفتەند بەشەهری هەج
سە خیز شیەم قافران سە زەرقوونە قەهوەخور ئەلقا
چنین قسە بنەزم ئاوەردە (کاید شەهمیری لور)
ز مەردانی خودا بی ئەز سەگانی کور گەلی مەولا
خودایا، یا موهەممەد، یا عەلی، عەلی ئین (شەهمیری لور)
زتون هچی نەمیخوو هە بغەیر ئەز ئەردە و هورما
زتون شیرینی ئیجوورە درئان عیززی ئی میرە
تەمەع دارە ز سەقفەت ئەردەهیدەش تیکەیی مەولا

واتاکەی:

بەکۆمەڵی جارێکیان پێشەوا کە چووە شاری حەج (مەککە، کەعبە)
ئەو جێیەی لە پێشانا ئاوی لێ بووە و وشک بۆتەوە و بووە بەسارا
وتی کوڕ گەلان گوێ بکرن مەگەر سوڵتان چی بە ئێمە وت
خودا جبریلی نارد بێتە لای ئێمە لە خوارەوە (سەر ئەرز)
بەم جۆرە فەرمانی بۆ من دەرکرد عەلی ببێتە جێنشینی ئێمە
ئەگەر قوبوولی بکەن، فەرمانی خودا جێبەجێ دەکەن
عەلی کوڕی تاقانەمە لە کاسەی من ماستی خواردووە

عەلی ئەو شەوە هاوڕێم بوو لە ماڵی سەرەوە (لە ئاسمان، لە بارەگای خودا)
عەلی شێری خودایە، عەلی پاڵەوانی ئێمەیە
عەلی ڕێک تیغی تیژی شاخی خارا شەق دەکا
ئەوەی محەممەدی سەردار وتی هاوڕێیان گوێیان لێ بوو
قسەکانیان سەلماند، هەموو ئەو کۆمەڵە خەڵکە
..................................................
ئەگەر میری ئێمە نەیکەن و پێی ڕازی نەبن حاشایان لێ دەکەین
عەلی ئەوەیە باوکی ئێمەی کوشتووە، عەلی ئەوەیە مامی ئێمەی کوشتووە
عەلی ئەوەیە کە ئێمەی بێ کەس کردووە لە ڕووی دنیا لە هاوڕێی ئایینمان
بەرق و کینێکی واوە بۆ عەلی هەموو ڕوویان کردە شاری حەج
ئەو کافرانە سێ خووی پیسیان هەبوو، پیری ڕزیو، قاوەخۆر، شێت
چیرۆکێکی وا کادی (شەهمیری لوڕ) بەشیعر هۆنیوبەتییەوە
لە مەردانی خودا سەگانی کوڕگەلی مەولا (یارانی عەلی)
خودایە، یا محەممەد، یا عەلی ئەم (شەهمیری لوڕ)ە
لە تۆ هیچ شتێک ئارەزوو ناکا تەنیا دوو دەنکە خورما نەبێ
ئارەزوو دەکا لە ماڵی تۆ پاروویێک بخوا

***

ئەم نموونانە لە شیعری کلاسیکی لوڕی مژدەییێکە مەزەندەمان بەهێزتر دەکا کە لە لوڕستان ئەدەبی نووسراو لە نێوەندی خوێندەوار و ڕۆشنبیری کوردیدا باو بووە، بێگومان نموونەی ئەم جۆرە شیعرەیان زۆر بووە، دواڕۆژ بەرِوونی ئەمەمان بۆ دەردەخا.

# لیستی ناوی کەسان

## لیستی ناوی جوگرافی

# بیبلۆگرافیا

١- ناوی ئەو سـەرچاوە و كـەرەسـتـانەی لەم لیـسـتـەیەدا هاتووە، مـەرج نیـیـە لەم بەرگـەدا هەمـوویان بەكارهاتبن، بەڵام بەشێكی زۆر گرنگن لە لێكۆڵینەوەی زانسـتی رۆشنبـیری كوردی و نووسـینەوەی مێژووی ئەدەب.

٢- ئەو سەرچاوە و كەرەستانەی لە بەرگی یەكەمی ئەم كتێبەدا خراونەتە بەرچاو بەپێویستمان نەزانی دووبارە لەم بـەرگی دووەمـەدا بڵاویـان بكەینەوە، لێرەدا تەنیـا ئەو سـەرچاوە تازانە دەخـەینە ڕوو كـە لەوەپێش پەنجەیان بۆ درێژ نەكراوە. لە بەرگـەكانی داهاتووشدا بێگومـان هەر لەسـەر ئەم بەرنامـەیە دەڕۆین.

**بەزمانی كوردی**


- ئارامی چەچان، گولبوهار، یەریڤان، ١٩٥٧.
- ئەحمەدێ خانی، مەم و زین، شروڤەكرن و ڤەكولینا ئەمینێ ئوسمان، بغداد، ١٩٩٠.
- ئەمینێ عەبدال، كتێبا زمانێ كورمانجی بۆنا كۆما چارا، رەوان (یەریڤان)، ١٩٣٣.
- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، فۆلكلۆری كوردی، بەرگ١، مۆسكۆ، ١٩٧٣.
- ئۆردیخانی جەلیل و جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا كوردی، شێخ سەنعان، مۆسكۆ، ١٩٧٨.
- جاسمێ جەلیل، ڕۆژی من، یەریڤان، ١٩٦٠.
- جەمال نەبەز، بیری نەتەوەیی كوردی، نە بیری «قەومیەت»ی ڕۆژهەڵاتی و نە بیری «ناسیۆنالیزمی» ڕۆژئاوایییە، ستۆكهۆڵم – سوید، ١٩٨٤.
- چیـرۆكی زەمـبـیـل فـرۆش، یادگـاری مـرادخـانی بایەزیدی، بەشـێـوەی كـرمـانجی و سـۆرانی، هەولێـر، ١٩٦٧.
- خـانای قـوبادی، شـیـرین و خـوسـرەو، مـحـەمـەدی مـەلا كـەریم سـاغی كـردوەتەوە و فـەرهەنگی بۆ ڕێكخستووە و پێشەكیی بۆ نووسیوە، بەغدا، ١٩٧٥.
- خالد حسین، دەرگەهەک بۆ فۆلكلۆری كوردی، بەغدا، ١٩٨٥.
- دیوانا پەرتویێ هەكـاری بەرهەڤكرن و تویژاندنا صـادق بهـاءالدین ئامـێـدی، بەغـدا، ١٩٧٨. (پەرتو هەڵەیە «پرتەو» ڕاستە).
- دیوانا فـەقێ تەیران، سەعید دیرەشی و پێزانێ ئالیخان كومكریە و تویژاندیە و پێشگۆتن و ڕاڤـیەیڤ ژێرا نڤیسیە، بەغدا، ١٩٨٩.
- دیوانا مـەلایێ جزیری، بەرهەڤكرن و ڤـەوژارتنا تەحسـین ئیبـراهیم دۆسكی، پێـداچوون و لێ زڤـڕینا، ئیسماعیل تەها شاهین، دهۆک، ٢٠٠٠ (ئەمە یەكێكە لە دیوانە چاپكراوە باشەكانی مەلای جزیرییە كە تا ئێستا بڵاوكراونەتەوە).

– دیوانا مەلایێ جزیری، تویژاندنا صادق بها ءالدین ئامێدی، بغداد، ١٩٧٧.
– دیوانی بێسارانی، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی کیومرت نیک ڕفتار، بەغدا، ١٩٨٢.
– دیوانی ڕەنجووری، لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی، بەغدا، ١٩٨٣.
– دیوانی عارفی رەبانی شیخ ئەحمەدی جزیری مەشهور بەمەلای جزیری، هەژار شەرحی لێ کردووە، تهران، ١٣٦١.
– دیوان ملا پریشان کرد، گرد آورنده و ناشر فتحعلی حیدری زیباجوئی، چاپ محمدی، کرمانشاه، ١٩١٦/١٣٣٥.
– دیوانی وەلی دێوانە، لەسەر ئەرک و چاودێری و کۆکردنەوەی مەحموود خاکی، سلێمانی، ١٩٧٠.
– دیوانی وەلی دێوانە، گۆڕینی بۆ شێوەی سلێمانی، ڕازی، سلێمانی، ١٩٧٧.
– ڕەئووف ئەحمەد ئالانی، گوڵ گەشتێک بەمێرغوزاری خانای قوبادیدا، سلێمانی ١٩٧٩.
– زەمبیل فرۆش، بلاوکردنەوەی گیوی موکریانی، هەولێر، ١٩٦٧.
– ژ هەلبەستێن ئەحمەدی خانی، کۆمکرن و تویژاندن، ئیسماعیل بادی، دهۆک، ١٩٩٦.
– شاکر فەتاح، مەم و زین لە تەرازوودا، سلێمانی، ١٩٦٩.
– شێخ سەنعان، چاپخانەی تەرەقی، کەرکووک، ١٩٧٣. (بەدیالێکتی کرمانجی خواروو).
– صادق بها ءالدین ئامێدی، هۆزانڤانێت کورد، بەغدا، ١٩٨٠.
– صدیق بۆرەکەیی (صفی زادە)، پێشبینییەکانی عێل بەگی جاف، تهران، ١٣٦٥.
– عبدالرقیب یوسف، دیوانا کرمانجی، نەجەف، ١٩٧١.
– عەتاری شەرۆ، دوو دنیا، یەریڤان، ١٩٥٣.
– عەلی فەتاح دزەیی، نەوبەهاری ئەحمەدی خانی و ئەحمەدی شێخ مارفی نۆدێ، هەولێر، ١٩٨٥.
– العقد الجوهري في شرح ديوان الشيخ الجزري، صاحب الشرح احمد ابن الملا محمد الزفنكي مفتي القامشلي، جزء ١-٢، الطبعة الاولي، مطبعة الرافدين، قامشلي، ١٩٥٩؛ الطبعة الثانية، مطبعة الصباح، قامشلي، ٢٠٠٠.
– عەگیدێ ئەحمەد، د زیرکا فەقێ تەیران، یەریڤان، ١٩٧٠.
– عوسمان هەورامی، ژیان و هۆنراوەی وەلی دێوانە، بەغدا، ١٩٦٧.
– فەقێ تەیران، بەرصیصی عابید، بلاڤ کرنا: عبدالرقیب یووسف، هەولێر، ٢٠٠١.
– Qanatê Kurdo, Tarîxa Edebyeta Kurdî, Berg I, Stokholm, 1983; Berg II, Stokholm, 1985.
– کامیران بەدرخان، فێربوونا خوەندنا کوردی، پاریس، ١٩٦٨.
– مارف خەزنەدار، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، بەغدا، ١٩٨٤.
– محمد أمین هەورامانی، ڕۆشنبیری وەلی دێوانە، بەغدا، ١٩٧٩.





– محمد ئەمین هەورامانی، مێژووی هەورامان – لهون، بەرگی (١)، تهران، ١٣٨٠.
– محەمەد ئەمین عوسمان، دیوانا مەلان، بەغداد، ١٩٨٦.
– محەمەد، عەلی قەرەداغی، کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٠؛ بەرگی دووەم، بەغدا، ١٩٨٢؛ بەرگی سێیەم، بەغدا، ١٩٨٦.
– مەلایێ باتەیی و بەرهەمێ وی، کۆمکرن و ڤەکۆلین تەحسین ئیبراهیم دۆسکی و موحسین ئیبراهیم دۆسکی، دهۆک، ١٩٩٦.
– مسعود کتانی، ئادە لناڤ بەغچێ ئەحمەدێ خانی هندەک هوزان و هەلقوتان و ڤەرویفاندن و ڕەخنە، ١٩٩٨.
– مووڤیسیان س. زماننامە کورمانجی، یەریڤان، ١٩٣٥.
– مەولوودنامەی باتەیی یادگاری زانای مەزن و بوێژی هێژا مەلا حسنی اَرطوشی، چاپی دووەمین، هەولێر، ١٩٦٦.
– مەولوویدا مەلایێ باتەیی، خرڤەکردن و تویژاندنا صادق بها ءالدین ئامێدی، بغداد، ١٩٨٢.
– مەم و زین، بلاوکراوەی گیوی موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٥٤؛ چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٦٨.
– مم و زين، الشيخ أحمد خاني، لي حيسابى بشير الشيخ حسن الهاشمي، آراس مطبعةسى، حلب، ١٩٤٧.
– مم و زين، أثر سر تاج أديب كردان ومدار افتخارا حميان أحمد خاني، استانبول، نجم استقبال مطبعەسى، ١٣٣٥ – ١٣٣٧.
– Mem u Zîn Ehmedê Xanî, Türkcesi: M.E. Bozarslan, Gün Yayinlari, Istanbul, 1968' Istanbul, 1975.
– نادرنامەی ئەڵماس خانی کەڵهوڕ، بەرێنووسی کوردی باوی ئەمڕۆ نووسینەوە و فەرهەنگۆک بۆ دانانی، شوکور مستەفا، هەولێر، ٢٠٠٠.
– نووبهارا سەیدایێ مەزن ئەحمەدێ خانی، خرڤەکرن و ل دوی چۆن و تویژاندنا صادق بها ءالدین ئامێدی، بغداد، ١٩٧٩.
– هەر کۆل ئازیزان، «کلاسیکێن مە»، کۆواری «هاوار»، ژ ٣٣، ساڵ ٩، شام، ١٩٤١.

**بەزمانی عەرەبی**

– أحمد ناجي القيسي، عطارنامة أوكتاب فريدالدين العطار النيشابوري وكتابه «منطق الطير»، بغداد، ١٩٦٨.
– أنور مائي، الاكراد في بهدينان، الموصل، ١٩٦٠.

– تحفة الشاعر الكبير أحمد الخاني، ترجمة، محمد سعيد رمضان البوطي، دمشق، ١٩٥٧.
– رشيد فندي، مناقشات حول خاني – دراسة نقدية، بغداد، ١٩٨٦.
– محمد توفيق ووردي، قصص شعرية كردية، بغداد، ١٩٦٥.
– ياقوت الحموي، معجم البلدان، بيروت، ١٩٦٨ (٥ مجلدات).

**بەزمانی فارسی**

– بابا مردوخ روحانی (شێوا)، تاريخ مشاهير كرد، جلد أول، تهران، ١٩٨٥.
– حديقهء سلطانی، تحقيق وتاليف وتصحيح محمد علی سلطانی، با مقدمهء تحرير و نظارت استاد سيد محمد طاهر هاشمی، جلد أول، ١٣٦٤ش.
– سرتيپ علی رزم آرا، جغرافيای نظامی ايران – لرستان، طهران ١٣٢٠.
– صديق صفی زاده (بورەکەيی) پيشگوئيهای ايل بەگی جاف، تهران، ١٣٦٩.
– قادر فتاحی قازی، منظومهء كرد شيخ سنعان، تبريز، ١٣٤٦.

**بە زمانی رووسی**

– احمد خانی، مم و زين، تيكستا كريتيک، ترجما و پيشخبر، م. ب. رودنكو، مسكوا، ١٩٦٢.
– ئۆرديخانی جەليل، چيرۆكی شيعری قارەمانی كوردی خانی لەب زێڕين، مۆسكۆ، ١٩٦٧.
– ڕوودينكۆ م. ب. تێكستی ئەدەبی و فۆلكلۆری داستانی كوردی يووسف و زولەيخا، مۆسكۆ، ١٩٨٦.
– حاريس بدليسی، لەيلێ و مەجنوون، وەرگێڕان و تێبينی و نووسينی پێشەكی م. ب. ڕوودينكۆ، مۆسكۆ، ١٩٦٥.
– داهێنانی ئەدەبی نەتەوەكانی يەكێتيی سۆڤيەت «ئەلمەناخ»، بەرگ١، مۆسكۆ، ١٩٣٧؛ عەرەبی شەمۆ تێكستێكی «زەمبيل فرۆش»ی دابووە شاعيری ناوداری ڕووس ی. دونايێڤسكی و پۆيێمێكی لێ دروست كرد و لەو ئەلمەناخەدا بلاوكرايەوە بەناوی نموونەی ئەدەبی كوردييەوە.
– ڕوودينكۆ م.ب. كۆكراوەكانی ڕۆژهەلات، ژ٣، مۆسكۆ، ١٩٧٢.
– ڕوودينكۆ م. ب. هەندێ تێكستی نەزانراوی شيعری ئەحمەدی خانی، كۆواری نەتەوەكانی ئاسيا و ئەفەريقا، مۆسكۆ، ژ٣، ١٩٦١.
– زەمبيل فرۆش، داستانی كوردی و تێكستە فۆلكلۆرييەكانی، بلاوكردنەوە و وەرگێڕانی بۆ ڕووسی و تێبينی و پێشەكی، ژ. س. موسەيليان مۆسكۆ، ١٩٨٣.
– فەقێ تەيران، شێخ سەنعان، بلاوكردنەوە و وەرگێڕانی بۆ ڕووسی و تێبينی و پێشەكی م. ب. ڕوودينكۆ، مۆسكۆ، ١٩٦٥.



– گۆرانيی ميللی كوردی لە كۆكراوەكانی نامەخانەی گشتی لە لينينگراد (سانت پيترسبورگ)، بلاوكردنەوە و وەرگێڕانی بۆ ڕووسی و تێبينی و پێشەكی ژ. س. موسەيليان، مۆسكۆ، ١٩٨٥.
– مارف خەزنەدار، بەكورتی مێژووی ئەدەبی نوێی كوردی، بلاوكراوەی ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسيی ئەكاديمييەی زانستی، مۆسكۆ، ١٩٦٨.
– يووسف ئۆربێلی، يادگاری ڕۆژگاری شاعيری گورج، ڕووستاڤێلی، لينينگراد (سانت پيترسبورگ)، ١٩٣٨.

# ناوەڕۆک

# تاريخ الأدب الكردي

## القرن الرابع عشر - الثامن عشر

يتناول هذا الجزء من الكتاب الاوضاع السياسية في كردستان والمناطق الجغرافية التي يسكنها الكرد الگورانيون في القرن الرابع عشر - الثامن عشر، ويتطرق الى نهضة الأدب الكردي في كردستان الشمالية، ثم يسرد ماكانت عليه القصة الشعرية في القرن الثامن عشر، وكذلك يقدم معلومات عن اللر الذين يُعتبرون احدى الأرومات التي يتكون منها الشعب الكردي، وهناك معلومات مستفيضة عن حياة ونتاج طائفة من الشعراء الكبار أمثال الملا پريشان وبيساراني وخاناي قوبادي ورنجوري وفقي طيران والملا الجزري وأحمد خاني وپرتەو بك وغيرهم...

## الجزء الثاني


الدكتور معروف خزنەدار



اربيل ٢٠٠٢




# The History of Kurdish Literature

## 14 - 18 th. Century

*Second Volume*


By

Prof. Dr. Marouf Khaznadar



Arbil 2002